أبو عبد الرحمن الكردي
حیلمی عەلی شەریف
دوو
لێکۆڵینەوەی سیاسی
* نەتەوە چییە و چۆن نەتەوەی کورد پێک هاتووە؟
* جیۆپۆلیتیکس و دەوڵەت و سیاسەتی دەرەوەو چارەنووسی جیهان

حیلمی عەلی شەریف

# دوو لێکۆڵینەوەی سیاسی

- نەتەوە چییە و چۆن نەتەوەی کورد پێک هاتووە؟
- جیۆپۆلیتکس و دەوڵەت و سیاسەتی دەرەوە و چارەنووسی جیهان

سلێمانی 2001

- ناوی کتێب: دوو لێکۆڵینەوەی سیاسی
- بابەت: لێکۆڵینەوەی سیاسی
- ناوی نووسەر: حیلمی عەلی شەریف
- هەڵەچن : مهاباد رحیم فەرەج
- مۆنتاژ: تاڤگە فائق
- تیراژ: 650 دانە
- ژمارەی سپاردن : ( 270 ) ی 2001
- کۆمپیوتەرو چاپ و ئۆفسێتی دەزگای سەردەم


زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ( 133 )

# چەند وشەیەك لە یادی كاك حیلمی دا

لە پەنجاكاندا هێشتا من منداڵ بوم كە حەفتانە رۆژنامەی ژین ئەهاتە ناو ماڵەكەمان، ئەوسا تەلەفزیۆن و ڤیدیۆ و ئەو جۆرە دەزگایانە لە سلێمانیدا پەیدا نەبوبون، لەبەرئەوە رۆژنامە تامێكی تایبەتی هەبو. هەمو حەفتەیەك بەپەرۆشەوە چاوەروانی (ژین)مان ئەكرد، بە تایبەتی كە هەمو حەفتەیەك چەند گۆشەیەكی تێدا ئەنوسرا وەكو: (چیرۆك بۆ منالان) و (مەتەڵ: بۆ راخاوی مێشك) و (بازاڕ و بازرگانی لە حەفتەیەك دا) و (لە دەفتەری پۆلیس) دا. هەر لە رێگەی ئەم رۆژنامەیەوە ئاشنای ناوی زۆر لە نوسەرانی كورد و ئاشنای بڵاوكراوە كوردییەكانی ئەو سەردەمە بوم.

دوای شۆرشی ١٤ ی تەموزی ١٩٥٨ رێكخراوە سیاسی و پیشەیی و رۆشنبیریەكانی كوردستان بە ئازادی كەوتنە چالاكی. پارتە سیاسییەكان هێشتا ئۆرگانی تایبەتی خۆیان نەبو. لاپەرەی رۆژنامە و گۆڤارە كوردییەكان بوبونە مەیدانی دەربرینی بیروڕای سیاسی و ململانێی فیكری، دو حیزبە سیاسیە سەرەكییەكەی ئەو سەردەمەی كوردستان: حیزبی شیوعی عێراق و پارتی دیموكراتی كوردستان، هەر لایەك هەوڵی ئەدا بیروبۆچونەكانی و هەڵوێستی لە روداوەكان رون بكاتەوە، لەو رێگەیەوە كار لە جەماوەر بكا و، بەلای خۆی دا رایبكێشێ. لەناو ئەو نوسەرانەدا كاك حیلمی عەلی شەریف یەكێ بو لە نوسەرە چالاكەكان، زۆر حەفتە وتارێكی سیاسی بۆ رۆژنامەی (ژین) ئەنوسی. كاك حیلمی ئەوسا یەكێ بو لە سەركردە ناسراوەكانی پارتی و، لە روانگەی حیزبەكەی خۆیەوە لە روداوەكان ئەدوا. من بێ ئەوەی لە نزیكەوە كاك حیلمی بناسم لە رێی (ژین)ەوە

ئاشنای ئاوەکەی و بیروباوەڕی بوم. لەو ماوەیەدا بە هۆی ململانێی ناوخۆی پارتیەوە ماوەیەك لە كار دورخراوەتەوە بەڵام دوای دورخستنەوەی باڵی خوالێخۆشبو هەمزە عەبدوڵڵا لەسەرکردایەتی پارتی کاك حیلمی بە گەرمی دێتەوە مەیدانی خەباتی سیاسی و رۆژنامەوانی، کە رۆژنامەی (خەبات – النضال) بە یەکجاری بو بە عەرەبی، جگە لەوەی یەکێ بو لە بەڕێوەبەرەکانی رۆژنامەکە، گۆشەیەکیشی بە ناوی (ئاسۆ)وە رۆژانە لە ژێر سەر ناوی (التعلیق السیاسی) دا ئەنوسی. لەم گۆشەیەدا بەزۆری باسی لە خەباتی رزگاریخوازانەی گەلان و رِوداوە گرنگەکانی جیهان ئەکرد و، هەوڵی ئەدا لەگەڵ خەباتی رزگاریخوازانەی کوردا بەراوردی بکات و پێکیانەوە ببەستێتەوە.

کە شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١ دەستی پێ کرد، ئەویش چوە شاخ و بەشدارییەکی کاریگەری کرد لە هەڵساندنەوەی جوڵانەوەکەداو، لە رێکخستنەوەی رێکخراوەکانی پارتی و پێشمەرگەدا.

لە کاتی تەقینەوەی ناکۆکیەکانی ناو پارتیدا ساڵی ١٩٦٤ بۆ هەندێ کاروباری رێکخراوەیی چوم بۆ سەردانی مەکتەبی سیاسی پارتی کە ئەوسا بارەگاکەیان لە گوندی (ئارکورتێ)ی نزیك (ماوەت) بو، بۆ یەکەم جار لەو سەردانەدا (کاك حیلمی)م لە نزیکەوە ناسی. لەو کاتەدا بەرپرسی رێکخستنی لقی پێشمەرگە و بەرپرسی دەرکردنی گۆڤاری (دەنگی پێشمەرگە) بو. رِوداوەکان بە خێرایی و بەجۆرێکی نالەبار تێپەڕین، ئەو ناچار بو چوە ئێران و منیش بۆ خوێندن گەڕامەوە بۆ زانکۆی بەغداد. ئیتر (کاك حیلمی)م نەبینیەوە تا لە ١٩٦٦ دا هاتە بەغداد. لەو کاتەوە ئیتر دۆستایەتی و برایەتی و تێکەڵاویمان زیادی کردو، لە کاری سیاسی و لە کاری رۆژنامەوانیدا تا کۆچی دوایی کرد بوم بە هاوڕێیەکی نزیکی.

لێرەدا من نامەوێ لەمە زیاتر باسی ژیانی کاك حیلمی بکەم چونکە چاکتر وایە لە زمانی خۆیەوە بیبیستن، وا دیارە کاتی خۆی گفتوگۆیەکی لەگەڵ ساز کراوە، ئەگەر چی پرسیارەکان نەنوسراون بەڵام وەڵامەکانی بە تەواوی بە خەتی خۆی نوسراوە، خوێنەر بە سەلیقە ئەزانێ پرسیارەکان چی بون. بەڵکو لێرەدا ئەمەوێ ئەوە بڵێم کە کاك حیلمی رۆشنبیرێکی گەورەی خاوەن بیرو باوەڕ و هەڵوێست بو، بە کوردی و بە عەرەبی نوسەرێکی بە توانا و قەڵەم رِەنگین بو، لە ژیانی خۆی دا

ئەیتوانی پلەو پایەی زۆر بەرز لە داوودەزگاکانی حکومەت دا وەربگریّ، بەلاّم خۆی پیاوێکی ئەوەندە نەفس بەرز بو، بێزی نەهات بچێتە ژێر باری پلەو پایەی حکومەتی‌یەوە، بەڵکو بە ڕەنجی شانی خۆی و بەسەربەرزی ژیا. بەر لە مردنی بڕیاری دابو بەیەکجاری بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و خۆی تەرخان بکا بۆ کاری ڕۆژنامەوانی، مخابن مەرگ مۆڵەتی نەدا، لەو سەفەرەدا کە لە سلێمانیەوە چوەوە بۆ بەغداد توشی نەخۆشیەکی کتوپڕ بو، کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەیان هێنایەوە بۆ سلێمانی.

ئەم کتێبە بریتی‌یە لە دو بەش: بەشێکیان، کتێبێکە لە بابەت پەیدا بونی نەتەوەی کوردەوە کە بۆ یەکەم جار بڵاو ئەکرێتەوەو، لای بنەماڵە بەڕێزەکەیان هەڵگیرا بو. بەشەکەی کەی زنجیرەیەك وتارە لە بابەت جیۆپۆلیتیکسەوە کاتی خۆی لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێدا بڵاوی کردونەتەوە. هەردو بەش دو لێکۆڵینەوەی زانستی بە نرخن، کتێبخانەی کوردی و بیری کوردایەتی‌یان پێ دەوڵەمەن ئەبێ.

گیانی کاك حیلمی شاد و یادی هەمیشە زیندو بێ.

نەوشیروان مستەفا ئەمین
سلێمانی ٢٦ ی ئەیلولی ٢٠٠١

# کورتەی ژیانی حیلمی عەلی شەریف
# بە قەڵەمی خۆی

ناوم (حیلمی علی شەریف)ە لە ساڵی ١٩٣١ لە شاری سلەیمانی لە گەڕەکی دەرگەزێن هاتومەتە دنیاوە. لە باوك و دایکەوە لە بنەماڵەیەکی بازرگان کارم واتا کە پێیان ئەوترێت بۆرجوازی بچوك.

بۆیە شان بەشانی سیاسەتکاری و نووسین، ناو بە ناو بە کاری بازرگانێتی و پیشەسازی بۆ بەڕێوە بردنی باری ژیان و گوزەرانی خۆم هەڵساوم. هەندێجار هەر یەکەیان بە تەنیا و هەندێجاری تر هەردووکیان لە کاتێکدا. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیم لە سلێمانی تەواو کردووە. تەنیا ساڵی پێنجەمی ئامادەییم بە هۆی دوور خستنەوەم واتا بەزۆر گواستنەوەم لە ئامادەیی سلەیمانییەوە بۆ ئامادەیی شاری بەعقوبە بەهۆی مانگرتن وخۆنیشان دانەوە لە ئامادەیی سلەیمانی، لە بەعقوبە تەواوکردووە.

دوای ئەوە بەڵگەنامەی تەواوکردنی ئامادەیی و هەندێ بەڵگەنامەی تری بەپێی ئەوسا پێویست دا بە کۆلێژی ئەندازیاری، بەڵام هەر لە نیوەی مانگی یەکەمی خوێندنی ساڵی یەکەمدا چەند کەسێکی ئەندامی روخاوی پارتی کۆمۆنیستی عێراقی لەتەك هەڤاڵەکانی خۆیاندا ناوی من و چەند ئەندامێکی تری پارتی دیموکراتی کوردستانیان لە سلەیمانی هانی کە دژی میری ئەوسا چالاکی سیاسی و پارتایەتی ئەنوێنین. لە تحقیقاتی جنائی لە بەغدا گرتمیان کە ئێستا پێی ئەڵێن ئەمنی عامە.

لەکاتی گرتنماندا بەهۆی شەڕی ١٩٤٨ی نێوان عەرەب و جولەکەوە درایـن بە دادگای عورفی و لە گرتووخانەی ابوغریب ـ ی سەر بە مەجلیسی عورفی لە ژوری

تەنیاییدا بەندکراین و لە دواییدا بەپێی مادەی ١٨٩ کە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی روخێنەر ئەگەیەنێت دادگا حوکمی بەندکردنی داین.

بۆیە ئیتر کۆلێژی ئەندازیاریم لە دەست چوو، داخێکی ناخۆشیش چوو بە دڵما. ئیتر ناچار لە هەلێکی تردا لە سەرەتای هەفتاکاندا چوومە بەشی قانون و سیاسە لە زانکۆی مستنصریە وە بە ئەنجامی باش لە ساڵی ١٩٧٥-١٩٧٦ تەواوم کرد.

لە ژیانما بەهۆی پارتایەتی‌یەوە سەرو سەختێکی باشم لەتەك گرتووخانەو بەندیخانەکانی عێراق دا هەبوو، گرتووخانەکانی تحقیقاتی جنائی لە بەغدا، سلەیمانی، کەرکوك و گرتووخانەی کەرخ و مەوقف سەراو بەندیخانەی مەرکەزی لە بەغداو بەعقوبە، گرتووخانە و بەندیخانەکەی کوت و بەدرە میوانداریان کردووم.

- سەرەتای نووسین - راستی‌یەکەی هەر زۆر زوو ئاواتەخوازی ئەوەبووم کە بزانم بنووسم. بۆیە رۆژێکیان لە پۆلی دووەمی ناوەندی سلەیمانی بووم بێ ئەوەی هیچ کەرەسەیەکی نووسین و تەکنیکی چیرۆك نووسینم بە دەستەوە بێت، چیرۆکێکم نووسی، ئەوەی لەبیرم مابێت دەربارەی لاوێکی وێڵ بوو لە دارستانێکی کوردستانا، هەروەها لە کتێبێکی قوتابخانەی ناوەندیدا باسێکم دەربارەی ئەدیۆن کرد بە کوردی، بیرم نەماوە کامیان پێش کامیان کەوتوون، یەك بەدوای یەکدا ناردمن بۆ گۆڤاری دەنگی گێتی تازە کە بە ئەرکی باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە بەغدا دەرئەچوو، خوالێخۆش بوو حسێن حوزنی موکریانی سەر نووسەر و بەڕێوەبەری بوو جگە لەوەی کە ئەو کاتە بەریتانیا لەبەرەی هاوپەیمانان لە جەنگدا بوو دژی نازی و فاشستەکانی ئەڵەمان و ئیتاڵیاو ژاپۆن بەڵام من ئاستی بیرکردنەوەی سیاسیم لەو ئەندازەیەدا نەبوو کە بیر لە کێشی سیاسی ئەم گۆڤارە بکەمەوە.

خوالێخۆش بوو حسێن حوزنی هەردوو نووسینەکەی بێ ئەوەی دەستکاری ناوەڕۆکەکانیان بکات، هەروەکو خۆی نووسیبێتی تەواو تەواو بۆی چاك کردبووم و بۆی بڵاوکردمەوە.

ئەم کارەی ئەم نووسەرە کوردە، خوالێخۆش بوو حسێن حوزنی بە تەواوەتی هانی دام کە ئیتر بڕوا بە خۆم پەیدا بکەم و بەدوای نووسیندا وێڵ بم. بۆیە ئێستاش هەر خۆم بە قەرزاری ئەو پیاوە رۆشنبیرە ئەزانم. ئیتر دوای ئەوە لە رۆژنامەی ژین لە

سلەیمانی و خەبات و نور لە بەغداو هاوکاری و بەیان و رۆشنبیری نوێ دیسانەوە لە بەغدا نووسینم زۆرن.

– دەربارەی رۆژنامەی هاوکاری کە ئەوسا لە لایەن (دار الجماهیر للصحافە)وە دەرئەچوو بووم بە سەرپەرشتکاری گشتی (المشرف العام)ی ئەم رۆژنامەیە ئەویش لە کاتێکدا بوو کە بەرەیەکی یەکگرتوو بە سەرۆکایەتی پارتی بەعسی سۆشیالیستی لە نێوان ئەم پارتییەو پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی و پارتی کۆمۆنیستی عێراقیدا هەبوو، هەریەکە بەویتریان ئەوت پارتی هاوپەیمان.

لەو کاتەدا رۆژنامەی هاوکاری بەرەڵلا و سەرگەردان بوو هەرکەسە و هەر لایە بەلای خۆیدا رایئەکێشا. جارێك کورتە وتارێکم بۆ نووسین کە بلاوکرایەوە سەیرم کرد دێڕێکیان بەئەنقەست کە جوغزی باسەکە بوو لێ هەلگرتبوو. ئەو هەلگرتنە باسەکەی پوچەڵ کردبووەوە.

ئەم کارە بەئەنقەستە زۆر قینی هەلسانم، خێرا خێراش لێپرسراوانی بەرزی راگەیاندنی پارتی بەعسی سۆشیالیستی داوایان لێئەکردم ئەم رۆژنامەیە بگرمە دەست.

لە ئەنجامدا لەتەك لێپرسراوی یەکەمی دەزگای راگەیاندنی ئەوسای ئەم پارتی دا رێککەوتم کە دەسەلاتی تەواوی بەرێوەبردنی ئەم رۆژنامەیەم بدەنێ.

لە توێی رێککەوتنەکەدا ئەوە هەبوو کە رۆژنامەی هاوکاری برایەتی کورد و عەرەب و هەموو دانیشتوانی عێراق بەهێز بکات پشتگیری بزوتنەوەی ئازادیخوازانەی گەلانی دنیا بە کوردی بەشەکانی تری کوردستانەوە بکات و دژی ئیمپریالیزم و کۆنە پەرستان بێت و هانی هەموو کارو کردەوەیەکی باش بدات و هەندێ بابەتی تر. بەم جۆرە رۆژنامەی هاوکاری سەرکەوتووانە برا بەرێوە، بۆیە هەر ژمارەیەك لەوی پێشوو پتر خواستاری بۆ ئەبوو لە پێنج سەد نوسخە فرۆشتنەوە گەیشتە چەند هەزار نوسخەیەك. تەنگی بە رۆژنامە کوردییە سەر بە پارتییەکان هەلچنی. دەرگای بۆ هەموو نووسەرێکی خاوەن قەلەمی پاك و رەوان خستە سەر پشت. ئیتر لە سالی ١٩٧٤ دا بەهۆی نەخۆشی و هۆی ترەوە چووم بۆ ئەورووپا و مالئاواییم لە رۆژنامەی هاوکاری کرد.

ئەوانەی کاریان لەتەکدا ئەکردم و جێگا دەستی نووسینیان دیار بوو بەڕێزان نەوشیروان مستەفا، شاسوار جەلال، محمدی حاجی طاهر، حەمید سەعید، عبداللە عباس، فاضل مەلا مەحمود، برهان قانع. جگە لەو بەڕێزانە لەبەغداو شارەکانی کوردستانەوە نووسین و شیعر و پەخشان و بابەتی تریان بۆ ئەناردین.

– لە ساڵی ۱۹۵۹ دا حکومەتی شۆڕشی چواردەی تەموز بە سەرۆکایەتی عبدالکریم قاسم لەتەك ڕێگای ئیش کردن بە ئاشکرا بە پارتی دیموکراتی کوردستان، ڕێگای ئەوەشی بەم پارتی‌یە دا کە ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە بۆ خۆی دەربکات. من ئەو کاتە یەکێك بووم لە ۱۹ کەس کە دەستەی دامەزرێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان بوون. ڕۆژنامەی ئەم پارتی‌یە بەو شێوەیە دەرئەچوو کە ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان بێت، پارێزەر ابراهیم ئەحمەد کە ئەویش ئەندامی دامەزرێنەری پارتی بوو، بوو بە سەرنووسەری منیش یەکێك بووم لە سێ کەس لە دەستەی بەڕێوەبەری. ئەم ڕۆژنامەیە لای کۆمەلانی خەڵکی عێراق و پارتی‌یەکانی عێراق دا بایەخێکی باشی هەبوو، هەروەها لە نێو ئەو وڵاتانەی بایەخیان بە عێراق ئەدا جێگایەکی تایبەتی داگیر کردبوو.

– بێگومان ڕۆژنامە لە یەك قاڵب و چوار چێوەدا نە لە ڕووی شێوەو نە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، لە ئاستی یەکتریدا ئەبێت. چونکە بەپێی هەر وڵاتێك لە ڕووی شارستانێتی و ئازادی بیروڕا دەربڕین–ەوە دەق ئەگرێت هەر ڕۆژنامەیەك بەپێی ئایدیۆلۆژییەتی خاوەنەکەی و سەرچاوەی چینایەتی بەڕێوەبەرەکانی و کاروکردەوەیان نووسینەکانی ڕەنگ ئەدەنەوە ڕۆژنامەی سەرمایەداران لە وڵاتێکی شارستانێتی ئازادی بیروباوەڕ دەستکەوتوودا جۆرێکە و هەر لەتەك ڕۆژنامەی سەرمایەدارو بۆرژوازی لە وڵاتێکی نیوە شارستانی و دیکتاتۆریدا جیاوازی‌یەکی گەورەی ئەبێت.

ئەمە جگە لەو جیاوازییە ئایدیۆلۆژییانەی لەتەك ڕۆژنامە جۆربەجۆرەکانی خاوەن بیروباوەڕی سۆشیالیستی عیلمی و سۆشیال دیموکرات و خۆ هەڵپەساردوو بە سۆشیالیستیدا.

خۆ ڕۆژنامە لە وڵاتی خاوەن ڕژێمی دیکتاتۆری و کۆنەپەرستیدا لە پەککەوتەیی و دواکەوتوویدا هەر ئەبێ باس لێکردنی دیزە بەدەرخۆنە بکرێت.

بەڵام دەربارەی ڕۆژنامەنووس هەر چەندە ئەمانیش بەپێی بیرو باوەڕو سەرچاوەی ئەم ڕۆژنامە نووسانەوە، بەپێ قەڵەم خاوێنی یاخود قەڵەم فرۆشی جیا ئەکرێنەوە. بەڵام لایەنە خاوەن بیرو باوەڕەکانیان چ سەر بە سەرمایەدارێتی یاخود سۆشیالیستی یا نیشتمان و نەتەوە پەروەری بن لە چەند خاڵێکدا یەکتری ئەگرنەوە، یاخود لە یەکتری ئەچن، یا هەر هیچ نەبێ ئەبێ ڕێبازێکی یەکگرتوویان هەبێت دەربارەی خۆبەستن بە کاری ڕۆژنامەنووسییەوە.

دوای خەبات لە ساڵی ١٩٦٨ دا کە پارتی بەعسی سۆشیالیستی جڵەوی دەسەڵاتی لە عێراق دا گرتە دەست. پارتی دیموکراتی کوردستان - بەشی مەکتەبی سیاسی مافی دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی سیاسی پێدرا بە ناوی نورەوە واتا روناکی. ئەمجارە کۆمیتەی ناوەندی پارتی منیان بەسەرنووسەری ئەم ڕۆژنامەیە هەڵبژارد.

ئەم ڕۆژنامەیە زۆر بە ڕێکوپێکی و لە قەوارەیەکی باش و جوان دا دەرئەچوو لای کۆمەڵانی خەڵکی عێراق بە کورد و عەرەب و کەمایەتییەکانییەوە بایەخێکی باشی هەبوو لە هەموو ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە پتر بڵاو ئەبووەوە.

ڕۆژنامەنووس زۆر جیاوازی لەتەك ئەدیب وبوێژو نووسەردا هەیە ئەبێ زۆر دەست سوك بێت واتا گورجوگۆڵ و حازر بەدەست بێت لە نووسیندا. هەروەها ئەبێ دڵخوازی کاری ڕۆژنامەگەری بێت چونکە کارێکی پڕ لە ماندوێتی و خەتەرناك و پڕ ئەندێشەیە. شەونوخونی و هاتوچۆو کێشەو بەرەی لە هەر کارێکی تری نووسین زیاترە. هەروەها دەرامەتی ڕۆژنامەگەری بەگشتی لەهەر کارێکی تری نووسین کەمترە.

ئەگەر ئارەزووی دڵ و دەروون و خولیای ئەم کارە لە دڵی ڕۆژنامە نووسدا نەبێت زۆر زوو لێی وەڕس ئەبێ و خۆی لێ ڕزگار ئەکات.

لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکانی جیهان پڕن لە فیداکاری و لەخۆبوردن و دەست و قاچ شکان و بەزیندان گەیشتن و کوژرانی ڕۆژنامە نووسی ئەم وڵات و ئەو وڵات لە جیهاندا. کە ئەم دیمەنە سامناکە لە نێو نووسەرانی ئاسایی و بوێژو ئەدیب و بەشەکانی تری ڕۆشنبیران بەدی ناکرێت.

– وەکو ئەدیب یا شاعیر یا چیرۆك نووس سەروسەختم لەتەك هیچ لایەکیاندا نییە بەڵام شیعر و چیرۆك و پەخشانی بڵاوکراوەم هەیە. بۆیە هەر خۆم بە نووسەر ئەزانم.

– دەربارەی ڕۆژنامەنووسی ئەم سەردەمە، لەهەندێ ڕوویەوە لە وەڵامی پرسیارەکانی پێشوودا بەدی ئەکرێن. وە لایەنەکانی تری لە هەموو شتێك پتر بەندن بەم گەمارۆ ئابوورییەی کە هەموو لایەنێکی ژیان و گوزەرانی خەڵکی عێراقی گرتۆتەوە.

ڕۆژنامە نووس و نووسەر و ئەدیب و شاعیر، سەرجەم ڕۆشنبیران پەرش و بڵاوبوونەتەوە، هەندێك بەدووی پارووە نانێکدا ئەگەڕێن و هەندێکی تر وڵاتیان بەجێ هێشتووەو ڕوویان کردۆتە هەندەران وێڵن بەدوای ژیان و گوزەراندا. ئەگەر ئەم حاڵە نالەبارە نەبوایە کورد ئەڵێت بەرد لەجێی خۆی سەنگینە چونکە ئابوری ژێرخانی هەموو شتێك لە هەموو وڵاتێکدا ئەم گەمارۆدانە ئابورییە هەموو بارەکانی تری ژیانی لاسەنگ کردووە کە بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن و ژیانی ڕۆشنبیری بەشێکی گرنگی سەرجەم ژیانی وڵاتن. داخی گران بەشە هەرە قورسەکەی ئەم حاڵەتەش شانی ژیانی ڕۆشنبیری کوردی گرتۆتەوە.

دەربارەی ئەم دەزگا کوردییە ڕەنگە لای گوێگرانی ئیزگەی کوردی عێراق سەیر بێت کە بڵێم لەوە ئەچێت لە غەیبەوە دەست لە بەڕێوەبەرانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی وەشێنرابێت تاهاتنی کاك خالید بەڕێوەبەری گشتی ئێستای ئەم دەزگایە، ئەوانی پێشوو هیچیان لە دەستی ئەمانەتی پارێزراو نەبوون، بۆیە تا ئێستا بناغەو پەیکەرێکی شایستەو ڕێکوپێك و بایەخدار کە لەتەك تەمەنی خۆیدا بگونجێت دانەمەزراوە. ئاواتەخوازم بکەوێتە سەر ئەو بارەی کە لە پێناویدا دامەزراوەو لە کاروانی بەرەو پێشبردنی ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی دا هەنگاوی گەورەو شایستە بەرەو پێش بنێ...

–تەنیا لە مامۆستا ابراهیم احمدەوە سەرنووسەری ڕۆژنامەی خەباتی ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئەوسا فێری ڕۆژنامەگەرێتی بووم هەر لەڕیشەوە شێوە و داڕشتنی ڕستەی درێژی نووسینم هەڵگرتووە، واتا شێوە نووسینی ئەو لە شێوەی نووسینی مندا ڕەنگی داوەتەوە.

رەوشتێکی بایەخداری تریشم هەڵگرتووە. ئەویش هەر شتێکی ئەنووسی ئەبوو هیچ نەبێت نیشانی یەکێکی بدات. ئەیوت هەر هەڵەیەکم بۆ ڕاست بکاتەوە یاخود سەرنجی باشم بخاتە پێشچاو سودێکی باشی لێ وەرئەگرم بێ ئەوەی هیچ خەلاتێکی ئەو کەسە بکەم. بۆچی پێم خۆش نەبێت؟!!

- دەربارەی ئیزگەی کوردی سەبارەت بەوەی یەکێك بووم لە لێپرسراوانی پارتی لەمەیانی ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوەدا، چەند جارێك دوای شۆڕشی چواردەی تەموز و هەروەها لەکاتی جێبەجێکردنی بەیانی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٧دا و دوای ئەوە لە کاتی هاتنە سەرکاری پارتی بەعسی سۆشیالیستی هەوڵم ئەدا کە ئیزگەی کوردی پێش بخرێت و لە ئاستی ئەو قۆناغانەدا بێت کە گەلی عێراق تیایاندا ئەژیا.

بۆ جێبەجێ کردنی ئەم مەبەستە لەتەك لێپرسراوە هەرە گەورەکانی ئەو کاتانەدا گفتوگۆم ئەکرد و هەوڵو تەقەللام ئەدا، بەڵام داخەکەم کە کارەکە ئەگەیشتە نزیك بوونەوە لە بەئەنجام گەیشتن: شابالێك لەغەیبەوە ئەهات و کاسە ئاوەکەی ئەڕشت. دێتەوە بیرم جارێك تەلەفۆنیان کرد بۆ بەڕێوەبەری ئیزگەی کوردی کە بۆ پێشخستنی و چارەسەرکردنی کەموکورییەکانی هاوکارییەکی تەواوم لەگەڵدا بکات بەتایبەتی لەوکاتەدا رادیۆی کوردی کرماشان باڵی کێشابوو بە سەرگوێگرانی کوردی عێراقدا هەر بە بەرنامەی بە دیمەن و شێوە خۆش و ڕازاوەو بەناوەڕۆك پوچەڵ و تەمومژاوی.

کە چوومە ئیزگەی بەغدا لە نێو گفتوگۆ و لێکۆڵینەوەکاندا وتم ئەو گۆرانیانەی قەدەغەکراون چین؟ کە لیستەی گۆرانی قەدەغەکراوەکانیان بۆ دەرهێنام گۆرانی (ئەی خودا لەم ئاگربارانەی) تێدا بوو پرسیم ئەم گۆرانییە بۆچی قەدەغە کراوە. بەڕێوەبەری ئیزگەکە وتی ئەی ئاگر باران مانای شەڕوشۆڕ ناگەیەنێ لە کوردستانا لەلایەن سەرپێچکەرانەوە؟! بەزەردەخەنەیەکەوە پێموت (ئاگر باران) جۆرە قوماشێکی ژنانەیە ئافرەتی کورد ئەیکات بە کراس و کەوا.

جارێك وەزیری راگەیاندنی هەرە پێشوو حامد علوان تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی حەز ئەکەم هەموو ڕۆژی یەك شەموانێك سەرم لێ بدەیت تاکو هەوڵ بدەین ئیزگەی

کوردی بەغدا بەرەو پێش بەرین. پێموت یەکجار دێم و چی بە باش بزانم بە نووسین بۆت ئەهێنم.

پێش ئەوەی بچم لەتەك چەند ڕۆشنبیرێکدا کە لە ئیزگەی رادیوی بەغدا بوون یاخود لەوە پێش کاریان تێدا کردبوو، دەربارەی ئەم مەسەلەیە بیروڕام لێوەرگرتن و پێموتن بۆ مەبەستی پێشخستنی ئیزگەی کوردی ئەبێ هەوڵ بدەین.

دوای ئەوە لە شارەزایی ئەوان و خۆم راپۆرتێکم دەربارەی چارەکردنی ناتەواوییەکانی ئیزگەی کوردی بەغدا و پێشخستنی لە رووی شێوەو ناوەڕۆکەوە نووسیی و چوم بۆ لای وەزیر کە دیم لاوێکی لە لا دانیشتبوو پێی ناساندم کە بەڕێوەبەری بەشی عەرەبی ئیزگەی بەغدایە.

راپۆرتەکەم دایە وتی بۆمان بخوێنەرەوە باشترە کە هەموویم بۆ خوێندەوە بەزەردەخەنەیەکەوە وتی بەهەمان شێوە کێشە و بەرەی بەشی عەرەبی ئیزگەی رادیوی بەغداش چارەسەر ئەکرێت. راستییەکەی ئیتر جارێکی‌تر نەچوومەوە بۆ لای.

– ئەوی راست بێت تا ئەم سالانەی دوایی هەر بە نازناوەوە نووسینم بلاوئەکردەوە. تا جارێك خوا لێخۆش بوو مصلح جەلالی رابسپاردبوو کە پێم بلێن حەز ئەکەن ناوی خۆم لەسەر نووسینەکانم دابنێم. لەوەلامدا پێموتن من ڕقم لە خۆدەرخستنە دەنا ئەگەر ئێوە واتان پێخۆشە فەرموو بە ناوی ئاشکرای خۆمەوە نووسینەکانم بلاوبکەنەوە.

لە ڕۆژنامەی خەبات، نور، هاوکاری هەر بەبێ ناو یاخود بە ناوێکی ترەوە وەکو ئاسۆ نووسینم بلاو ئەکردەوە.

وەکو لەسەرەتاوە باسمکرد لە دەنگی گێتی تازە و ژین و خەبات و نور و هاوکاری و بەیان و ڕەنگین و ڕۆشنبیری نوێ و ڕۆژنامەی اتحادی بەغداو گۆڤاری ئەلف بادا نووسینم هەیە.

دەربارەی دوا ڕۆژی ڕۆشنبیری کوردی دوو لایەنی هەیە لایەنێکی گەشبینەو دڵی پێئەکرێتەوە کە بەگشتی باڵی پیرۆزی کێشاوە بەسەر لایەنە تارماوییەکەیدا.

بەلام لەبەشی دووەمییەوە دەست بە قسە ئەکەم، داخی گرانم کە ئەویش بەگشتی لە دەسەلاتی کورد بەدەرە. لەهەر پارچەیەکی کوردستاندا،

وە لەو وڵاتانەی کورد وەکو کەمایەتییەکی نەتەوایەتی ئەژین وەکو ئارمەنستان یا ئازربایجان یا جێگایانی‌تر زمانی کوردی کەم و زۆر لە ڕستە داڕشتندا بەدەست نووسەرانی نەشارەزای کوردەوە شوێن پێی زمانی ئەو گەلانەی هەڵگرتووە کە کورد لەگەڵیانا ئەژی واتا لە زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی و ئەرمەنی و ئازربایجانی و هی تر.

بەڵام لە هەموویان ناخۆشتر بەشەکەی عێراقە. چونکە لە عێراق دا لەتەك دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق دا دوای جەنگی یەکەمی جیهان و هەرەسهێنانی دەوڵەتی نەخۆشی عوسمانی، کورد بەمافی ئاخاوتن و نووسین و بڵاوکردنەوە بە زمانی کوردی گەیشتووە. لەشکرێکی گەورەی خوێندەوارو ڕۆشنبیرو خوێنەری کورد لە کوردستانی عێراق و بەغدا و چەند شارێکی تری عێراق دا هەیە. ئیزگەی کوردی‌و تەلەفزیۆن بە زمانی کوردی و ڕۆژنامەو هۆیەکانی تری بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن بۆ کورد ڕەخساوە لەبەرئەوە هەرگیز نەئەبوو زمانی کوردی شێوەی زمانی عەرەبی لێ بنیشێت. وەکو پسپۆرانی زمانەوانی ئەڵێن زمان بە وشە خواستن واتا زمانی هەر گەلێك و نەتەوەیەك بە وشەی بیانی خواستن لەکەدار نابێت بەڵام بەداڕشتنی ڕستە لەسەر شێوەی بیانی لەکەدار ئەبێت داخەکەم لەم ساڵانەی دواییدا ئەم دەردە سامناکە کە وەکو خۆرکەی زمان و نووسین وایە پتر بڵاوبۆتەوە.

ڕستەکانی نووسینی کوردی پڕبوون لەم وشانە لە نزیکەوە (عن قرب) و ئەگەڕێتەوە (یعود) و لەڕاستی‌دا (في الحقیقة) و لە ڕێگای (عن طریق).

بەڵام لایەنە باشە گەشەدارەکەی لە ئەنجامدا هەر ئەم لایەنە تەماوییە ڕائەماڵێت، چونکە کۆمەڵە دەزگایەکی گەورە لە کوردستان و دەرەوەی کوردستاندا بە زمانی کوردی و ڕۆژنامە و ئیزگە و چاپەمەنی و بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندنەوە خەریکن. هەروەها لەشکری کوردی بەنووسین و بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندنەوە خەریك بوو تا دێت زۆرترو فراوانترو پەرەدارتر ئەبن بە ژمارەو لێزانین و پسپۆڕێتی و لێهاتوویی، هەمیشە بەرەو هەوراز و هەوراز تر هەڵئەکشێن، بەڵام ئەم دیاردە گەشەدارە نابێ سەرخۆش و بەنجمان بکات، بەڵکو پێویستە ڕۆشنبیرە پایە بەرزەکان ئاگاداری پاراستن و پێشخستن و گەشەکردنی زمانی ڕەسەنی کوردی بن و کەس مل بۆ واقیعی بەزۆر سەپێنراو بەسەر زمانەکەمانا کەچ نەکات.

لەلایەکی ترەوە با نەك هەر کەڵك لە زمانەکانی گەلە دراوسێکانمان بەڵکو کەڵك لە زمانی هەموو گەلانی پێشکەوتوو خاوەن شارستانێتی وەربگرین وە لایەنە چاکەکانیان لە زمانەکەماندا ڕەنگ بدەنەوەو لە بریتی جارێك هەزار جار بەخێرهاتنیان لێ بکەین.

دوو یادگارت بۆ ئەهێنمەوە: جارێکیان مامۆستایەکی بەڕێز و ئەدیب ناوی لە ناوی یەکێکی بێ بایەخی خەڵکی سلەیمانی ئەچوو بە ناسیاوێکی خۆیدا وتارێکی نایابی بۆ ناردم کە لە ڕۆژنامەی هاوکاری دا بۆی بڵاوبکەمەوە سەرم سوڕما لەناوی نووسەرەکە، بەهەڵگری نووسینەکەم وت ئەم کەسە شتی وا ئەزانێت بنووسێت. هەڵگری نووسینەکە وەڵامی نەدامەوە چونکە نەیئەزانی کە من ناوەکەیم لەتەك ناوی یەکێکیتردا لێ تێکچووە. وتارەکەم بۆ بڵاوکردەوە. دوای ماوەیەك نووسەری وتارەکە وەکو لەبیرم بێ بە نووسینێکی ترەوە خۆی هات بۆ لام وتی من خاوەنی ئەو نووسینەم کە تۆ وات پێ وتبووم.

ڕاستییەکەی زۆرم پێ ناخۆش بوو پێموت من لەوە پێش ئێوەم نەئەناسی، نەمئەزانی ناوتان لەیەکتری ئەچێت، بەڵام زۆر سپۆرت بوو هیچ قسەکەمی نەگرتبووە دڵ.

جارێکی تر بەیەکێك لە نووسەرانی ڕۆژنامەی نورم وت وتارێك بنوسێت. تومەس پێش نووسینی وتارەکە ئەچێت خۆی مەست ئەکات و ئەوسا دەست ئەداتە قەڵەم کە وتارەکەیان بۆ هانیم سەیرم کرد لە هەموو شتێك ئەچوو لە وتار نەبێت بۆ ڕۆژی دووەم هات وتی وتارەکەم بۆ ناردی بۆ بڵاوت نەکردەوە، وتم وتارەکەت سەرخۆش بوو بەکەڵکی بڵاوکردنەوە نەئەهات ڕاستییەکەی نەمئەزانی بەسەرخۆشی نووسیوێتی.

- قەڵەمدار دەستی نووسەرە.

زەردەخەنە هەندێکی ئاورشێنی دەرونی دۆستی پێ ئەکرێت و هەندێکیتری ناحەزانی پێ تووڕە ئەکرێت.

فۆلکلۆر میرات و سامانی کۆکراوەی بەجێماوەی دەیان سەدەی کەسانی شارەزاو لێهاتووی وون ناوی بە نرخ و بایەخداری هەر گەلێکە.

– راستی‌یەکەی شیعری گۆران و پیرەمێرد و ئەحمەد هەردیم پێخۆشە هەروەها شیعری هەر شاعیرێك کۆن و تازە کە ئاسان و پڕ مانا بێت.

– لە دەنگ و ئاوازدا دڵم بەمەقام ئەکرێتەوە ئەوەندە سەرو سەختم لەتەك بەستەدا نی‌یە بۆیە گۆرانی‌یەکانی سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی و حەمە صالح دیلان و عەلی مەردان و سێوەو خالقی و تایەر تۆفیق و حەمەی بەکرو کەریم کابان و حەمە جەزاو عارف جەزراوی و هەموو مەقام بێژە رەسەنەکانی کورد لەهەر کوێی کوردستانا بووبن و ئێستا هەبن لەلام خۆش و بایەخدارە. داوای لێبوردنیش لەبەستە بێژان ئەکەم کە ئەوانیش شوێن و پایەی بەنرخی خۆیان هەیە.

– وەکو لە سەرەتاوە وتم کەڵکم لە هەموو کەسێك زیاتر لە مامۆستا ابراهیم احمد لە نووسینا وەرگرتووە، بەڵام لە ڕووی ئایدیۆلۆژییەوە خۆم بە قوتابی مارکس ئەزانم بەتایبەتی لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی چینایەتی و ئابووری و دامەزراندن و دروستبوونی مێژوودا.

ئەوەتی کەوتومەتە سەر نووسین کاکڵە وخەملێو زۆرتر پشتم بە لێکدانەوەکانی مارکس بەستووە و ئیتر بەدوای ئەودا هەر کەسێکی تر شوێن پێی ئەوی بەڕاستی و لێزانانە هەڵگرتبێت.

–راستی‌یەکەی لەماوەی هەرزەکاری ژیانما دووچاری فەریکە دڵدارییەکی ژاکاو بووم کە ئەویش هیچ ئەرکێکی ئەوتۆی نەخستبووە سەر شانم ئیتر دوای ئەو تەمەنە کاروباری سیاسی و پارتایەتی و گیران و دورخستنەوە و ئەم شاخ و ئەو شاخی کوردستان باویان لە هەموو دڵداری و دڵخوازییەکی تر سەندبوو. دڵ و دەروونم هەر جێگای دڵخوازی کورد و کوردستان و مرۆڤایەتی تیا ئەبووەوە.

–خوا لێخۆش بوو سەردەمێك ئەندامێکی پێشکەوتووی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، لەماوەیەکدا من لە ڕووی ڕێکخستنی پارتایەتی‌یەوە لێپرسراوی ئەو بووم. نووسینی بەکەڵکی هەیە.

هەروەها بەهۆی پارتایەتیشەوە دوکتۆر کامل بصیریشم ناسیوە ڕۆشنبیرێکی عەرەبی زان و زیرەك و خۆ پێگەیەنەر بوو.

بەلام لەتەك خوا لێخۆش بوو سەعید بەگی‌جاف دا هەر ناسیاوییەکی سادەمان هەبوو بەلام زۆر بەرێزەوە سەیرم ئەکرد کە خاوەن موڵك و یەکێك لەسەرەك عەشیرەتەکانی جاف بە نووسینی خزمەتی نەتەوەی کورد بکات.

– من پێی نالێم ئامۆژگاری بەڵکو پێی ئەڵێم سەرنج دەرخستن تا ئەتوانن هەموو بابەتێکی زانست و رۆشنبیری بخوێننەوە بەلام هەوڵ بدەن لە بابەتێکی تایبەتیدا شارەزایی پەیدا بکەن و بیکەن بەسەرچاوەی نووسینەکانیان. دەست بگرن بە زمانی کوردی رەسەنەوە. هەرگیزاو هەرگیز پارەو پول و دەستکەوتی تایبەتی قەڵەمەکانیان بەلای خراپدا نەخلیسکێنێت. چونکە ئەوەی لە دەست دەرئەچێت ناگەرێتەوە.

بەلای منەوە وەکو زەردەشت لە ئاوێستادا نزیکەی ۲۷۰۰ ساڵ لەمەوبەر وتوویەتی بیرو رای چاك، وتەی چاك، کردەوەی چاك. هەروەها خوا لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی (الأمر بالمعروف و النهی عن المنكر) واتا لەسەر کاری چاکە رۆیشتن و خۆ دوورخستنەوە لە کاری خراپە هەروەها لە پێغەمبەریان پرسی درودی خوای لێ بێت کێ موسوڵمانە فەرمووی (من سلم الناس من يده و لسانه) واتە ئەوەی خەڵکی زەرەر لە دەست و زمانی ناهێنێ.

بەلام داخی گران قازانجی چینایەتی و بیروڕای کۆنەپەرستانە و تەماعی تەسکی تایبەتی کۆسپ و تاوێری سەختی ئەم ڕێبازەن.

– بێگومان حەز ئەکەم بۆ ئەو دەزگایانە بدوێم و لەو دەزگایانەدا نووسینی خۆم بلاو بکەمەوە کە دۆستایەتی و ئاشنایەتی ئایدیۆلۆژیم لە تەکیانا هەبێت بەلام نابێ ئەمە رێگا لەکەس بگرێت کە لەهەر کۆرێکی تردا مۆڵەتی هەبێت دەنگو نووسینی خۆی بلاو بکاتەوە.

چونکە بایەخ لەوەدایە چی ئەڵێیت و ئەنووسیت نەك لەناوونیشانی دەزگاکەدا.

# سەرنجێکی پێویست

زۆر بە پێویستی ئەزانم کە ئەم سەرنجانە پێشچاوی خوێنەری بەڕێز کە ئەبێ ڕاستیی و ڕوون کردنەوەو دەروون خستنەڕووی نووسەرو خوێنەران بەیەکەوە ببەستن و هەر ئەمانە پێوەری ئەو بەرهەمانە بن کە بۆ کۆمەڵانی خەڵك و جێبەجێ کردنی ئاوات و ئامانجەکانی دێنە کایەوە.

یەکەمیان ئەوەیە کە نابێ بیشارمەوە، من لە نووسینی ئەم باسەدا کە دەمێکە بەدەستەوەم بیخەمە پێشچاو بێلایەن نیم؛ واتا وەکو نووسەرێکی بێباکی بیانی نەهاتومەتە کۆڕی ئەم بابەتە نووسینەوە، بەڵکو وەکو کوردێکی لایەنگیر کە پێی خۆش بێت، مێژووی کورد ڕازاوەو پڕ شانازیی و ڕەوتی ئەم مێژووە لە پێکهێنانی مەرجەکانی هانینە کایەی نەتەوەدا سازو لەبارو بناخە سەرەکییەکانی لەسەر بنچینەیەکی قایم داڕێژراو بێ.

گەرچی لەگەڵ ئەم پێلێنانەشدا کە کەم نووسەر خۆی لێئەدا هەرچەندە ئەو نووسەرانە لایەنگیرو تەنانەت قسە هەڵبەستیش بێ، نەهاتوم بەخوتو خۆڕایی و لەبەربورە جڵەوی ناڕاستیی و نازانستیانە بۆ خامە بەرەڵا بکەم و بێ پێوەرێکی باوەڕ پێکراوو سەنگ و تەرازووی ئەم گۆڕەپانە، بکەومە گیانی بابەتەکە، بەڵکو بەپێچەوانەوە بەدوری دەیان سەرچاوەی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و فەلسەفی و یاسایی و دەستووریدا گەڕاوم و لێیان کۆڵیومەتەوە. لێرەدا ئاماژەم بۆ ئەوانە کردووە کە لێم وەرگرتوون و سەرجەم بابەتەکەش ئەخەمە پێشچاوی ئەو نووسەرە بەڕێزانەی خۆیان لەم بابەتە نووسینە ئەدەن و بەدوای گەشەپێکردنێکی پترو دەوڵەمەندکردنێکی زیاتردا ئەگەڕێن.

لامواية هەر ئەو لايەنگيرييە بزوێنەرەشە هانی دابم خۆم بەجۆرە باسێكی واوە خەريك بكەم، دەنا لەم جيهانە پانو بەرينەدا باسو لێدووانو لێكۆڵينەوەی سەدانو هەزاران بابەتیترهەن.

دووەميان كە كەوتومەتە لێوەرگرتنی باسو بەڵگەی پسپۆڕو زاناو مێژووناسێكی باسەكە لە زمانێكی بيانييەوە بۆ زمانی كوردی، پتر خەياڵی خۆم خستۆتە سەر ئەوەی دەقی بيروڕاو بۆچوونی ئەو بەرێزانە بگوێزمەوە، تاكو ئەوەی بە كوردی‌يەكی پاراوو پالاوتە بيخەمە پێشچاو. بۆيە ئەگەر لەنگیو كەموكوڕييەك لەڕووی رستەكانەوە هاتنە پێشچاو داوای لێبوردن لەخوێنەرانی بەرێز ئەكەم.

بەلام دەربارەی گواستنەوە لە سەرچاوە كوردييەكانەوە هەروەكو خۆی گواستومنەتەوە، بۆيە چاكیو كەموكوڕی هەردوولا، رووی خاوەن نووسينەكە ئەگرێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا هەر داوای لێبوردن لەوانو لەخوێنەرانی بەرێزيش ئەكەم.

# پێشەکیی

لەساڵی ١٩٤٧ هەر چاوم لە کۆڕی سیاسەت و پارتایەتیدا هەڵهێنا لە هەموو بیروڕاو ناکۆکی‌یەکی سیاسی پتر ئەو باسەم ئەکەوتە بەرگوێ کە ئایا کورد نەتەوەیە یاخود گەلێکی بەش بەش کراوە لەنێوان عێراق و ئێران و تورکیا و سوریادا؟ وە ئەگەر کورد نەتەوە نەبێت، ئایا مافی ئەوەی هەیە پارتی‌یەکی تایبەتی لە کوردستانا بۆ خۆی پێکەوە بنێ و ئەو پارتی‌یە بەرەو جێبەجێ‌کردنی ئامانجە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری‌یەکانی خەباتی رێك بخات و رابەری بکات؟

لەکۆڕی ئەم لێکۆڵینەوە سیاسییەدا چەپرەوە بەهەڵە چووەکان لایان وابوو کە کورد هێشتا مەرجەکانی پێکەوەنانی نەتەوەی بۆ نەرەخساوە بۆیە پێویستە لە هەر وڵاتێك لەم وڵاتانەی کوردیان تیا ئەژی، خەباتکەرانی چینە زەحمەت کێشەکانی کورد خۆیان لەریزی پارتی‌یە زەحمەت کێشەکانی ئەو وڵاتانەدا رێکبخەن چونکە لەتەك یەکتریدا هاو قازانج و هاو ئاوات و هاو ئاسۆی سیاسی و ئابورین.

بۆیە هەر لەو کاتەوە ئەم کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتییەم کردبوو بەخولیای سەری خۆم و بەدووی کەرەسەو بەڵگەی زانستیانەی زانا و پسپۆرە شارەزاکانا ئەگەڕام تا بیروڕای خۆم لەم کۆڕە گرنگەدا گەلاڵە بکەم و لەچوارچێوەی شایستەی خۆیدا سەقامگیر ببێ.

بۆیە هەر زوو گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە کورد یەك نەتەوەیەو مافی جێبەجێکردنی ئامانجە نەتەوایەتییەکانی خۆی هەیەو بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەم ئامانجانەش پێویستی بە دەزگایەکی سیاسی واتا بە پارتی‌یەکی کوردستانی لەهەر پارچەیەکی کوردستانا هەیە.

لەلایەکی تریشەوە ئەوی راست بێ شارەزایان و پسپۆران و تیۆریستەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەپێی کات و جێگا و ئایدیۆلۆژییەتی جۆراو جۆری خۆیان واتای نەتەوە (الأمة)– (*Nation*) لێك ئەدەنەوە. خاوەنانی ئایدیۆلۆژییەتی ئایینی بەتایبەتی ئەوانەی سەر بەئایینی ئیسلامن لایان وایە کە گەلانی بڕوا هێنا و بەئایینی ئیسلام چەندە جیاوازی زبان و ڕەگەزیان لەنێواندا هەبێ هەموویان یەك نەتەوە پێکدێنن کە ئەویش نەتەوەی موسوڵمانە. ئەوانی تریش کە ئاین بەئامرازی سەرەکی لە پێکهێنانی نەتەوەدا دانانێن هەموویان لەسەر ڕێڕەوێك ناڕۆن بەڕێوە، بەڵکو هەرلایە پەنا ئەبەنە بەرچەند بەڵگە و ئامرازێك کە ئەیانکەن بە بەردی بناخەی پێکەوەنانی نەتەوە.

بۆیە دەمێکە بیرلەوە ئەکەمەوە کە بەرهەمێکی نووسراوە بخەمە پێشچاوی خوێنەرانی بەڕێزی کورد تا لەبەر ڕۆشنایی ئەم بەرهەمە چەند بەدەسەڵاتدا بێت هەموو لایەنەکانی پێ شیبکەنەوە و لەچەندوچوون و فرە لێك دانەوەی جۆراو جۆر خۆیان رزگار بکەن.

هەروەها لەم ساڵانەی دواییدا کە بزوتنەوەی ڕۆشنبیرانەی دڵ خۆشکەرانە، سەرانسەری کوردستانی گرتۆتەوە و گەلێك پسپۆڕو شارەزاو زانای کورد پەیدابوون و کەوتونەتە کۆڕی لێکۆڵینەوە و دیراسەتی مێژو و ئەدەب و زبان و فۆلکلۆرو.... بەشەکانی تری مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئابوری کۆمەڵگای کوردستانەوە، لەلایەن خوێنەرانی خەڵکی کوردستانەوە بەرهەمەکانیان باوەشی بۆ گیراوەتەوە، وە لە گۆرەپانی فراوانی ئەم دیاردە پیرۆزەشدا هەندێ بیروڕاو بۆچوون کەوتونەتە نێوانەوە کەگومان ئەخەنە قەوارەو مەرجەکانی پێکهاتنی نەتەوەی کوردەوە، پشت بەو بۆچوونەی کەلە کوردستانا پێش کۆچە گەورە مێژوویی‌یەکانی قەوقاس و پشت دەریای خەزەرەوە خەڵکێکی فرە هەر لە کوردستانا ژیاون و ئەم خەڵکە چۆن لەم پارچە زەوییەی سەر زەمین دا ژیاون و لەکوێوە هاتوون و سەر بە چ ڕەگەزێکن!!.

ئەم بۆچوون و شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەیە، هەرچەندە لاوازو دەنگ نووسا و بێت هەر تا ڕادەیەك سەر لە ڕۆڵەکانی کوردستان ئەشێوێنێت، بەتایبەتی کە سەری لەسەرچاوەی گەلەکەی خۆی دەرنەچێت و ریشەو ڕەگەزی خۆی وەکو منداڵێکی باوك

نەدیو نەناسێ، ئەکەوێتە نێو بارودۆخێکی شێواوو ملکەچ و ڕەسەن نەناس و سەردانەویو بۆ گەلانی خاوەن ریشەو ڕەسەن. بۆیە نووسین و لێکۆڵینەوەو لەسەر ڕۆیشتنی ئەم باسە بەئەرکی‌خۆم‌و هەموو نووسەرێکی شارەزای ئەم بابەتە ئەزانم‌و هیوادارم ئەمە دوا نووسین و بەرهەمی ئەم گۆڕەپانە گرنگە نەبێت.

ئەوی ڕاست بێ، پێویستە سەرنجی خوێنەرانی ئەم باسە بۆ بەرهەمە مێژوییە بەنرخەکەی خوا لێخۆش بووی پایە بەرز مامۆستا ئەمین زەکی بەگ ڕاکێشم کە لە مێژووی کوردو کوردستانا بەپێی دەسەلاتی خۆی‌و زانستی ئەو کاتەی ئەو پسپۆڕو شارەزایانەی دەستی بە بەرهەمەکانیانا گەیشتبێ تیشکێکی گرنگ‌و بەنرخی خستۆتە سەر ئەم باسە، هەرچەندە بێ ئەوەی گوێ بداتە پێکەوەنانی مێژوویی نەتەوە، هەر لەسەرەتای ناسینی کوردەوە لەمێژووی گەلان دا تا نووسینی بەرهەمەکەی خۆی، کورد بەنەتەوە لەقەڵەم ئەدات کە لە لاپەڕەکانی داهاتوودا ئەم لایەنە نەبێت بەخاڵێکی گرنگی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی باسەکەمان.

# گەل و نەتەوە

داخەکەم لەزۆر زمانانی جیهاندا تەنیا یەك وشە واتای گەل و نەتەوە ئەگەیەنێت، کە ئەبوایە وەکو لە زمانی عەرەبیدا جیاکراوەتەوە بە (الشعب) و (الامە) لەو زمانانەشدا هەروا بوایە کەچی ئەوەتا لەزمانی ئینگلیزی دا بەپێی هەموو فەرهەنگە ئینگلیزی‌یەکانی بەردەست وشەی (*Nation*) واتای هەردوو گەل و نەتەوە ئەگەیەنێت، بەڵام خۆشبەختانە لەزمانی کوردی‌دا بەدوو وشە لەیەکتری جیاکراونەتەوە.

جاپێش ئەوەی بچینە قوڵایی باسەکەمانەوە ئەبێ ئەو ڕاستی‌یە بخەینە ڕوو کە گەل و نەتەوە هەردووکیان وەکو هەموو گیاندارێکی ئەم سەر زەمینە کوتوپڕ نەهاتونەتە کایەوە، بەڵکو بەقۆناخە جۆراو جۆرەکانی پەیدابوون و نەشونما و ساوایەتی و منداڵێتی و هەرزەکاری و کامڵ بووندا تێپەڕیون.

ئەمە گەل و نەتەوە خۆ ئادەم زاد هەر خۆشیی دوو قۆناخی گۆڕان و نەشونما و پەیدابوونی دیوەو ئەبینێ.

یەکەمیان پێش ئەوەی پێ ئەخاتە سەر زەوی و دێتە ئەم جیهانەوە بەنزیکەی نۆ مانگ دایکی بەپێستی سك هەڵیئەگرێت و وردە وردە پەروەردەی ئەکات و بەساوایی لەتەمەنی یەك چرکەو هەناسەدا ئەیخاتە سەر زەوی.

دووەمیان هەر ئەم ئادەم زادەی ئەمڕۆ بەم ڕێکوپێکییەی خۆمانی تێدا دەبینین پاش ئەوەی کەوتۆتە سەر قەوارەی گیاندارێکی لەسەر دوو پێ ڕۆیشتوو، بەچەند قۆناخێکی سەدان هەزار ساڵ ئەگەر نەڵێین ملیۆنان ساڵ تێپەڕی کردووە تا بەم ئەنجامە ڕێکوپێکە گەیشتووە. کەگومان لەوەدا نی‌یە ئەم پێشکەوتی و بەرەو چاکتر ڕۆیشتنە هەر بەردەوام درێژەکێش ئەبێت.

بۆیــە تەمــەنی ئــادەم زادی ژیــرو زیــرەك و پەیكــەر شــیرین لــەچاو تەمــەنی ڕابوردوویدا ئەبێ بە بەشێكی كەمی سەرجەم تەمەنی لەقەڵەم بدرێت. خۆ تەمەنی گەل و نەتەوە لەچاو ئەمیشا هەر ئێجگار كەم ئەبێتەوە، كە زانایانی كۆمەڵگاو مێژوو ناویـان نـاوە دەوروبـەری شارسـتانێتی، كۆمـەڵگای مرۆڤایـەتی شارسـتانانە لـەهیچ حاڵێكدا لەپانزە هـەزار ساڵ پتر تێناپـەڕێت و پێش ئەم مێژووە ئادەم زاد بەكۆمەڵی بچوك بچوك كە زۆربەی زۆریان لەخێزانێك یاخود چەند خێزانێك پێكهاتبون، نە گەل هەبووەو نە نەتەوە!.

لەبەر ئەوەی باس و لێكۆڵینەوەكەمان بەتایبەتی لەسەر پـەیدابوونی نەتـەوەی كوردە، خۆمان لـەوكات و زەمانـە نادەین كە ئادەم زاد پەیكەرو قەوارەی ئادەم زادی ژیر (العاقل)ی خۆیەوە نەگرتووە واتا ئادەم زادی ناژیر.

ئەوەی ڕاست بێ بۆ ئەوەی هەر نووسەرێك بتوانێت دەستی ڕاستەقینە بخاتە سەر باسی پەیدابوونی نەتەوەی كورد ئەبێ چاوێك بەمێژووی خاكی كوردستانا پێش دەیان هەزار ساڵ تائـەمڕۆمان بگێڕێت و بەسـەرهات و گـۆڕان و پێشكەوتنی كۆمەڵگای ئەم خاكە بخاتە سەر باس و لێكۆڵینـەوە، ئەوسا ڕەنگە بەئەنجام بگات و تینوێتی دەروونی خوێنەری كورد بشكێنێ.

گـەر بەسـەرچاوە مێژووییـنـەكانا بگـەڕێین، ڕاستی‌یەكی دڵخۆشـكەرەمان دێتـە بەرچاو كە بەشانازی و سەربەرزی‌یەوە باسی گەل و نەتەوەی كورد بخەینە پێشچاوی گەلانی نزیك و دوورو دراوسێ و نا دراوسێ.

چونكە كورد لە گەل و نەتـەوە هـەرە كۆنـە خـاوەن مێـژووە شارستانی‌یەكانی سـەر ئـەم زەمینەیـە. ئـەو گەلانـەی ئـەمڕۆ دەسـەڵات و سـەروەری سیاسـی‌یان لـە ناوچەكەو دەرەوەی ناوچەكەدا بەدەستەوەیە لەچاو كوردا هەموویان هێشتا بەتەمەن ساواو كۆرپەن.

وە نەبێ ئەم وتەیە هەر كەللە گەرمیی و خۆهەڵكێشان بێت، بەڵكو چەند گەلێكی ناوچەكـە كـە لەتـەك كـوردا لەیـەك قـەوارەی سیاسـی‌دا ئـەژین تائێسـتا خۆیـان بـە كۆنێتی و دێرینە ژیان و شارستانێتی كوردەوە هەڵئەكێشن.

وا بۆ بەڵگەی ڕاست و دروستی ئەم بۆچوونە ئەم ڕاستی‌یە مێژووییانـەی كـە زانایانی گەلانی تری جیهان ساغیان كردۆتەوە ئەخەینە پێشچاوی خوێنەرانی بەڕێز.

"لــه چــاخی بەردینـــەی کۆنــدا، بـــەپێی کۆنینـــە (الاثـــار) دۆزراوەکـــان، لـــە ســـاڵی ١٩٢٨ لـــە ئەشـــکەوتی زەرزی کـــە ئەکەوێتـــە بـــاکوری ڕۆژئـــاوای شاری سلەیمانییەوە هـەندێ ئـامرازی لـە بـەردو شووشـەی بورکـانیو ئێسـقانی ئـاژەڵی کێـوی دۆزراونەتــەوە، وە لەمـــەش گرنگـتر (رالـف سـولیکی) لـــەچینی ســـێیەم (ج) لـــە ئەشـــکەوتی شـــانەدەریدا هـــەندێ ئـــامرازی ئـــەم چاخـــەی دۆزیوەتـەوە، بۆیـە ئـەم پشـکێنەرە ئـەم چاخـەی ناونـاوە چـاخی (برادۆسـتی) وە تەمـــەنی کۆنینـــەی ئـــەم چینـــە بـــە ٣٤٠٠٠ ســـاڵی رابـــوردوو لـــە قەڵەم ئەدەن.

هەروەها کۆنینەی ئەم چاخە لە (بالی کورا) کە پەناگەیەکی بەردیینەیە ئەکەوێتە سەر (بارانانداغ) کەلـە بـاکوری ڕۆژهـەلاتی قـەلای جـەرمۆوە (٢٠) کیلۆمـەترە ئـەبێ دۆزراوەتەوە.

هـەروەها لـە باراكو حاجی‌یـەی نێـوان ئاکرێو زێی گـەورە لـە بێخـاڵی نزیـك هاودیانو ڕەواندزیشـەوە کۆنینـەی وا دۆزراوەتـەوە، هـەروەها لەلایـەکی تـردا وتـراوە لەناوچەکانی بەشی باکوری عێراق دا"[١].

"لەسنوری (٩) هـەزار ساڵی پێش زایینی‌دا مرۆڤی ناوچەکە دەستیان داوەتـە ئاژەڵ حاڵی کردنو کشتوکاڵ کردن، بەتایبـەتی لەدەوروپشتی شارەکانی کـەرکوكو موصلدا"[٢].

لەچاخی نیمچە کۆنی بەردینەدا کەپێی وتراوە (لڤالوازی مستیری)و ئەکەوێتە کۆتایی ماوەی سێیەم بەستەڵۆکەوەو لەچاخی چوارەم بەستەڵۆك (العصر الجلیدی الرابع)دا گەلێك ئامرازی بەردینە دۆزراوەتەوە.

خاتو دوروتی کارود-ی ئەمەریکایی لەساڵی ١٩٢٨ لە ئەشکەوتی هـەزار مێردا کـە دوانـزە میـل لـەخواروی سـلەیمانییەوە دوورە، هـەندێ ئـامرازی دۆزیوەتـەوە، هەروەها لەناوچەی سلەیمانی لە ئەشکەوتی زەرزی پاشماوەی ئەم چەرخەی بەدی کردووە.

جگە لەمانە لـە گـەڵ ئەشکەوتی‌تر لە باکوری عێراق کـە هـەرە بە ناوبانگەکەی ئەشکەوتی شانەدەری‌یە، وە لـە ئەشکەوتی(بێخاڵ) لـە نزیك دەشتی دیانەدا گـەلێك کۆنینەی ئەم چاخە دۆزراوەتەوە.

بەڵام دەربارەی ئەشکەوتی شانەدەری کەپەیکەری ئادەم زادی (نیاندەرتاڵ) کە لەم دەوروبەرەدا ژیاوە دۆزراوەتەوە، بەم جۆرەی خوارەوە ئەیخەینە پێشچاو.

ئەشکەوتی شانەدەری، لە ئەشکەوتە بەناوبانگەکانی کوردستانی عێراقە، ئەکەوێتە شانی باشوری شاخی برادۆستەوەو ئەڕوانێتە سەر دۆڵی زێی گەورە.

ئەم ئەشکەوتە بەرێوەبەرایەتی گشتی ئاثار دۆزیویێتییەوەو مۆڵەتی بە مامۆستا (رالف سولیکی– *SoLecki*) لەجیاتی زانکۆی مەشیگانی ئەمەریکایی و پەیمانگای (سمشونی) ئەمەریکایی داوە لێی بکۆڵێتەوە. ئەم مامۆستایە لەساڵی ١٩٥١–ەوە تاساڵی ١٩٦١ بەدواوە کەوتۆتە پشکنین لەم پشکنینەدا کۆنینەی چاخی نیمچە کۆنی چاخی بەردینەی دەوروبەری مستیری*Mousterian* دۆزراوەتەوە.

ئەو دەوروبەرەی ئادەم زادی نیاندەرتاڵی لەماوەی سەدان سەدەدا تێیدا ژیاون، کەبەپێی پشکنین و بەکارهێنانی کاربۆن–١٤– دەرکەوتووە ئەکاتە نێوان ٦٠٠٠٠– ٤٥٠٠٠ ساڵ لەمەوپێش[٣].

لەم ئەشکەوتەدا چوار پەیکەری ئادەم زاد دۆزراونەتەوە، یەکێکیان هی منداڵێکی نزیکەی شەش مانگان بووەو دووانیان هی دوو ئادەم زادی گەورە بوون و چوارەمیان تەمەنی بە (٣٥) ساڵ لەقەڵەم دراوە. تەمەنی سێ پەیکەریان بە (٤٥٠٠٠) ساڵ لەمەوپێش لەقەڵەم دراوە بەڵام هینی چوارەمیان بە ٦٠٠٠٠ ساڵ لەمەوپێش.

"وە نەبێ ئەمانەش کۆنترین مرۆڤ بن کە لەو چاخەدا ژیابن لەوانەیە پشکنین و بەدوادا گەڕانی تر مرۆڤی لەوە کۆنتریشمان بۆ دەربخات.

بەڵام لە گردی شمشێرەو گردەکانی تری دەشتی بتوێنی ڕانیەدا لەپاش دەرکەوتنی ئەنجامی پشکنینەکان ئاشکرابوو کە لەم دەشتە بەپیتو بەرەکەتەدا لەچاخی بەردینەی نوێوە مرۆڤی تیا ژیاوە. ئەو ژیانەی مرۆڤیش لەهەموو چاخەکانی پێش مێژوودا درێژەی کێشاوە هەروەها لەدوای چاخە مێژووییەکانی دواییشدا[٤]".

"ئەمە لەو چاخە هەرە کۆنانەدا، بەڵام دوای ئەوچاخانەش، لەچاخی بەردینەی کۆنی نزیک *uppen PoLaeoLi thie* دا کە ئەکەوێتە نێوان (٤٠٠٠٠– ٥٠٠٠٠) ساڵ لەمەوبەرەوە کە ئادەم زادی نوێی تێیدا ژیاوە ناویان لێناوە ئادەم زادی ژیر (العاقل) *Homo Sapiens*، زۆربەی زۆری کوردستان بەم ئادەم زادە ژیرانە ئاوەدان بۆتەوە کە بە ئامڕازی بەردینەکانی ئەم دەوروبەرە لەکوردستانی عێراق دا ئەڵێن.

دەوروبەری برادۆستی سەبارەت بەشاخی برادۆست کە چینی C لەئەشکەوتی شانەدەریدا سەربەم دەوروبەرەیە.

هەروەها کەلوپەلی ئەشکەوتەکانی زەرزیو هەزار مێردی نزیك شاری سلەیمانی لەکوردستانی خوارووداا.

وە لەسەرەتای دەوروبەری چاخی بەردینەی نوێدا یاخود لەکۆتایی دەوروبەری بەردینەی ناوەڕاستدا کە ئەشکەوتەکانی شانەدەری (شانەدەرو کریم شهرو جەرمۆو شمشارەو چەند جێگایەکی تر سەرەتای ئاژەڵداریو کشتوکاڵکردنو دێهات دامەزراندن بەرچاو ئەکەوێت"[١٥].

لەم ڕاستییانەی سەرەوەدا بە بەڵگەی مێژوویی بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە کوردستان ئەو ناوچە دێرینانەیە کە ئادەم زادی تیا ژیاوەو بەپێی چاخی ئەو کاتەی خۆی لە مەیانی شارستانێتیدا دەست پێشکەری تیاکراوە.

سەبارەت بەوەی ئەم چاخە چاخی پێش مێژووەو نووسینو خوێندنەوە نەکەوتۆتە ناو ئادەم زادەوە، هەر پشت بەو کۆنینانە ئەبەسترێت کە لە ئەشکەوتو چەند چینێکی بن خاك دا لەملاو لەولای کوردستان دا دۆزراونەتەوەو ئەوەی بۆ ساغ کردوینەتەوە کەخەڵکی ئێستای ئەم وڵاتە دێرینە لەخەڵکە هەر کۆنەکانی سەر زەمینو بەرەبەرە پێکهاتوونو تێکەڵ بە کۆچکەرانی دوورو نزیك بوونو هەندێکیشیان لەبەر هۆی جۆراوجۆر ئەم وڵاتەیان بەجێهێشتووە، یاخود پێیان بەجێهێڵراوەو ڕوویان کردۆتە ناوچە نزیكو دراوسێکانی خۆیان بۆ ڕۆشن کردنەوەیەکی پتری ئەم باسە دوکتۆر فاضل عبدالواحد علی ئەڵێت "کۆمەڵانی نیشتەجێ لە ئەشکەوتەکانا وە لە نیشتەجێ سەر بەتاڵەکانا لەباکوری وڵاتا (واتا کوردستانی عێراق) لەپێناوی مانەوەدا کەوتنە بەربەرەکانی دژی هێزەکانی سروشت، بەهۆی ئەوەوە کە ئامرازە بەردینەکان چاکتر بکەن بۆ دەست خستنی خواردەمەنی لە دەوروبەری ٢٥ هەزار ساڵ پێش زایینیدا ئامرازە بەردینە لیوار تیژەکان زۆرتر لەلایەن ئادەم زادی چاخی بەردینەی کۆنی نزیکەوە بەکارئەهێنران.

هەندێ لەم ئامرازە بەردینانە سەبارەت بەو وردەکارییەی لەگەڵیانا بەکارهێنرا بوو، لەنێو کۆنینە ناسەکانا پێیان ئەڵێن ئامرازی بەردینەی ناسك (الدقیق *MiepoLi thie*).

ئـادەم زاد لـەپێناوی پـەیداکردنی سـەرچاوەی خواردەمـەنی‌دا جگـە لـە کۆکردنەوەی میوەو ڕەگی ڕووەك بەردەوام خەریکی ڕاوکردن بوو.

لـە قۆنـاخێکی تـردا ئـادەم زاد جگـە لـە ڕاوکـردن پشـتی بەهـەندێ دانەوێڵـە بەست کـە ئەمـە سـەرەتای دەسـت پـێ کردنێـك بـوو کـە لـە ئـەنجامدا بـە کشـتوکاڵ کردنی گەیان.

ئەگـەر زانسـتیانە لێ‌ی بدوێـین ئـەبێ بڵێـین لـەچاخی بەردینـەی ناوەڕاسـت دا لەدەوروبـەری ۹۰۰۰ سـاڵ پێـش زایینـی‌دا لـە قۆنـاخی کۆکردنـەوەی ئازووقـەوە ڕووکراوەتە قۆناخی بەرهـەم هێنـانی ئازووقە کە ناوچەی (کریـم شـهر)ی شـەش میل لەچەمچەماڵەوە دوور نموونەی ئـەم قۆنـاخەیە، هـەروەها ناوچـەی (ملفعـات) لـە قەراخ ڕوباری خازەری نێوان موصڵ و هەولێر.

ناوچەی (جرمو)ی نزیك چەمچەماڵ بە نموونەی دێیەکی کشتوکاڵی لە باکوری وڵات دا ئەژمێردرێ.

پشکنینی ئەم ناوچەیە (١٦) چینی نیشتەجێ بوونی تێیدا دەرکەوتووە کەپێنج چینـی ژووروویـان کۆنـترین پیشەسـازی فـەخفوری لـە وادی ڕافیدەیـن دا تێیـدا دۆزراوەتەوە....

لـە دەوروبـەری (٤٠٠٠) سـاڵ پێـش زایینـی‌دا ڕووی کـردە بەشـی باشـوری وڵات کـە لـە کۆنینـەی (تـل العبیـدی)ی چوار میل دوور لـە باکوری ڕۆژئـاوای شـاری (اور)-ەوە خۆی ئەنوێنێ".

ئـەوی ڕاسـت بـێ لـەوە زیـاتر بـەم کەسـانە وەکـو خـێزانێك و چـەند خـێزانێك و کۆمـەڵ کۆمـەڵ ئـادەم زاد ناولێنـان نـاتوانین هیـچ نـاوێکی تریـان لـەم نـاوە تازانـەی ئـەم سـەردەمەی ئێسـتامانیان لێ بنێـین وەکـو نـاوی گـەل و نەتـەوە، هەرچـەندە هـەندێ مارکسـی پێیـان ئـەڵێن قـەوم سەبارەت بـەوەی یـەك خوێـن و قەبیلـەن. چونکـە هـەردوو کۆمەڵگاکـە، دوو کۆمـەڵگای نـوێ پێکـەوەنراوی پاڵاوتـەی خـاوەن هـەڵو مـەرجی تایبـەتی دوای چـاخی مێژوویی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی نین.

خۆ نەتەوە کە ناوەڕۆك و سەرچاوەی باسەکەمانە تەمەنی مێژوویی زۆر نوێ و سەر بەسەدەکانی ئەم دواییەمانە.

ئەوی ڕاست بێ لەبەرئەوەی پسپۆڕان و زانایانی کۆمەڵایەتی و سیاسی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بیروباوەڕی جۆراوجۆرو نزیک بەیەک وە لەیەکتری جۆش نەخواردوویان دەربارەی نەتەوە (الأمة) هەیە.

پێویستە لە کاتی خۆی لەلاپەڕەکانی داهاتوودا بە وردی و زانستییانە لەم باسە بدوێین و بیروڕای هەموو لایەنە سەرەکی یەکانی بخەینە ڕوو تاکو دیمەنێکی ڕۆشن بکەوێتە پێشچاو.

وەکو ئەزانین لەم ناوچەیە واتە لە ناوچەی ئاسیای نزیک و ناوەڕاست دا بەگشتی، سێ ڕەگەز بەزۆری ناویان ئەهێنرێت. وە لە لاپەڕەکانی مێژوو نووسراوە زانستی و کۆمەڵایەتی یەکانا، شارەزایان و زانایان و پسپۆڕانی ئەم لایەنەی ژیانی مرۆڤایەتی خۆیان پێوە خەریک کردووە، ناوی ڕەگەزی ئاری و سامی و زەرد پێست باس ئەکرێت. بۆیە پێویستە تیشکێکی ڕۆشن بخرێتە سەر ئەم باسەو لەبەر ڕۆشنایی ئەم تیشکەدا مێژووی کوردو کوردستان شی بکرێتەوەو نەتەوەی کوردی تیا بەڕوونی بخرێتە بەرچاو.

وەکو باسمان کرد لە کوردستانی ئێستا لە هەموو پارچەکانی لە تورکیا و ئێران و عێراق دا بەپێی هەموو بەڵگە دێرینە دۆزراوەکانی ناو ئەشکەوتەکانی ئەم پارچانە خەڵک و ئاوەدانی هەبووە.

سەبارەت بەوەی نووسین و خوێندنەوە وەکو هەموو بەشەکانی تری جیهان نەبووە، نازانرێت ناویان چی بووەو بە چ زبانێک دوواون.

بۆیە هەر پشت بەو ئامرازە بەردینانەو هەندێ وێنەی سەر بەردو ئێسک و پۆسکی دۆزراوە بەستراوە.

چونکە ئاووهەواو خاک و زەوی و زارو مەرجەکانی تری وڵاتی کوردستان بۆ ژیانی ئادەم زاد زۆر لەبارو بەکەڵک بوون، کۆمەڵانی خەڵکی تر لە دوورەوە هەستیان بەم حاڵە لەبارەی کوردستان کردووە، بۆیە کە ژیانی نالەبار و تەنگوچەڵەمەی ناخۆش ڕووی تێ کردوون یا بە ئارەزووی داگیرکردن و کەڵک لێ وەرگرتن ڕوویان کردۆتە خاکی کوردستان و بەخۆشی و ناخۆشی خۆیان تێدا کردۆتەوە.

# کۆچی ئاریایی بەرەو وڵاتی کوردستان

ڕاستی‌یەکەی مێژوو ناسان ئەم کۆچکردنە ئەکەن بەدوو شەپۆلەوە، شەپۆلی کۆچی یەکەمی ئاریایی لە ئاسیای ناوەڕاستەوە بە (٣٠٠٠) ساڵ پێش زایینی لەقەڵەم ئەدەن، وە هی دووەمیان بە (١٠٠٠تا٧٠٠) ساڵ پێش زایینی، کە لە هەموویان بەناوبانگتر شەپۆلیی هاتنی مادەکانە بۆ کوردستانی ئێستای ئێران و تورکیا و عێراق.

دوکتۆر زەبیح ئەڵڵا سەفا ئەڵێت[٦] "مێژووی داستانەکانی ئێرانی لەو ڕۆژگارەوە دەستی پێکردووە کە قەومی ئێرانی ڕووی کردۆتە ئێران. قەومیی ئێرانی یەکێکە لە قەومە هندۆ ئەوروپاییەکان *Endo Europeene*، کە وردە وردە لە ئاسیای ناوەڕاست و دەرەی گنگ تا لێواری ئۆقیانووسی ئەتڵەسی پەرتوبڵاو بونەتەوە، وە دنیای نوێیان دۆزیوەتەوە و لەزۆر شوێنی گێتی‌دا سەریان هەڵداوە.

لەنێوان بەشەکانی ئەم نەژادەدا یەکێکیان لە ڕۆژگارە کۆنەکانا دیارو گرنگترو شارستانێتی و ئەدەب و ئاین زای کۆنتریان هەبووە کە بەشەکانی هندو ئەوروپایی نەژادی هندو ئێرانین، وە لەوە ئەچێ لە سنوری (٣٠٠٠) ساڵ پێش زایینی لەدەستەی نەژادی هندو ئەوروپایی جیابووبنەوەو پێش ئەوەی خۆشیان ببن بەدوو بەش لەیەکتری جیاببنەوە، دەستەی نەژادی هندی و نەژادی ئێرانی سەردەمێك پێکەوە لەئاسیای ناوەڕاست دا ماوەیەکیش لەناوچەی (سیر دەریا) و (ئامەوی‌یە دەریا) ژیاون و ئاین و زمان و بیروباوەڕو ئەفسانەی ناوکۆییان هەبووەو بەخۆیان وتووە ئاری واتا شەریف.

دوای ئەمە واتا دوای لەیەکتری جیابوونەوە لایەکیان لەسەر زەمینی هندستان و ئەویتریان لە ئێران دا ژیاون و ئەم دوو ناوەیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە.

کاتێ لە نەژادی دێرینی هندیو ئێرانی بکۆڵینەوە ئەم قسانەی پێشوومان پتر لاجێگیر ئەبێ، وە ئەم جێگیر بوونەش کاتێ هێز پەیدا ئەکات کە بەوردی سەرنج بدەینە (ڤیدا)و ئاوێستا، زبانی ڤیداو ئاوێستا هەردووکیان جیاوازییەکی کەمیان لەنێواندا هەیەو ئەتوانین هەردووکیان بەدوو زاراوەی یەك زبانی سەرەکی لەقەڵەم بدەین وە ئەم زبانە پێی ئەڵێن زبانی هندو ئێرانی. گەلێك وشەی ئەم زبانە دوولایەنە زۆر لەیەکتری ئەچن وە ناوی گەلێك پاڵەوانانی ئاوێستاییو ڤیدایی لەیەکترییەوە نزیکن.

نەژادی هندی وەکو نەژادی ئێرانی خۆیان بەئاری ئەناسن. پاش ئەوەی چوونە سەر زەمینی هندستان بەخۆیان ئەوت (ئاریاوەرتە). بەڵام ئێرانییەکان پاش ئەوەی لە سەرەتاوە چوونە دەرەی سەند پێیان ئەوتن (هیندو)، هەر ئەم ناوەشە کە لەزمانی سانسکریتیدا پێی ئەوترێ (سیندهو) وە بە یۆنانی ئیندۆس. دوای ئەمە هندییەکان ناوی (هندو)یان بۆ خۆیان هەڵبژارد".

لەلایەکی ترەوە حسن پیرنیا ئەڵێت[٧] "ئارییەکان بەشێکی خەڵکی هندو ئەوروپایین، بەپێی ئەو لێکۆڵینەوەیەی دەربارەی خەڵکی هندو ئەوروپایی کراوە، بەشی ئاریانی، یەکەم بەشن لە ئاساری مێژوویی ئەدەبی ئەوان کە لە سەدەی چواردەیەمینی پێش زایینییەوە دەست پێ ئەکات، ئارییەکان پاش جیابوونەوەیان لەخەڵکی هندو ئەوروپایی ڕوویان کردۆتە باشور، ئەوانیش بوون بەچەند بەشێکەوە، بەشی هندی، ئێرانی، سکائی.

دەربارەی ئەحواڵی خەڵکی ئاریانی لەچاخەکانی پێش مێژوودا شارەزایی زۆرو ڕاستەقینە بەدەستەوە نییە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی لە زانایانەوە دەستکەوتووە ئەمەیە:

یەکەم-چ کاتێ ئارییەکان لە بەشەکانی تری خەڵکی هندۆ-ئەوروپایی جیا بوونەتەوە، وە کە جیابوونەتەوە لەکوێ بوون، ئایا بەیەکەوە ژیاون یاخود لەیەکتری جیابوونەتەوە؟

دەربارەی پرسیاری یەکەم ئەوانەی لەم باسەیان کۆڵیوەتەوە، ناتوانن مێژوویەکی ڕاستەقینەی بۆ دابنێن، بەڵام بەپێی پێوەرە زانستییەکان،

جيابوونەوەی ئاری‌یەکان لەخەڵکی هیندۆ ئەوروپایی ئەبێ بەلای کەمەوە ٣٠٠٠ ساڵی بۆ دابنرێت.

بەلام دەربارەی پرسیاری دووەمو سێیەم وەکو زانراوە ئاری‌یە هندو ئێرانی‌یەکان بەزۆری روویان کردۆتە ئاسیای ناوەڕاستو ماوەیەك لەوێ ژیاون. هەرچەندە جاران زاناکان لەسەر یەك بیروباوەڕ نەبوون بەڵام ئێستا زیاتر بڕوایان بەوە هەیە کە لەنێوان رووباری (ئامویە)و سەیحون دا ژیاون.

دەربارەی بەشی (سکائی) هەرچەندە شارەزایی ئێجگار کەمە، بەڵام ئەبێ ئەوە بزانین کە ئەمانە کەسانێ بوون بەهێزو چەك بەکارهێنەرو بیابان گەڕ.

لە ڕابوردوودا خەڵکی سکائی لە ناوەوەی ئاسیای ناوەڕاستەوە تا ڕووباری گەورەی (دانوب) بلاوبوونەتەوە، لە توێی مێژووی ئێرانا دیسانەوە ڕووبەڕووی ئەم خەڵکە ئەبینەوە. ئاری‌یە هندی‌و ئێرانی‌یەکان پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر پێکەوە ژیاون، لەئاسیای ناوەڕاستەوە بەرەو ڕۆژئاوا هاتوون‌و لەوێشەوە بەشی هندی بەرەو هندۆکوش ڕۆیشتوون‌و لە دەربەندی پەنجابی هندی‌یەوە سەرەوخوار بوونەتەوە، وەبەشی ئێرانی بەرەو باشورو ڕۆژئاوا ملیان ناوەو لەپانایی ئێرانا بلاوبوونەتەوە. لێرەوە ئاشکرا ئەبێ کەناوی ئێران ناوی ئەم خەڵکانەیە، چونکە ئەمانە خۆیان ناوناوە ئایریا کە واتای نەجیب‌و وەفادار ئەگەیەنێت، هەروەها ناوی ئێران، ئایران بووە، کە لەدواییدا بووە ئێران".

هەروەها دەربارەی ئاری سۆڤیاتی‌یەکان ئەڵێن[8] "ئاری‌و ئاری‌یەکان لەکۆڕی زانست دا بەچەند مانایەك بەکارهێنراوە. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم دا بەنیازی ئەو گەلانە بەکارهێنراوە کە بە زبانەکانی هندۆئەوروپایی ئەدوێن. وە لەلایەن ئەڵەمانە نازی‌یەکانەوە خراوەتە قاڵبێکی زانستی‌یەوە، بەلام ئێستا لەڕووی زانستی‌یەوە بەو گەل‌و قەبیلانە ئەڵێن کە بە زبانەکانی هندو ئێرانی ئەدوێن. وە ئەبنە لکی ڕۆژهەلاتی خێزانی زبانە ئەوروپایی‌یەکان.

دۆزراوەکانی گەلە هندۆ ئێرانی‌یەکان ئەوە دەست نیشان ئەکەن کە ئەو گەلانە بەخۆیان وتووە ئاری‌یەکان بەواتای ئەوەی هەموو مافێکیان هەیە. بەمە خۆیان لەگەلانی دراوسێ‌و ژێردەستەی خۆیان جیاکردۆتەوە".

لەم باسانەی سەرەوەدا بۆمان دەرنەکەوێت کە سەرانسەری کوردستان هەروەها خاکی فارس و ئازربایجانی ڕاستەقینەو بلوجستان و ئەفغانستان و پاکستان و هندستان. هەموویان شەپۆلی کۆچکەرانی ئاریایی ڕەگەز لە ژووروی خۆیانە ڕووی تێکردوون و ئەم کۆچکەرانە بەدوو شەپۆل یەکەمیان لە ٣٠٠٠ ساڵی پێش زایینییەوە تا ئەگاتە شەپۆلی دووەم لە نزیکەی ٨٠٠ ساڵ پێش زایینییەوە کە ئەم شەپۆلەیان بەگشتی ماددەکان بوون، ڕوویان کردۆتە ئەم وڵاتانەو نەك هەر تێکەڵ بە دانیشتووەکانی بوون بەڵکو زمان و خووڕەوشت و جۆری ژیان و ئاینی خۆیان بەسەرا سەپاندون و بەم جۆرە لەگەڵیانا ئامێتە بوون و ئەو خەڵکەیان لەخۆیانا تواندۆتەوە.

دەربارەی ئەوەی پەیوەندی بەلێکۆڵینەوەکەی ئێمەوە هەیە وا هەندێ بیروڕای زاناو پسپۆڕو سەرچاوەی مێژوویی ئەخەینە پێشچاو کە بین بەچرایەکی ڕۆشن دەربارەی ناوەڕۆکی باسەکە کەچۆنێتی پەیدابوونی پاڵاوتە بووی نەتەوەی کوردە لە سەرانسەری کوردستانا، ئەو نەتەوەیەی کەچاو برسییان و تەماعکارانی بیانی هەوڵ و تەقەللایەکی زۆریان داوە، نەتەوەی کورد بە لکێکی شاخاوی نەتەوەکانی خۆیانی لەقەڵەم بدەن یاخود هەر بەکۆمەڵە خەڵکێکی بێ سەرو شوێن و ڕەچەڵەك، تا ئەو ڕادەیەی هەندێکیان کوردیان کردووە بەنەوەی دێوو درنج!!.

خاتو دوکتۆر دولت احمد صادق ئەڵێت [٩] "کوردەکان لەسەرچاوەیەکی کۆنی باکورەوە کەوتونەتەوە، بە زبانی هندۆ ئەوروپایی ئاخافتون. لە دەرەکانی باکوری ئێرانەوە، لە ناوەڕاستی دوو هەزار ساڵەی پێش زایینییەوە لەناوەڕاستی ئاسیاوە هاتونەتە خوارەوە، ئەمانەش میدی و کاسییەکانن.

دەوڵەتێکی کۆنیان هەبووە پایتەختەکەی ئانپخا *AnapKha* بووە. کە کەرکوکی ئێستایە، زمانێکی تایبەتی و خوو ڕەوشت و قەومایەتی خۆیان هەیە کە جیایان ئەکاتەوە لە دراوسێکانیان....

نیشتمانی کورد لەم کاتەدا لە ناوچە شاخاوییەکانی تورکیا و عێراق و ئێران و دامێنی شاخی طۆرۆس و ڕۆژهەلاتی تورکیا و شاخی زاگرۆسی باکوری ڕۆژئاوای ئێرانەوە دەست پێ ئەکات.

ئەم نیشتمانە وەکو کەوان وایە لە ژووروی ڕوباری دیجلەوە دەست پێ ئەکات و بە باکوری ڕۆژئاوای موصڵ و باکوری کەرکوک و لە نێوان دیاربەکر لە باکورەوە، تا کرماشان لەباشورەوە درێژە ئەکێشێ.

ژمارەیان لەساڵی ١٩٢٨دا نزیکەی سێ ملیۆن ئەبوو، نیوەیان لەتورکیا و چارەکێکیان لەئێران و شەش یەکێکیان لەعێراق و ئەوی تریان لەسوریادا ئەژین.

کوێرەوەری کورد لەوەدایە کە ئێران و تورک کوردستانیان لەنێوان خۆیانا بەش کردووە. وە لەسەدەی ١٦یەمەوە لەنیشتمانێکی پارچە پارچەدا ژیاون، هەندێ جار لەلایەن تورکەوە و هەندێ جار لەلایەن ئێرانییەوە، وەجاری واش بووە لەلایەن هەردوو لاوە چەوسێنراونەتەوە.

لەکۆتایی سەدەی هەژدەیەمین دا تورکەکان هەوڵی لەناوبردنی تەواوەتی کوردیان داو ئەوانیش شۆڕشێکی گەورەیان هەڵگیرسان، وە هەوڵیان دا نەتەوەیەك لەساڵی ١٨٨٠دا بۆخۆیان پێکەوە بنێن، کەهەموو عەشیرەتەکانیان کۆبکاتەوە، جارێکی تریش لەسەرەتای سەدەی بیست دا دەستیان دایە شۆڕشکردن. لەکاتی نزیکەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا (٧٠٠) هەزار کوردیان لە ناوچەی دیاربەکرەوە بۆ ڕۆژئاوای ئەناضۆڵ گواستەوە.

نیشتمانی ئەمانە بوو بەمەڵبەندی خەبات و دووچاری هێرشی ڕوسی-ش بوون کە بەمە زۆریان لەناوچوون مەسەلەی کوردستان لەساڵی ١٩٢٠دا کەوتە ناو کۆڕی دەوڵەتانەوە، پەیمانی (سیڤەر) داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردستانی سەربەخۆی بۆکردن. بەڵام سەرکەوتنی بزوتنەوەی کەمالییەکان لەتورکیا و بەستنی پەیمانی لۆزان لەساڵی ١٩٢٣دا ئەم بیروڕایەی لەناوبرد.

نیشتمانی کورد نەك هەر لەنێوان دوو دەوڵەت پارچە پارچە کرا بەڵکو کرا بەچوار پارچەی سیاسییەوە. ڕۆژێ لەڕۆژان کۆمارێکی کورد لەکوردە ڕاکردووەکان بۆ یەکێتی سۆڤیاتی دامەزرا، بەڵام لەدواییدا تێکەڵ بە ئەرمینیا بوون، بەسەرخۆییەکی خۆیایەتی ڕۆشنبیرییەوە.

دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان ترسی ئەوەیان لێ نیشتبو کە یەکێتی سۆڤیاتی کۆمارێکی کوردستانی سۆڤیاتی لەخاکی ئەوچوار دەوڵەتەی کورد لەناویانا ئەژین (تورکیا و ئێران و عێراق و سوریا) دابمەزرێنێت و ببێت بەپەڵە نەوتێك لەسەر سنوری

ئەم دەوڵەتانەو بڵاوبببێتەوە. بەڵام ئەم دەوڵەتە سەرەڕای ئەمە ناتوانێت بگاتە دەریای سپی ناوەڕاست، هەرچەندە هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆش لەنەوتی عێراق بکات کە ئەکەوێتە کەرکوکەوە، کە ئەمیش خاکی کوردە".

هەرچەندە گەوهەری باسەکەمان پێکهاتنی نەتەوەی کوردە کە لامان وایە بەپێی پێوەری عیلمی لە سەدەی هەژدەیەمینی زایینیەوە وردە وردە بناغەی دارشتووەو تا لە سەدەی بیستی زایینیدا لەقەوارەیەکی تەواودا هەموو مەرجەکانی پێکەوەنانی نەتەوەیی بەهەر شێوەیەك بێت پێکهێناوە.

بەڵام هەر ئەبێ کورتەیەك دەربارەی ئەو هۆزو عەشیرەتو گەلانە بخەینە بەرچاو، تانەخشەیەکی گشتی دانیشتووە کۆنەکانو نیشتەجێو کۆچەرە هاتووەکانی ئەودیو کوردستانەوە بۆ کوردستان جێگای خۆی بکاتەوە.

وەکو لەپێشەوە باسمان کرد ئەمانە هەموو ئەبێ بەسێ بەشی سەرەکییەوە، بەشی یەکەم ئەوانەن کە لە ئادەم زادی نیاندەرتاڵەوە دەست پێ ئەکات تائەگاتە ئادەم زادی ژیر (الانسان العاقل) کە بەکورتی لێی دوواوین.

بەشی دووەم کۆچی یەکەمی ئارییەکانە کە لە ۳۰۰۰ ساڵەی پێش میلادەوە بەرەبەرە ڕوویان کردۆتە خاکی ئێرانو ئەفغانو هندستانو پاکستانو کوردستان وە هەندێکیشیان بەمەبەستی داگیرکردنو چەپاوەڵ نیشتەجێ بوونو ڕوویان کردۆتە ناوەڕاستو باشوری عێراقو سوریاو فەلەستینو ناوەڕاستی تورکیای ئێستا.

دوای ئەم شەپۆلە گرنگە کە ڕووی ناوچەکەی گۆڕیوەو خۆی سەپاندووە بەسەر کۆمەڵە خەڵکی ئەم ناوچانە، شەپۆلێکی تر ڕووی کردۆتە کوردستان کەنزیکەی ۸۰۰ ساڵ پێش زایینی ئەبێت. ئەم شەپۆلە لە مێژوودا بەشەپۆلی هاتنی ماددەکان بەناوبانگە کە زۆربەی مێژوو ناسان ئەمان بە باپیرە گەورەی کورد لە قەڵەم ئەدەن.

دەربارەی شەپۆلی یەکەم زاناو پسپۆڕو مێژوو ناسە فارسەکان لەهەموو لایەك پتر دەربارەی وڵاتی خۆیان لێی دوواون، پێش ئەمانیش بوێژو ئەدیبو هەستیارو فۆلکلۆر زانو داستانی کۆن نووسان لەشێوەی ئەفسانەدا زۆر بەدوور درێژی چیرۆك ڕۆمانو هەڵبەستی داستان ئامێزی ئەفسانە پۆشیان لەسەر ڕێکخستووەو لە دواییدا کەوتۆتە سەر لاپەڕەی مێژووی ئەم بابەتەوە.

بۆنموونە ئەوەتا دوکتۆر زەبیح الله صفا لەژێر سەرناوی کۆچکردن و جەنگ لە بومیان دا ئەڵێت[١٠] "وەکو لە ئاوێستادا هاتووەو بەڵگەی جۆراو جۆریش نیشانەی ئەکات، ئێرانی یەکان وردە وردە بەپێی بیروڕای لێکۆڵەوەرەکان لە سنوری ١٤٠٠ ساڵەی پێش زایینی بەدواوە کۆچیان کردۆتە (ئێران ویچ)، بەتایبەتی ڕوویان کردۆتە (سغد، مرو، بلخ، هرات، کابل، هەلمەند) وەلەوێوە ڕوویان کردۆتە خوارووی خۆراسان و ڕەی، ئیتر وردە وردە لەملاو لەولا بڵاو بوونەتەوە.

لەو ڕۆژانەدا لەزۆر شوێنی تەختایی ئێران دا تایەفەی وەکو عیلامی و تەپوران و کادوسی و ئاماردان و یاماردان و قەبیلەی پێست ڕەشی ئێسك قورس ژیاون.

بۆیە کۆچکەرانی ئاریایی لەپێناوی داگیرکردنی ئەم سەرزەمینە نوێیە شەڕی سەختیان لەگەڵدا کردوون وە لەتەك ئەم تایەفەیەدا کەبەگشتی کەسانی شەڕەنگێزو بەهێزو باڵابەرزو دەسەڵاتدارو شارستانی یا نیمچە وەحشی خاوەن ئاینێکی جیاواز لەئاینی ئاریایی، بەیەکا هاتوون.

بەشێ لە داستانە پڕ جۆشەکانمان پەیوەندییان بەوجەنگە سەختانەوە هەیە کە لەناوخاکی ئێران دا ڕوویداوە، وەهەر ئەم داستانانەیە کە لە کتێبە پڕجۆشەکانمان دا باسی ئێرانی و دێوان ئەکات".

ئەگەر خوێنەر سەرنجێکی ئەم بەشە نووسینەی دوکتۆر زەبیح الله صفا بدات گورج بۆی ڕوون ئەبێتەوە کە دوکتۆر صفا نەك هەر خۆی لەئێرانی یە کۆنەکانی وڵاتەکەی خۆی ئەکێشێتەوەو شانازی بە قەبیلەو کۆچکەرە ئاری یەکانەوە ئەکات بەڵکو ئێرانی یە کۆنەکان بەکەسان و کۆمەڵانی دڕندەو ئێسك قورس لەقەڵەم ئەدات.

ئەمین زەکی بەگ دەربارەی ئەم باسە ئەڵێت[١١] " لە بەرەبەیانی مێژوودا گەلانی شاخی زاگرۆس کە گەلانی( لولو)و ( گۆتی- جوتی)و ( کاسی)و (خاڵدی- کاڵدی)و ( سوبارو- هوری) لە کوردستانا ژیاون، وە سەبارەت بەوەی هەندێ پەیوەندی و لەیەکچوونی زمان لەنێواندا هەیە، ڕۆژهەڵات ناسەکان لایان وایە کە ئەم گەلانە لەزنجیرە قەوقاسی یەکانن، ئەم گەلانە هەموو ڕەسەنی زۆر کۆنی گەلی کوردن وە لە دەوروبەری سۆمەری و ئەکەدی و سەرەتای ئاشوری دا چالاکی گەورەیان نواندووە....

هەرکەسێك بیەوێت لە ڕەسەنی کوردو سەرچاوەکەی بکۆڵێتەوە، پێویستە وەکو هەندێ زانایانی کۆنینەو مێژوو ئەڵێن کەپەیوەندی یەکی توند لەنێوان ڕەسەنی

نەتەوەی کوردو یەکەمین سەرچاوەیو نێوان چینی یەکەم دا هەیە، نیازم لەکۆمەڵە گەلەکانی زاگرۆسی یەکەمینە، ئەبێ دیراسەتی گەلانی چینی یەکەمو دووەم بکات ئەمین زەگی بەگ لەسەر باسەکەی ئەڕوات و ئەڵێت(لولو) یاخود( لولوبوم) لە ناوچەی (زەها وشارەزورو سلەیمانی) دیتراون هەرچەندە نازانرێت کەی هاتوون، بەڵام تێکەڵ بەگەلی گۆتی بوونو پێکەوە لەناوچەی ئێستای سلەیمانی ژیاونو لەدواییدا دەستیان بەسەر ولاتی (هەڵمان- حلوان)-یش دا گرتووە.

ئەو کۆنینانەی لەجێگاکانی کەرکوك دۆزراونەتەوە، وەهەندێ بەڵگەی تر کە زانیاری دڵخۆشکەرەی دەربارەی ئەم گەلە تێدایە، هەروەها لەیەکچوون و نیشانە زبانەوانی‌یەکان ئەوە ئەگەیەنن کە هەندێ لەپاشاو فەرمانڕەواکانی ئاشوری‌یەکان لەسەدەکانی نۆزدەیەمینو هەژدەیەمینی پێش زایینی‌دا کەسانی گەلی لولویی بووبن.

دوای ئەمە دێتە سەر گۆتی‌یەکانو ئەڵێت (گۆتی، جۆتی، جودی) بەگەلانی زاگرۆسی بەناوبانگ بوونو لەساڵی ٢٦٤٩-ی پێش زایینی‌دا دەستیان گرتووە بەسەر ولاتی سۆمەرو ئەکەد داو ١٢٥ ساڵو ٤٠رۆژ فەرمان ڕەواییان تێدا کردووە.

لە لیستەی پاشاکانا کە لە نیپور دۆزراوەتەوە ناوی ٢١ پاشا لەپاشای گۆتی‌یەکانی تێدایە.

بەکورتی لە ریوایەتو کۆنینەکانی پاشاکانی ئاشوریدا ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێت کە مەڵبەندی شاخی زاگرۆس نیشتمانی قەومی (گۆتی، کۆتی، جۆتی) بووە.

ئێستا ئەڵێن کەپەیوەندی لەنێوان دەربڕینی (کۆتی) و (کورتی) کە لەو دوو تابلۆ (لوحە) کۆنینەیەی لەم دواییەدا دۆزراوەتەوەو هی دەورروبەری (توکولتی- اینورتا)ی پاشای ئاشوری، نیشانەی یەك ڕووداوە. لەیەکێکیان نووسراوە (گۆتی، جوتی)و لەویتریان (کورتی) کە ئەبێ بەنیشانەی ئەوەی هەردووکیان ناوی یەك گەل بوون.

زۆربەی ڕۆژهەلات ناسەکان کە وشەی (کورتیوی)-یان بەباشی لێکداوەتەوە، بۆیان دەرکەوتووە کە لەنێوان ئەم وشەیەو وشەی (کورتی)دا لەیەکچوونی دەربڕین هەیە.

دانەری کتێبی (الرابطە اللغويە للفظ الكرد) ئەڵێت وشەی (كورتيوی) وشەيەكی گرنگە بۆ ئەوانەی بەدوای ڕەسەنی دانيشتوانی كوردستانا ئەگەڕێن.

ڕۆژهەڵات ناس (دريڤر) ئەڵێت وشەكانی (كاردا، كاردۆخی، كورتۆخی، غوردی، كارداك، سيرتی، كيركی، غورديای، غوردئين، كاردو، كاردا، كارداويە، كاردايە، كارتاوايە، اوكردابيا... هەتاد هەموويان يەك سەرچاوەن.

بۆيە ئەم ڕۆژهەڵات ناسە ڕەسەنی گەلی كوردی ئێستا ئەبەستێ بەگەلی (كاردۆخوی) كە زەينەفون ناوی هێناون تائەگاتە گەلی كاردائی كە هاوچەرخی سۆمەرييەكان بوون. وەبەپێی يەكێ لە ريوايەتەكانی دەوروبەری سێيەمی حكومەتی (ئوركاردا) ناوی يەكێ لەعەشيرەتەكان بووە. دوای ئەمە دێتە سەر (كاسای، كوسی، كوشو)و ئەڵێت يەكێكن لە قەومەكانی زاگرۆس لەسەرەتاوە لە (كرماسان، كرمانشاه، قرمسين) نيشتەجێ بوون، پاش ماوەيەك ڕوويان كردۆتە ڕۆژهەڵاتی بابل، نيازم لەبەری چەپی ڕووباری ديجلەيەو بەكشتوكاڵەوە خەريك بوون ئەكادييەكان پێيان وتوون (كاشو) كە لەكتێبی پيرۆزدا بە(كوش) ناويان بردوون.

لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەيەمينی پێش زايينيدا حكومەتێكی بەهێزيان لە وڵاتی سۆمەرو ئەكەد دامەزراندووەو پێيان وتووە (كاردونياش)، ئەم حكومەتە نزيكەی شەش سەدە لەم وڵاتە ژياوە كە هيچ حكومەتێكی‌تر تەمەنی وا درێژی بەخۆيەوە نەديوە.

ئەم عەشيرەتە كاسييانە دوای لەناوچوونی ئەو حكومەتەی خۆيان گەڕاونەتەوە شاخی زاگرۆس (لوڕستانی ئێستا) بەدوای ئەمەدا دێتە سەر (خالدی- ئورارتو)و ئەڵێت (درەنگە ئەم گەلە كە نازانرێت كەی لەڕۆژهەڵاتی ئاسيای بچووكەوە هاتۆتە ناوچەی دەرياچەی (وان)، سنووری حكومەتی (خلدی) ڕۆژێ لەڕۆژان لە باكوورەوە تا دەرياچەی (كۆكچە) و (الكسندر پول) لە قەوقازەوەو ڕۆژئاواوە تاڕووباری فورات و لە باشوورەوە تا ڕەواندزو سەرچاوەكانی ڕووباری زێ، لە ڕۆژهەڵاتەوە تا دەرياچەی ورمێ درێژەی كێشابێ. سەردەمێكيش باكوری سوريای بەدەستەوە بووەو پايتەختەكەی شاری (توسپاسی- وان) بووە كە لەوانەيە (ساردۆريسی)ی يەكەم پاشای (خلدی)يەكان ساڵی ٨٤٠ی پێش زايينی بنياتی نابێت).

بەدوا ئەمانەدا باسی سوباری ئەکات و ئەڵێت: (یەکەمجار لەدەوروبەری حکومەتی لوغال- انی- موندو) کە لەسەدەی ٣٠ پێش زاییندا دامەزراوە لەسەر پارچە کۆنینەیەك ناوی ئەم گەلە دۆزراوەتەوە.

هەروەها حامورابی بەم ناوەوە ناوی قەومێکی تەواو سەربەخۆ، خۆبەخۆ ژیاوی هانیوە. ئاشورییەکانیش پێیان وتوون سوبارو. ئەم گەلە دەمێ جار لەتەك لەشکری ئاشوردا بەجەنگ هاتووەو لەکۆتایی دەوروبەری ئاشورییەکانا ناوی ئەم سوباری‌یانە ون بووەو لەبریتی ئەوان ناوی گەلێکی‌تر کەوتۆتە ناو ناوانەوەو بە(نایری) ناسراون، دووریش نییە ئەمانە بەشێك بووبن لە گەلی سوباری‌و بەناوی بەشەکانی تریشێوە هەڵسوڕابن. تائێستا پاشماوەی گەلی نایری‌و لێکەوتووەکانی لەناوچەی (نهری) شەمدینانی ئێستا لەبەرچاودان.سێرکینگ‌و ڕۆژهەلات ناسانی تر ئەڵێن (میتانی)یەکان بەشێك بوون لە کاسی‌یەکان، بەلام مامۆستا سپایزەر ئەڵێت (میتانی) لکێکی گەلی سورباری‌ن.

میتانی‌یەکان لەدەوری ناوەڕاستی ڕوباری فورات‌و ناوچەی ڕوباری خابورو بلیخ لەنێوان دوو ڕووباردا حکومەتێکی بەهێزیان لە ناوەڕاستی دووەمین هەزارەی پێش زایینی‌دا دامەزراندووەو زبانێکی تایبەتی سەربەخۆیان هەبووە".

ئەمەی لەسەرەوە دەربارەی لۆلۆو گۆتی‌و کاسی‌و خاڵدی‌و سوباری مشتی خەروارێکە. لە دەیان سەرچاوەی مێژوویی‌یەوە ڕۆژهەلاتناسان‌و مێژوو ناسان‌و زانایانی کۆنینەو دێرینەی کوردستان‌و ناوچە ئاریانشینەکان باسی دانیشتوانی کۆن‌و زبان‌و خوو ڕەوشت‌و جەنگ‌و پێکاهاتن‌و داگیر کردن‌و کۆچکردن‌و کۆچ پێکردنی هۆزو عەشیرەت‌و کۆمەلانی خەڵکی دامەزرێنەری نەتەوەی کوردیان کردووە. بۆیە بەپێویستی ئەزانین درێژە بەباسی ئەمانەو شەپۆلی دووەمی کۆچکەرانی ئاریایی بۆ ناوچەی کوردستان بکەین کە سەرەکی‌یەکەیان مادد-ن.

مامۆستا طە باقر ئەڵێت [١٢] "لەوانەیە سەرچاوەی حۆری‌یەکان لەو ناوچە شاخاویانە بوبێت کە لەشێوەی نیوە بازنەیەك دایە لەچیای طۆرۆسەوە لەنزیك کرکمیش (طرابلس-ی ئێستا) و تانزیك دەریاچەی وان درێژ ئەبێتەوەو لەوانەشە سەرەوخوار بووبنەوە تاکو ڕوباری زێی گەورە کە لولوییەکان دراوسێی ڕۆژهەلاتیان بون (ناوچەی شارەزور).

ئەمانە ناویان لەناوەڕاستی هەزارەی سێیەمی پێش زایینییەوە کەوتە مێژووەو دەوڵەتۆکەیەکیان لە ژووروی ڕوباری دیجلەو فوراتا هەبووە. بەڵام لەسەدەی پانزەیەمینی پێش زایینییەوە پایەیەکی سیاسی گرنگیان دامەزران.
وە لەچارەکەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پێش زایینیدا لەچەند لایەکی (الهلال الخصیب)دا بڵاوبوونەوە.

لەدەوروبەری ۱۸۰۰ساڵی پێش زایینی لە باکوری سوریادا بەشی زۆری دانیشتوانی شارە کۆنەکەی پێیان ئەوت (ئالالاخ) (تل العطشانەی نێوان حلب و انطاکیە) لەمان بوون.

وە نزیکەی سەدەیەك پاش ئەوە حوّرییەکان لە باکوری عێراق دا ئەبینران و مەڵبەندەکەیان شارە کۆنەکەی نوّزی بوو (یورغان تەپەی نزیك کەرکوك). ناوی ئەم شارە کۆنە (گاسەر *Gasur*) یان گۆڕی بەنۆزی یاخود بە نۆزو بەناوبانگ بوو.

کۆنینەی ئەمانە لە شوێنانی تر وەکو (تپەکورا) و(تل بلا) لە نزیك موصڵ-ەوە دۆزراوەتەوە. وە لەسەدەی شانزەیەمینی پێش زایینیدا جۆرە فەخفورییەك پەیدابوو جوان دیمەن و وردەکاری تێدا کراو، ناویان لێنا فەخفوری. وە لە دەوروبەری سەدەی پانزەیەمینی پێش زایینی لە باکوری (مابین النهرین)دا مەملەکەتێك دامەزرا بەشی زۆری دانیشتوانی حوّری بوون، مەڵبەندەکەشیان لە دۆڵی خابورو بالیخ بوو. ئاشورییەکان پێیان ئەوتن (خانیگەڵبات- *Khanigalbat*). هەروەها ناوی (نهارین) یا (نهارینا)یان بەسەردا دابڕین، وە لە نووسراوە هاوچەرخەکان دا بە مەملەکەتی (میتانی) ناسراون".

لەم بەشە نووسینەی مامۆستا دوکتۆر طه باقردا هەندێك پەلە تیاکردنی لەچاو ڕۆژهەڵات ناس و ئاریایی ناسان دا دێتە بەرچاو، کە حوّری و میتانی و ئاریایی کە بێگومان ئاریایی بوون تێکەڵ بەیەکتری کراون.

ئەم لایەنە لە لاپەڕەکانی داهاتوودا باشتر ڕوون ئەکرێنەوە لەگەڵ ئەمەشدا لە ناوەڕۆکدا بەلێدوانێکی بەنرخ و مێژوویی بناخەدار لەقەڵەم ئەدرێت.

هەر لەم بارەیەوە دوکتۆر احمد موسە ئەڵێت[١٣] "ئەو ڕووداوانەی ڕۆڵێکی گەورەیان لەسەر شانۆی سیاسی ڕۆژهەڵاتی نزیك دا پێش دەرکەوتنی قەومی موسی گێڕا، کۆچی کۆمەڵانی قەومە هندو ئەوروپاییەکان بوو لەناوچە شاخاوییەکانی

باكورو ڕۆژهەلاتەوە بۆ ڕۆژهەلاتی نزیك وەكو (حۆری و حیتی یەكان). حۆری یەكان قەومێكی شاخ نشین بوون، نیشتمانی ڕەسەنی خۆیان ئورارتو (ئەرمینیای ئێستا) یاخود ئەو هەرێمانەی ئەكەونە باكورو ڕۆژهەلاتی دەریاچەی (وان)-ەوە بوو.

جولانەوەی حۆری یەكان، لە نیشتمانەكەیانەوە كە ئەكەوێتە نێوان دەریاچەی وان و شاخی زاگرۆسەوە، بەرەو ولاتی ئاشور ئەكەوێتە دەوروبەری سەدەی هەژدەیەمینی پێش زایینی یەوە. كۆچی ئەمانە لەتەك كۆچی كاشی یەكان بۆ عێراق و كۆچی هیكسوس بۆ میسر هاوچەرخن.

حۆری یەكان توانیان ولاتی ئاشور تێك وپێك بدەن و فەرمانڕەوایی شەمس ئەدادی یەكەم و شەمس ئەدادی دووەم لەناوبەرن و چەند میرنشینێك لە ئاسیای بچوك دا دابمەزرێنن وە میرە حۆری یەكان ولاخ و عەرەبانە بەولاخ ڕاكێشانیان خستە ئەو ناوچانەی دەستیان بەسەرا گرتن".

حۆری یەكان لە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زایینی دا مەلبەندێكی گرنگیان لە باكوری سوریە بەتایبەتی لەهەرێمی بلیخ و خابور (خابوری فورات) دامەزران و شارۆكەی (واشوكان)ی یان كرد بەپایتەختی خۆیان، بەلام مەلبەندی سەرەكی یان لەتەنیشت كەركوكەوە بوو، پێ ی ئەوترێ (نوزی) كە كەلاوەكانی ئەمڕۆ لە (یورغان تەپە)یە نزیكەی ٨ میل لە باكوری ڕۆژهەلاتی كەركوكەوە دوورە.

ئەوەندەی پێ نەچوو توانیان مەملەكەتێكی بەهێز دروست بكەن، بەناوی میتانی یەوە ناسراوە، كە ناوچەی بلیخ و خابورو نصیبین و هەرێمی ئەرانجا (كركوك) لە ڕۆژهەلاتی دیجلە ئەگرێتەوە".

دەربارەی زمانی حۆری یەكان ئەلێت" زبانی حۆری یەكان هەر تەنیا پەیوەندی بەزمانی كۆنی ئورارتۆوە نی یە، بەلكو پەیوەندی بە زبانە جۆرجی یەكان و ئەو زمانانەشەوە هەیە كە بە زبانی قەوقازی ئەناسرێن".

حسن پیرنیا دەربارەی كاسی یەكان ئەلێت [14] "ئەمانە كەسانێ بوون كە لەچیاكانی زاگرۆس دا نزیك كرماشانی ئەمڕۆ ژیاون و هەندێ لایان وایە كە ئەمانە ئاریایی بن چونكە خوداوەندی بزورگی ئەمانە كە ناوی سوریاش بووە، خوداوەندی هەتاو بووەو ئەم وشەیەش ئاریایی یە، ئەم قەومە بابلیان لەنێوان

ساڵەکانی ١٧٦٠- ١١٨٥ی پێش زایینی‌یەوە خستۆتە ژێر دەستی خۆیانەوە. لە دەوروبەری کاسی‌یەکانا عەرەبانە بەئەسپ ڕاکێشراوە".

ئەوی ڕاست بێ ئەو کتێبە مێژووییانەی دەربارەی کۆمەڵو عەشیرەتو خەڵکی پێش چەند هەزار ساڵ لەمەوبەر ئەدوێن، بەشی هەرە زۆری نووسینەکانیان لەسەر شەڕو داگیرکردنو چەپاوەڵو تاڵانو بڕیو کوشتو کوشتارە، تەنانەت هەندێکی سەدەکانی ناوەڕاستی زایینیو پێش جەنگی جیهانی یەکەمیش هەر ئەم چوار چێوەیەی بەخۆیەوە گرتووە، کە ئەمە جگە لەوەی خوێنەر لەخوێندنەوەی بێزار ئەکاتو دیمەنێکی دڕندانەش دەربارەی ئەو کۆمەڵگایانە ئەخاتە پێشچاو.

بۆیە چەندم پێکرابێتو ئەوەندەی باسەکە پێی نەشێوێت خۆم لە دووبارە کردنەوەیان لاداوە. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە هەندێ مێژوو نوسان بەچاوێکی تەنگو تاریکەوە تەماشای ئەو کۆمەڵو خەڵکانەیان کردووە کە ڕەسەنی ئێستای خۆیان ناچێتەوە سەریان، یان ڕۆژێ لەڕۆژان ئەو کۆمەڵو خەڵکانە فەرمانڕەواییان لەخاکی ئێستای نەتەوەکەیانا کردووە، وەکو ئەم چەند دێڕەی ئەیخەینە پێشچاو.

دوکتۆر فاضل عبدالواحد علی دەربارەی ئەکەدی‌یەکان ئەڵێت[15] "... بەڵام پایە بەرزیی گەشاوەی ئیمپراتۆری‌یەتی ئەکەدی‌یەکان لەپاش کۆچی دوایی نرام-سین ئەوەندە درێژەی نەکێشا چونکە کوڕە جێنشینەکەی پاشا شار کلیشار (٢٢٥٤-٢٣٠پ.ن) چەند هۆیەك لاوازی کردو لە ئەنجاما کەوت.

یەکێ لەو هۆیانەی ڕێگای لاواز کردنی ئیمپراتۆرییەتی ئەکەدی خۆش کردو وزەی پوچەڵ کردەوە، ئەو جەنگانە بوون کە لەتەك عەشیرەتە شاخ نشینەکانا بوون بە تووشی‌یەوە، بەتایبەتی لە تەك عەشیرەتە شاخ نشینە (لولوبو)-وەکان دا. هەروەها خۆ خەریك کردن بەکوژاندنەوەی شۆڕشو بزوتنەوەی ناحەزانە لە ناوەوەو ئەو هەرێمانەی سەربەخۆیان بوو".

لەسەر باسەکەی ئەرواتو ئەڵێت "گۆتی‌یەکان کە لە عەشیرەتە جانەوەرەکانی دانیشتوی ناوەڕاستی زاگرۆسن لەناوچەی هەمەدان، کۆتاییان بەفەرمانڕەوایی ئەکەدی هانی.

ئەمانە ماوەی سەدەیەك (٢٢١١- ٢١٢٠پ. ن) فەرمانڕەواییان کردووە، وە لە ڕووی مێژووییەوە ئەم ماوەیە، بەماوەیەکی تاریکی مێژووی (الوادی الرافدین)

لەقەڵەم ئەدرێت... چونکە نووسینە مێژووییەکانی بەدەگمەن تیا دەست ئەکەوێتو کاروباری سیاسی-ش تێدا ڕووناك نەبووەو جگە لەوەی ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی شارستانێتی لەهەموو ڕوویەکەوە تێیدا وەستاوە".

ئنجا هەر خۆی قسەکانی خۆی لەبیر ئەچێتەوەو ئەڵێت "لە درێژەی ڕووداوە مێژووییەکانا وا دەرئەکەوێت کە گوتی‌یەکان بەتایبەتی، دەسەڵاتیان بەسەر شارە ئەکەدی‌یەکانا ڕۆیشتووە، بۆیە شارە سۆمەری‌یەکان تا ڕادەیەك خاوەنی ئازادی سیاسی‌و بازرگانی بوون".

ئەگەر مێژووی لولوییەکان بخوێنینەوە ئەبینین کە ئەکەدی‌یەکان لەکاتی دەسەڵاتداری‌یانا هێرشیان بردۆتە سەر مەڵبەندی ئەم خەڵکە لە شارەزووری ئێستادا، وە لە هیچ جۆرە جانەوەری‌و چەپاوەڵ‌و کوشتو کوشتارێك درێغی‌یان نەکردووە. کەچی لەلایەن ئەکەدی خوازانەوە بە جوامێری‌و قارەمانێتی‌و دەسەڵاتداری بۆیان لەقەڵەم دراوە.

هەر بەبۆنەی ئەوەوەی دوکتۆر فاضل عبدالواحد علي لێرەدا باسی (الوادي الرافدين) ئەکات بەپێویستمان زانی بیروڕای دوکتۆر طه باقر دەربارەی زاراوەی (الوادي الرافدين) بخەینە ڕوو.

دەربارەی زاراوەی نێوان دوو ڕوبار (مابين النهرين) یاخود میزۆپۆتامیا *Mesopotamia* کەتا ئەم دواییەش پێ‌یان ئەوت (الجزيره)، مامۆستا طه باقر ئەڵێت[١٥] " لەکاتی نێوان سەدەی چوارو دووی پێش زایینی، نووسەرە یۆنان‌و ڕۆمانەکان زاراوەی جوگرافی وڵاتی نێوان دوو ڕووبار (بلاد مابين النهرين)یان هانی‌یە ناوناوانەوە یاخود ئەو ناوە میزۆپۆتامیا *Mesopotamia* کەلای ئەوروپاییەکانیش دوای ئەوان بڵاوبوەوە.

ڕەنگە کۆنترین‌و ڕۆشنترین بەکارهێنان ئەو بەکارهێنانە بێت کە لە کتێبی مێژوونووسی بەناوبانگ پولیبیوس *Polybius* (٢٠٢- ١٢٠پ.ز) بەکارهاتووە.

سەرەڕای ئەوە ڕێی تێئەچێ ئەم زارارەیە لە دەوروبەری ئەسکەندەری گەورەش دا بەکارهاتبێ، وە پۆلیبیوس بەدوای جوگرافی زانی بەناوبانگ سترابو یاخود سترابون (٦٤پ.ز- ١٩ز) بەکاری هانیبێ.

ئەم زاراوەیە بەو بەشەی عێراق وتراوە لەنێوان دیجلەو فوراتەوە لەباکور تا سنوری بەغدا کەئەمە واتای زاراوەی (الجزیرە)ی گەیاندووە"...

مامۆستا باقر لەسەر باسەکەی ئەڕوات و ئەڵێت "بێینەوە سەر وشەی (العراق) لەپاش بەکارهێنانی لەکۆتایی دەوروبەری ساسانی یەکانا یاخود لەچاخی جاهلی دا ئەڵێین ئەمیش گۆڕران واتا فراوان کردنی لەلایەن جوگرافی ناسەکانی عەرەب دا بەسەر هاتووە...

دیسانەوە عەرەب بە وڵاتی باکور یاخود ژوورووی نێوان دوو ڕوبار (مابین النهرین)یان وتووە (الجزیرە).وە بەشی ناوەڕاست و باشوریا کە ئێستا پێی ئەڵێین عێراق، ناوی عێراق-یان لێناوە، وە هەندێ جار بۆ ئەوەی لەعێراقی عەجەمی (بەشی باشوری ئێران) جیابکەنەوە بەعێراقی عەرەبی ناویان هێناوە.

وە زاراوەی (السواد) لە بریتی ناوی عێراق بەکارهاتووە، کەپێشیان وتووە وڵاتی بابل و خاکی بابل".

واتا بەپێی وتەی مامۆستا طه باقر کەخۆشی هەروایە ناوی عێراق هەر بەشی عێراقی عەرەبی ئێستای گرتۆتەوەو بە وڵاتی کوردستانی خوارو لەلایەن هەندێ ئەوروپایی و یۆنانی و عەرەبەوە وتراوە وڵاتی نێوان دوو ڕوبار یاخود وڵاتی جزیرە.

وا لێرەدا بەشێوەیەکی دۆستانە لیوا وینهایم ئەڵێت[16]"پاشایەکی زنجیرەی کاشی یەکان پەرستگایەکی بینا کرد (کە کاربانداش پاشا بوو) لە سەدەی چواردەیەمینی پێش زایینی دا، شوشەکاری ڕەنگاو ڕەنگی خستەبان هونەرەکانی پێشوو کە ئەم شێوە هونەرە جارێکی تر لە دەرگاکانی عوشتاری بەناوبانگ دا کە لەلایەن نبوخذ نصر-ەوە دامەزرا بوو بەکارهێنرایەوە، هەروەها لەسەر دیوارەکانی کۆشکی ئەخمینی یەکان لە سوسەدا. نموونە ئاشوری یەکان زانیاری یەکی زۆرمان دەربارەی ئەم بنیادنانە پێشکەش ئەکەن، بەتایبەتی ئەو کۆشکانەی بەردەوام دەستی بیانی کاری تێکردبوون".

وە نەبێ ئەمانەی سەرەوە هەموو زانیاری یەك بن دەربارەی ئەو کۆمەڵ و خەڵکانەی لەپێش هەزارو دوو هەزارو سێ هەزار ساڵ لە ناوچەکانی کوردستانا ژیابوون و هەندێ جاریش لەوێوە چونەتە سەر ناوچەکانی تری دەوروپشتی کوردستان و حوکم دارییان تێدا کردووە، بەڵکو ئەمە چەند نموونەیەك بوون دەربارەی

ئەو کۆمەڵو خەڵکانەی کە هیچ نەبێت هەندێکیان بوون بە بناخە بۆ پێکەوەنانی کۆمەڵگای نەتەوەی کورد. سا ئەم کۆمەڵگایە بە مێژوو یاخود بە زبان یا بەهەستی دەروونی یا بەچەند مەرجێك لەمانە کەمو زۆر شێوەی بچێتەوە سەر ئەو کۆمەڵو خەڵکانە.

بۆیە ئیتر ئەچینە سەر شەپۆلی دووەم کەمێژوو ناسانو پسپۆڕان بایەخێکی زیاتریان دەربارەی پێکەوەنانی نەتەوەی کورد بەم شەپۆلەوە داوە کە شەپۆلی کۆچکردنی ماددەکانە بۆ خاکی ئێستای کوردستان.

# شه پۆلی دووەم

ئەم شەپۆلە بەکۆچکردنی هۆزەکانی مادد–ی بەئاری ناسراو لەودیو دەریای خەزەرەوە بەرەو کوردستانی ئێستا هاتوون و ئیمپراتۆری یەکی گەورەیان دامەزراندووەو ئیمپراتۆری یەتی ئاشوورییان لەساڵی ٦١٢–ی پێش زایینی دا بە یارمەتی بابلی یەکان لەناوبردووە. ئەم ئیمپراتۆری یەتەش بەدەستی کۆرش لەنێوان ٥٥٤– ٥٥٥–ی پێش زایینی دا لەناوچووە. لە ئەنجاما وەکو چەند مەملەکەتێکی بچوکی سەربەخۆو نیوە سەربەخۆ ماوەیەك ماونەتەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا پیاوە گەورەو سەردارەکانیان لە ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی یەکانا هەر ناودارو دەسەڵاتدار بوون.

ئەوانەی لەسەر مادد–یان نووسیوە مێژووی بوونیان لە کوردستانا ئەبەستن بە (١٠٠٠ تا ٧٠٠٠) ساڵ پێش زایینی. بەگشتی زبانی ئاوێستاو زبانی مادد بەیەك زبان دائەنێین، هەروەها بە باپیرە گەورەی کوردیان لەقەڵەم ئەدەن. لەدوای بەرچاو خستنی بیروڕای مێژوونوسان و پسپۆڕانی ئەم بابەتە، کۆچکردن و مەڵبەندو زبان و ئاین و دەسەڵات و فەرمانڕەوایی ئەم ماددانە، پێوەندی ماددەکان بە نەژادو زبانی نەتەوەی کورد ئەخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

ئەوی ڕاست بێ نەتەوەی کورد بەتەنیا لەمادد پێك نەهاتووە هەرچەندە ماددەکان بناخەیەکی دیارو لەباربوون بۆ ئەم پێك هاتنە. هەروەها هیچ نەتەوەیەکی تری سەرزەمین لە هۆزو عەشیرەتێك یاخود چەند هۆزو عەشیرەتێکی کەم پێك نایەن.

بەڵام هەندێ جار چەند هۆزێك ئەبن بە بەردی بناخەی سەرەکی ئەم دامەزراندنە.

لەمەودوا ئەمانەوێت تیشك بخەینە سەر وەڵامی ئەم دوو پرسیارە:
١-ئایا هۆزەکانی مادد لایەنی سەرەکی پێك هێنانی نەتەوەی کوردن؟
٢-ئایا نەتەوەی کورد بە مێژو و زبان ئەچنەوە سەر ماددەکان؟
بۆ وەڵامی ئەم دوو پرسیارە کە لە گەوهەردا هەردووکیان پرسیارێکن وا ئەم زانیاری‌یە مێژووییانە ئەخەینە پێشچاو.
دوکتۆر حسن پیرنیا ئەڵێت[17] "ماددەکان کەسانێ بوون ئاریانی نەژاد، لەسەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش زایینی‌دا سەڵتەنەتی مادیان دامەزراندووە، بەڕاستی نازانرێت چ کاتێك ئەم مرۆڤانە هاتونەتە ئێران و لە ئازربایجان و کوردستانی ئێستا دانیشتوون.
بەڵام بەزۆری خەیاڵی بەهێز بۆ ئەوە ئەچێت کە لە سەدەی دەیەمی پێش زایینی‌یەوە هاتبن...
(سلمتسر)ی سێیەم کە لە ساڵی ٨٣٧-ی پێش زایینی‌دا بۆ جەنگ کردن رووی کردۆتە کوردستان یەکەمجار ناوی دوو جۆر مرۆڤی هانیوە، یەکێکیان (پارسوا) و ئەویتریان پێی وتوون (ئامادای). ئەم پاشایە وتوویەتی مرۆڤانی یەکەمیان لەنێوان کێوەکانی زەهاو و دیالە و ئەوانی تریان لە دەوروبەری ناوچەی (چلگەها) دانیشتون.
هەر لەسەر باسەکەی ئەڕوات و ئەڵێت[18] "لە کۆتاییدا پێویستە ئەوە بوترێت کە مادد-ی ڕەسەن وەکو لەمێژووی ئەمانەدا هاتووە بریتی بوون لە ئازربایجان و کوردستان و عێراقی عەجەم.
بەڵام لەپاش ئەوەی تەشەنەیان کردووە لە ڕووبارەکانی لیس (ڕودها لیس) تا ڕۆژئاوا و لەدەریای خەزەرەوە تاپارس و خوزستان درێژەی کێشاوە.
جوگرافی ناسەکانی (عهد قدیم) بەدوو ماد ڕازی بوون، ماددی گەورە کە تاماوەیەك لەمەوبەر بەعێراقی عەجەم ناسراوە و ماددی بچوك کە لە (عهد قدیم)دا بە ئازربایجانیان وتووە....
لەدامێنی لاپەڕەکەدا ئەڵێت- عێراقی عەجەم ئەو لایەنانەی ئێستا بوون- گرۆس، همدان، کرمانشاه، قزوین، عێراق، اصفهان، نهاوند، ڕێ تا دەربەندی ئاو بەستی دەریای خەزەر، کە مادد لە پارت جیا ئەکاتەوە".

مامۆستا محمد امین زکی بەگ دەربارەی ماددەکان ئەڵێت[١٩] "سجل و بەڵگەکانی دەوروبەر ئاشوری لە سەدەکانی نۆیەم و هەشتەم و حەوتەمی پێش زایینیدا ئەوە دەرئەخەن کە ئاڵوگۆڕو گۆڕانکارییەك لە ڕۆژهەلاتی کوردستانا لەئەنجامی کۆچکردنی گەلێکی ئاری هندو ئەوروپایی لە ڕۆژهەلاتی دەریای ڕەشەوە بۆ ناوچەکانی باکور ڕووی داوە.

(شلما ناصر)ی پێنجەم پاشای ئاشورییەکان لە ٨٢٣- ٨١٠-ی پێش زایینیدا یەکەم کەس بووە ناوی میدیای هانیوە. ئیتر دوای ئەم مێژووە میدییەکان هەمیشە هەڕەشەیان لەحکومەتی ئاشورییەکان کردووە، چونکە یەکەمجار ناوچە ڕۆژهەلاتییەکانی ولاتی میدیایان داگیرکردووە، وە هەر سەدەی حەوتەمین هاتۆتە پێشەوە میرو پێشەواکانی ئەم گەلە لاوە دەسەلات و دەستیان گرتووە بەسەر هەموو ئەو ولاتەی کە لەدواییدا بە مەملەکەتی میدیا ناوبراوە".

هەر لەم بارەیەوە بیروڕای ڕەشید یاسمی-ش ئەخەینە پێشچاو کە ئەڵێت[١٩] "پۆلپ یەکە مێژووناسە، کە لە ساڵی ١٧٠-ی زایینیدا ناوی کوردی بردووە. دوای (کزنفون) ڕووناکترین لێدوان لەکوردستان لە نووسراوی مێژو و جوگرافیا نووس (ئەسترابون) لەسنوری زایینی مەسیح دایە، لە سەردەمی ئەشکانیدا ژیاوە، ئەسترابون کوردی بە (کورتی) نووسیوە، جێگای دانیشتنیانی بەخاکی مادد پیشان داوە.

بەمەدا وا دەرئەکەوێ لەڕووی جێگا و چاخەوە، کورد مادد بووەو کەس نەیوتووە کەکورد و مادد لەیەك جیابوون، هەموو دانیان بەوەدا ناوە کە کوردو مادد هەریەکن".

لێرەدا پێویستە وەکو لەسەرچاوە مێژووییەکاندا باسکراوە، ناوی هۆزە ماددەکان کە هێرۆدۆت ناوی بردون بخەینە پێشچاو :

١-ئاری زانت *Arizantoi*

٢-پارتیاکین *Panetakenio*

٣-بۆوسا *Bousai*

٤-ستروکات *Strukates*

٥-بوودی *Boudeoi*

٦-ماگ *Magoi*"[٢٠]

لەلایەکی ترەوە سیر دبلیو. ار. هی ئەڵێت[٢١] "کورد ئارین، وە وا بڵاوە کە لەگەڵ گەلی ماددی کۆندا یەکن.

زینفون *XenoPhon* بەناوی (کوردوجی)-یەوە ئاماژەیان بۆ ئەکات. بەناوبانگترین کورد لەمێژوودا صلاح الدین-ی ئەیوبی‌یە کە کەرەتێك هەولێری کردووە بەپایتەختی خۆی".

بەدوای ئەم کورتە بەڵگەو باسە مێژووییانەدا پێویستە هەندێك بە وردی‌و دوورو درێژی کە لە سنوری زانستی مێژووییانە دەرنەچێت باسێکی پێوەندی زبانی کوردی بەزمانە کۆنەکانی ناوچەی کۆنی کوردستانەوە بکەین. چونکە وەکو زانایانی زبانەوانیش ئەڵێن، پەیدابوون‌و نەشونما و پێوەندییەکانی تری زبان ڕێگە نیشاندەرێکی ڕاست‌و ڕەوان‌و بەڵگەیەکی قایمە لەکۆڕی پەیدابوونی نەتەوەدا.

لە لایەکەوە زبان گیانی نەتەوەیە وە لەپێش نەتەوەدا بە هەزاران ساڵ زمان پەیدابووەو ڕێڕەوی مێژوویی دامەزراندن‌و پێشکەوتن‌و گەشەکردن و پالاوتنی گرتۆتە بەر. لەلایەکی ترەوە زبان پایەی هەرە سەرەکی پێکەوەنانی نەتەوەیە، بێ مەرجی زبان، با مەرجەکانی تری پەیدابوونی نەتەوەش لەکایەدا بێت، هیچ نەتەوەیەك پێك نایەت. چونکە زبان ڕابەرو پێشڕەوی مەرجەکانی تری دامەزراندنی نەتەوەیەکی پالاوتە یاخود بەرەو پالاوتە چوون ڕۆیشتووە.

زبانی کوردی‌و زبانە ئاری‌یەکانی شەپۆلی یەکەم‌و دووەم وەکو ساغ بوبێتەوە وایە کە بەنی هۆزو کۆمەڵ‌و کەسانی دانیشتوی کوردستانی پێش هاتنی ئاری‌یە کۆچکردووەکان بۆ ئەم ناوچەیە بەلای کەمەوە قەوارەو گرامەرو ڕیشە سەرەکی‌یەکانی نەماوەو ئەگەر شتێکیش مابێت بریتی‌یە لەکۆمەڵە وشەیەك لەملاو لەولای زمانی کوردی‌دا مابێتەوە.

چونکە بەپێی هەموو پێوەرێکی زبانەوانی، زبانی ئێستای کوردی زۆر نزیکە لەخێزانی زبانەکانی ئێرانی، وە بە گشتی لە زبانەکانی فارسی‌و پشتۆو ئوردووەوە،

دوای ئەمانە هندی کەبە هەموویان ئەڵێن هندو ئێرانی ئنجا دوای ئەمان لە زبانەکانی هندو ئەوروپایی وەکو ئینگلیزیو فەرەنسایی و ئەڵەمانی و ڕوسی و پۆڵەندیو سەرجەم زبانە سلاڤی‌یەکان.

دەربارەی زبانە ئێرانی‌یەکان، زانایانی کوردو بیانی‌یە شارەزاکانی ئەم زبانەو زۆربەی ڕۆژهەڵات ناسەکان ئەوەیان ساغ کردۆتەوە کە ئەگەر زبانی کوردی بناخەی زمانە ئێرانی‌یەکان نەبێت ئەوا لە زبانە ڕەسەنەکانی ئێرانی و هندو ئێرانی‌یە.

بۆ ساغ کردنەوەی ئەم ڕاستی‌یە وا لەمەولا بیروڕاو بۆچوونو لێکۆڵینەوەی گەلێك پسپۆڕانو ڕۆژهەڵات ناسانو زانایانی ئەم بابەتە ئەخەینە پێشچاو، تا باسەکە لە ئارەزو و قسەی بەربورە دوورکەوێتەوەو قاڵبێکی زانستیانەی بەرێو بەجێ بگرێتە خۆی.

با لە دوکتۆر عبدالرحمن قاسملو-ەوە دەست پێ بکەین کە ئەڵێت[٢٢] "زبانی کوردی ئەچێتەوە سەر کۆمەڵە زبانە ئێرانی‌یەکان، کە ئەمانیش لکێکی خێزانی زمانە هندو ئەوروپاییەکانو بریتین لەزبانی کوردی و فارسی و افغانیو تاجیکی".

بەدوای ئەمدا بیروڕای ئەدموندز ئەخەینە پێشچاو[٢٢] "بەشێوەیەکی گشتی هەرکەسێك پشت بە قەرینە جوگرافیو زبانەوانی‌یەکان ببەستێت تاڕادەیەك بۆی هەیە کوردی ئەمڕۆ نە نەوەی میدیایی زنجیرە پاشا ڕۆژهەڵاتی‌یە سێ‌یەمینە گەورەکان بزانێت".

هەر ئەدموندز لە وتارێکدا کە لە گۆڤاری (جمعیە أسیا الوسطی) ژمارە (١١)دا بڵاوی کردۆتەوە ئەڵێت[٢٢]" ئیتر ئەوە ڕوون بۆتەوە کە زمانی کوردی زاراوەیەکی فارسی شێواوی لێ لادراو نی‌یە، بەڵکو زمانێکی ئاریایی خاوێنی ناسراوە لە کۆنەوە پێشکەوتووەو خاسییەتی تایبەتی خۆی هەیە".

دەربارەی ئەم بابەتە حسن پیرنیا بە زمانی ڕۆژهەڵات ناس (دارمیس تیتر)-ەوە ئەڵێت[٢٢] "بیروڕای وایە کە ئاوێستا (کتێبی پیرۆزی زەردەشتیان) بە زبانی مادد نووسراوەتەوە، گومان لەوەدا نی‌یە کە زبانی ماددەکان لەتەك زبانی فارسی کۆن تاڕادەیەك (تقریبا) یەك زبان بوون وە جیاوازی‌یەکی کەم لە

نێوانیاندا هەبووە، چونکە لەزەمانی (استرابون)دا فارسەکانو ماددەکان لە زبانی یەکتری گەیشتوون. هەندێ زبانی کورد ئێستا بە لێکەوتنەوەی زبانی ماددەکان ئەزانن".

دەربارەی زبانی کوردی (سیر سدنی سمیث) ئەڵێت[٢٤] "تیۆری ڕەگەزی زبانی کوردی لەم ڕۆژانەدا زۆر گۆڕراوە، بەپێی بیروڕای پسپۆڕان کەمرۆڤ ئەتوانێت پشت بە بیروڕاو تیۆرییەکانیان ببەستێت، زبانی کوردی ئێستا زاراوەیەکی لێکەوتووەو یا هەڵگێڕراوەی زبانی فارسی ئێستا نییە، بەڵکو زبانێکی تەواو سەربەخۆو پێشکەوتنێکی مێژوویی ڕاستەقینەی خۆی هەیە. وە لە زبانی فارسی کۆن کۆنترە، کە کۆنینەی داریوشی پێ نووسراوەتەوە، ئەگەر ئەم تیۆرییە بەهێزە ڕاست بێ ئەوا بۆ زانایانی مێژوو هەیە بڵێن کە زبانی کوردی لەسەدەی شەستی پێش زایینییەوە هەبووەو بەشێوەیەکی سەربەخۆ لە زبانە دراوسێکانی، بەکارهێنراوە".

هەروەها مێجەرسۆن ئەڵێت[٢٤] "ئەبێ ئەوە بسەلمێنرێت کە زەردەشت بەزبانی ئەم دواییەی میدیکان قسەی کردووەو لەباکوری کەرتی (میدیا) کە ئێستا بەکەرتی موکری (مکری) ناسراوە هاتۆتە دنیاوە. وە ئەم زبانی زەردەشتە کە وەکو لە زەند ئاوێستادا ئەیبینین زۆر لە زاراوەی موکری ئێستاوە نزیکە (بەڵکو هەروەکو لەمەولا باسی ئەکەین)هەر زبانی موکری خۆیەتی".

مامۆستا محمد امین زکی بەگ دەربارەی ئەم باسە پەنا ئەباتە بەر (هوارت) و (دارمستیتر)و ئەڵێت[٢٥] "ئەم تیۆرییە یا بیروڕایە لەلایەن (هوارت) و (دارمستیتر)و شارەزایانی ڕاگەیاندنی ترەوە بەگەرم پەسەند کراوەو کورتەی باسەکانیان ئەوەیە کە زبانی (ابستاقی زەردەشت) زبانی کوردی ئێستا و میدی پێشووە.

وە زبانی فارسی لەو کاتەدا ئەو زبانە بووە کە کۆنینەکانی (پرس پولیس-اصطخر)ی پێ نووسراوەتەوە".

بۆیە وا ئەم لیستەی بەراودکردنە ئەخەینە پێشچاو.

لیستەی بەراوردی زاراوەی کوردی سلەیمانیو کرمانجیو زازاییو ئاوێستاییو زبانی فارسی ئێستا[25]

| زبانی کورد | | زبانی ئاوێستایی | زبانی فارسی ئێستا |
|---|---|---|---|
| زاراوەی سلەیمانی | زاراوەی کرمانجیو زازایی | | |
| گەورە | مازین | ماز | سنگین ، بزرگ |
| بەرز | بەرز | بەرەزا | بلند |
| ماسی | ماسی، ماسە | ماسیا | ماهی |
| تیژ | تیژ ، توژ | تیژ | تیز |
| حوشتر | ئوشترا | ئوشترا | شتر |
| پرد | پرت ، پر | پەرەتا | پل |
| رۆژ | خۆر ، رو | هور | افتاب |
| میش | میش | مەخش | مگس |
| بەرخ | بەرخ | وراخا | بره |
| قسە | کسە، قسە | خسا | حرف، سخن |
| ویستن | ویسو، واشتن | واسی | خواستن |
| زانین | زانین | زان | دانستن |
| من | از__م | ازم | من |

بەم بۆنەیەوە پێویستە باسێکی ئەو بۆچوونەی فارسەکان بکرێت کە لە ئێران و زمانی ئێرانی ئەدوێن، ئەوی ڕاست بێ ئەمانە دوو جۆرە زانا و پسپۆڕ و لێکۆڵەردوەن.

لایەکیان بە دڵپاکی باسی ئێرانیو زبانی ئێرانی ئەکەن. نیازیان هەموو ئەو گەلانەیە کە لە سنوری ئێستای ئێرانو دەوروپشتی ئێرانا ئەژین وەکو کوردو فارسو بلوجو پشتۆو ئوردو....

وە بەگشتی کورد بە کۆنترینو پاڵاوتەترین ئەم نەتەوانە لەڕووی ڕەگەزو زبانەوە ئەزانن، ڕاستییەکەشی هەروایە ناوی میدیای باپیرە گەورەی کوردو کوردوئینو کوردۆخیو کار دوایو کاردۆو گوردو کورد... زۆر لەپێش ناوی فارسەوە لەمێژووی گەلانو خەڵکی ناوچەکەدا هاتووە.

فەرمانڕەوایی فارسەکان لە هاخامەنشی‌یەکانەوە دەست پێ ئەکات کە ئەویش لەسەر ئێسك و پۆسك و بەکەرەسەی میدیا و کورد دامەزراوە.

ئەمە جگە لەوەی کۆرشی گەورەی دامەزرێنەری ئەم دەوڵەتە کچەزای ئاستیاك (ئیکتو ویخو)-ی دوایەمین پاشای میدیایە. سەرکردەو پاڵەوانان و پیاو ماقوڵانی میدیا لە دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتی هاخامەنشی‌دا بەشدار بوون.

جگە لەمەش میدیا و وڵاتی کوردان وەکو مەملەکەتی خاوەن سەربەخۆیی ناوخۆ هەر بەردەوام بووە.

بەڵام بەشی دووەمیان کەللەڕەق و چاوبرپیوە ماڵ و خاکی گەلانی ترن، سەبارەت بەوەی کە فارسەکان دوای میدیا ناویان لە ناوچەکەدا بڵاوبۆتەوە ئیتر فەرمانڕەواکانیان ناوبەناو دەستیان بەسەر بەشێك یاخود چەند بەشێکی کوردستانا گرتووە و گەلی کوردیان گەلێ جار بەزۆرو هەندێ جار بەفڕوفێڵ و خوایشت تێکەڵی ئیمپراتۆری‌یەتەکەی خۆیان کردووە. قازانجیان لەوەدا بووە کە هەر ناوی کورد لەبیر خۆیان و چەندیش بکرێت لەبیر گەلانی تر ببەنەوە و چەندیان پێ بکرێت وا لە خەڵکی‌تر بگەیەنن کە کورد هەر فارسی کۆنە و یەك گەل و نەتەوەن.

ئەمە جگە لە ئارەزووی داگیر کردن و چەوساننەوە، فارس لە ئێرانا بەتاقی تەنیا بەژمارە ئەگەر لە کورد کەمتر نەبێت هەروەکو یەکتری وان وە لەوەپێشی-ش هەروا بوون.

فەرمانڕەوایانی فارس هەرگیز نەیانویستووە گەلی کورد و زمانی کوردی وەکو دوو دیاردەی جیاواز لە هێنی گەلەکەی خۆیان بخەنە ڕوو.

شاکانی ئێران لەژێر پەردەی ناوی جیاوازی ئیمپراتۆری‌یەتە-کانیانەوە نەك هەر ناوی کورد بەڵکو تورکمان و ئازربایجانی-شیان هەرکردووە بەژێر لێوەوە. بەهاتنی ڕەزا شا کە پێیان ئەوت ڕەزا شای کەبیر و دوای ئەو حەمە ڕەزا شای کوڕی ئەم ڕاستی‌یە لەژێر پەردەی ئێرانێتی و ئاریایەتی‌دا پاڵاوتەتر کەوتەڕوو.

گەلێ جار تورکمان و ئەفغانی و کورد وەکو سوڵتان مەحمودی غەزنەوی و نادرشا و کەریم خانی زەند پاشا و سەرداری ئەم ئیمپراتۆری‌یەتە بوون، کەچی ناوو پایەی گەلانی ئەم شا و سەردارانە هەر لە چوار چێوە گشتی‌یەکەی جارانیاندا ماوەتەوە.

حەمەڕەزا شا ئێرانێتی و ئاریایەتی کرد بە بۆتەیەك بۆ توانەوەی هەموو گەلانی ئێرانی لە بۆتەی فارسی‌دا، بۆ پەرەپێدان و سەرخستنی ئەم نیازەش نازناوی ئاریا مهر (ئاری خۆشەویست)ی بەخۆیەوە نووسان.

وا لێرەدا ڕای دوکتۆر ذبیح الله صفا ئەخەینە پێشچاو[٢٦] "نەژادی ئێرانی وەکو وتومە خۆیان بە (ارى) ئەخوێندنەوە، چونکە کە گەیشتونەتە خاکی ئێران ئەو خاکەیان ناوناوە (ائیرین– *Airyana*)، وە ئەمە هەمان ناوە کە لە زمانی پەهلەوی‌دا بە (اران) (ایران بەیائی مجهول) گۆڕپاوە وە لە دەوروبەری ئیسلامدا بە (یائی معلوم) خوێندراوەتەوە.

کۆنترین نیشتەجێ بوون و داڵدەدەری قەومی ئێرانی (ائیرین ویجە *Airyana Vaedjah*) ئەتوانرێت بەسەر زەمینی سەرەکی ئاریا ناوببرێت".

ئەوەتا لێرەدا پێ لەوە ئەنێت کەخاکی ئێران بەناوی ئاریاوە ناونراوە.

لەگومان لێکردنیش چۆتە دەرێ کە ئاری‌یەکان بوون بەچەند قەومێکەوە یاخود چەند قەومێکیان لێکەوتۆتەوە کە فارسەکان کاتی خۆی نە یەکەمیان و نە زۆرتریان و نە ناودارتریان بوون.

ئەوەتا ڕوونتر حسن پیرنیا لەسەر ئەم باسە ئەڕوات وئەڵێت[٢٧] "ئاری‌یەکان کاتێ هاتنە ئێران، بوون بەچەند تایەفەو قەومێکەوە، هەر یەکێك لەم قەوم و تایەفانە جێگایەکیان لەپانایی ئێرانا بۆخۆیان کردەوە.

گرنگترینی ئەم قەومانە بەپێی زنجیرەی مێژوویی، سێ قەوم بوون، ماددەکان، پارسەکان، پارتی‌یەکان. (نیازی لە دانیشتوانی خۆراسانە).

ئەم سێ قەومە لەزەمانی کۆندا دەوڵەتی گەورەیان دامەزراندووە و کاری گرنگیان ئەنجام داوە، جگە لەمانەش قەومی تر دیسانەوە هەبوون وەکو (ڕۆژئاوایی) لە ڕۆژئاواو (کرمانی)-یەکان لە کرمان و (وەرکانی)یەکان لە گورگان و (هەرەخواتی)یەکان لە (رُجخ) باشووری ئەفغانستانی ئێستا".

ئەم چەند دێڕەی حسن پیرنیا دوو ڕاستی ئەخەنە ڕوو، یەکەمیان ئەوەیە ناوی ئێران لە ئاری‌یەوە پەیدا بووە، واتا ئێران مانای ئاری ئەگەیەنێت بەناوی ئەوانەوە ناونراوە.

دووەمیان ئەو ئاری‌یانە چەند قەومێکیان لێ کەوتۆتەوە، کە یەکێکیان فارسە. هەروەها زبانی فارسی–ش یەکێکە لە زمانە ئاری‌یەکان کە لە تەمەندا بەدوای زبانی کوردیدا هاتووەو بڵاوبۆتەوە.

بەڵام بەداخەوە نەك هەر لە ئێران بەڵکو لەزۆر وڵاتی تری ئەم سەرزەمینەدا مێژوو ناسان‌و پسپۆرانی کەللەڕەقی توندڕەوی چاوبرسی گەلە داگیرکەرە زۆردارە گەورەکان لایەنە چاکەکانی مێژوویی گەلە بچوك‌و ژێر دەستە کراوەکانیان بۆ گەلەکانی خۆیان فڕاندووەو کردویانە بە لاپەڕەی مێژوویی پڕ شانازی ڕەسەنی خۆیان.

بەڵام ئەمە نابێ ورەمان پێ بەربدات‌و ئێمەی کورد دەست لەڕەسەن‌و ڕیشەو ڕەگەزی خۆمان هەڵگرین‌و بۆ ئەوانەی بەجێ بهێڵین کە بەفڕو فێڵ‌و لەکاتی دەسەڵاتداریێتیدا لێیان فڕاندوین‌و هەوڵیان داوە ڕیشەی مێژووی کوردمان لێ بشێوێنن. بەڵکو پێویستە ئێستا کە نەتەوەی کورد خاوەنی سەدان مێژوو نووس‌و پسپۆڕو زانای لێهاتووە، مێژووی نەتەوەکەمان بخرێتەوە سەرباری ڕاستەقینەی خۆی‌و لەدەست تاڵانکەران‌و دزو درۆزن دەربهێنرێتەوە دەرێ.

بۆ تیشکی پتر خستنە سەر ئەم باسە وابیروڕای چەند زانایەکی تر ئەخەینە ڕوو، ئەوەتا مامۆستا مسعود محمد ئەڵێت[٢٨] "وشە ناوکۆیی‌و لە یەکچووەکان لە کوردی‌و فارسی‌دا ئەگەر لە ئاڤێستادا یەك سەرچاوەیان هەبێت لەکوردی نزیکترن تا فارسی لەبەر دوو هۆ:

هۆی یەکەم: ساغ بۆتەوە کە فارسی زبانێکی جیاوازە لە زمانی ئاڤێستا بەڵام دەربارەی زبانی کوردی شتی وا ساغ نەبۆتەوە. هۆی دووەم: پێغەمبەری ئاڤێستا کورد بووەو بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینەکەی چۆتە ناو قەومێکی ترەوە.

لەسەر باسەکەی ئەڕوات‌و ئەڵێت "فارسی پاش هەڵوەشاندنەوەی حوکمی مادە کوردەکان‌و کەوتنە دەست پارسە هاخامنشی‌یەکان بەهۆی دەسەڵات‌و ئاینەوە، دەستی گرت بەسەر ئاڤێستادا.....

فارسی لەدوای ڕوخاندنی دەوڵەتی کوردە مادەکانەوە بەدووسەد ساڵ لەدەورووبەری حوکمی هاخامنشی‌دا بوو بەمیراتگری دەسەڵات‌و میراتگری ئاین.

هەرچی لە ئاڤێستا دەربارەی بیروباوەڕو دنیا هەبوو کردی بەهی خۆی. بەمە لای خەڵکی فارسی و (پارسی)و ئاڤێستا لەم دەورەدا بوون بەیەك شت وەکو وەکیەکی عەرەبی و قورئان...

ئێمە بەڕاستی خۆمان بەخاوەن ئەزانین و هەست بەفرمانی سەرشانمان ئەکەین، کە ئاڤێستا بکەین بە بەڵگەنامەی تاپۆی کورد لەدادگای مێژوودا.

خۆمان بەو بەخاوەنی هەموو وشەیەکی ئاڤێستا بزانین کەفارسی دەستی بەسەرا گرتووە. ئێمە خاوەنی زبانی خۆمانین کە پێ ی ئەدوێین.

دەست لەو دانە دانانە هەڵناگرین کە نموونەو شێوەی لە فارسی‌دا هەیە، چونکە ئەمە نەك هەر تەنیا لەنێوان زبانە ئێرانی‌یەکانا بەڵکو لەنێوان ئەمان و سانسکریتی و لەنێو ئەمو زبانە ئەوروپاییەکانیش دا، کە لە سەرچاوەی هندی ئەوروپایی کەوتۆتەوە هەیە.

بەپێ ی بنکەی پەسەندکراو ئەبێ داوا لە داگیرکەرو دەست درێژکەر بکرێت دەست لە داگیرکراو هەڵبگرێت و بیداتەوە دەست خاوەنەکەی، نەوەکا داوا لە داگیرکراو بکرێت دەست لەوەش هەڵبگرێت کە بەدەستی‌یەوە ماوەو تەپڵی بابوتی لێبدات....

ئێمە خاوەنی زبانی خۆمانین و ئەو دانە دانانە (مفردات)ی لەئاوێستاو ئاینی زەردەشتی‌دا هەیە هی خۆمانە چونکە لە زمانەکەی ئێمەوە نزیکترە".

مامۆستا مسعود محمد پاش لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانەو ڕێك و پێك و پشتبەستوو بە کۆمەڵە بەڵگەو نیشانەیەکی مێژوویی لەسەر باسەکەی ئەڕوات و ئەڵێت "کورد کەدەستی بە زبانەکەی خۆیەوە گرتووە، گەلێك زەوی و خوێن و خۆشی دنیاو پایەکانی شارستانێتی لەکیس چووە، کەچی (تاجیك)ی خاوەنی خۆشی و زەوی و قەوارەیە، هەروەها ئەفغانی و هندی و باکورنشین.

کوردی شارەزا لە بەسەرهاتەکانی مێژوو لەم باری سەرنجەوە پتر دەست بەزبانەکەیەوە ئەگرێت و دەست لەهیچ بۆ فارسی هەڵناگرێت.

هەمەدان کە لە سەدەی شەشەمینی پێش زایینی و چەند سەدەیەکیش پێش ئەوە مەڵبەندی حوکمی کورد بوو، دەستمان بۆ فارس لێ هەڵگرت، هەروەها بەشێکی تری زۆر پانوبەرینی خاکی کورد، تا ئەو ڕادەیەی (ئولیا چەلەبی) لەو گەشتەی کە

سێ سەدە لەمەوپێش پێی هەڵساوە، هەندێ جێگای لەخاکی کوردان دیوە، ئێستا کەلەنێوانی ئەو خاکانەو نزیکترین خاکی ئێستای کوردا سەد کیلۆمەترە".

لەئەنجاما دەربارەی پەهلەوی و ڕەوتی زمانی کوردی ئەڵێت "هەردووکیان لەنێو چەپکە زمانە ئێرانی یەکانا داوێک بەتەنیشت یەکەوەن. وەجیاوازییان لەسەر نویشت دا ئەوەیە پەهلەوی گەشاوەتەوەو خەفە بووە، کوردی خەفە بووەو گەشاوەتەوە".

دوکتۆر جەمال ڕەشید ئەحمەد لە لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی بەنرخدا دەربارەی بناخەکانی زمانی کوردی ئەڵێت[٢٩] "لەلایەن پێوەندی زمانەوانییەوە لەناوچەی وڵاتی میتانیادا بێجگە لەکوردی هیچ زمانێکی دی نی یە بتوانێت خۆی بەخاوەنی میراتی زمانی میتانی بزانێت". هەروەها دوکتۆر جەمال ئەڵێت[٢٩] "بێگومان زمانی چینی دەسەڵاتداری دەوڵەتی میتانیای کۆن کە پێوەندییەکی لەگەڵ کوردی ئەمڕۆدا هەیە تێکەڵاوییەک و بایەخێکی هەبووە لەگەڵ زمانە ناوچەیی یەکانی ئەو وڵاتەدا. چ بەڕێی کاریگەری هێزی گیانی ئایینی یەوەو چ بەهێزی دەسەڵاتداری کۆنی سیاسی و کولتورەوە بوو بێت.

ئەو تێکەڵاوی زمانەوانی یەش لە ناوەڕاستی هەزارەی دووی پێش زایین دا دەستی پێ کردبوو، وە لە سەدەی هەشتی پێش زاییندا وای لێهاتبو کەوا یەکێک وەکو (مینەواس) پادشای (هالدیان) کە بە زمانێکی ناوچەیی (هوری) دواوە شارێک لە ناوچەی (توم) کە کەوتبوە نێوان موش و ئەخلاط دروست بکات و نێوی بنێت بە (مینەواس کەرت) کە بێگومان بەکوردی ئێستا ئەبێت بە (مینەواس کردە) ئێستا نێوی ئەم شارە کوردیە لەتورکیادا بەپێی گۆڕین و کاریگەری زمانەوانی بۆتە مەلاز گەرد".

دوکتۆر جەمال لەسەر باسەکەی ئەڕوات و "لەژێر سەر نووسراوی- پلەی بوژانەوەی بناخەکانی زمانی کوردی تیشکێک لەسەر زمانەکانی پێش کوردی ئەڵێت[٢٩] "ئەگەر مێژووی وڵاتی کوردەواری سەرانسەر بپشکنین دەتوانین بەگشتی هەر لەهەزارەی یەکەمی پێش زایین دا ئەنجامی ئەو گۆڕینە زمانەوانی یە بەدی بکەین کە بەرەبەرە لەچەند شێوە زمانێکی بنەڕەتی، کەم کەلەپوری نووسراوی بەجێهێشتوە....

شێوە زمانەکانی پێش ئەم پلەیە (هوری، کوتی، لولوبی، تەنانەت کاسی-ش)، هەرچەندە کۆمەڵێك دیاردەی زمانەوانی هاوبەشیان لەناوخۆیان دا هەبووەو کۆمەڵێك وشەو ڕستەیان شی کراوەتەوەو لەبەر دەستایە، بەڵام دوو دیاردەی گرنگی ئاڵۆز تاکو ئێستا ڕوون نەکراونەتەوە:

١-ئایا هەریەکە لەو شێوە زمانانە زمانێکی سەربەخۆ بوون، یا هەموویان سەر بەزمانێکی یەکگرتووی تایبەتین‌و ڕۆژگار لەیەك دوری خستوونەتەوە؟

٢-ئەم شێوە زمانانە ئایا چ کەلەپورێکی زمانەوانیان لە زمانەکانی ئەمڕۆی سەروی میزۆپۆتامیا، بەتایبەتی لە کوردیدا بەجێ هێشتووە؟

دەربارەی پرسیاری یەکەم لەم زمانانەدا ئەو نێوو ڕستانە کە بەنووسراوی بۆمان ماونەتەوە ڕاستیەك دەردەخەن کە پێوەندییەکی زمانەوانی ڕوون‌و ئاشکرا لەناو ئەم زمانانەی زاگرۆس‌و کوردستانەدا هەبووە، بەڵام جیاوازیەك لەهەندێك جۆری بیری ئاییندا جیای کردبوونەوە.لە سەرەتای هەزارەی دووی پێش زاییندا کۆچەرانی (هیندۆ- ئەوروپایی زوبان) لە ناویاندا بڵاوبوونەتەوەو لەپاڵ سەدەها وشەی هاوبەش چەند ژمارەیەکی خوداوەندان‌و جۆری بیری ئایینی یەکگرتوو لەناویان دا پەیدابووەو ئەم دیاردەیەش دەتوانرێت لە نوسراوەکانی دەوڵەتی میتانیا تاکار دونیاش دا بەدی بکرێت. تاوای لێ دێت لەسەرەتای هەزارەی یەکی پێش زاییندا جۆرە و شەو نێوی کەسی‌و ڕستە پەیدا ببێت‌و ئەمڕۆ پێوەندییەکی پتەوی لەگەڵ زمانی کوردی‌دا پەیدا بکات. بەم جۆرەش دەتوانرێت بە بناخەی سەرەتای ئەم زمانە بناسرێن".

هەروەها لەسەر باسەکەی ئەڕوات‌و ئەڵێت [٣٠]"لە سەدەی هەفتی پێش زایینی‌دا (پادشایەتی ماد) دێتە کایەوەو بەڕێگای ئەم هێزە ڕامیاری‌یەوە شێوەکانی زمانی ماد لە کوردستان دا بڵاودەبێتەوە. بەم جۆرە ئەو دامرکاندن‌و جێخۆش کردنە زمانەوانی‌یە مەزنەکەی، هەزارەی یەکی پێش زایین لە کۆمەڵێك زمانە ناوچەییەکانی کوردستان لەگەڵ زمانی کۆچەرە هیندو ئێرانیکانداو بوژانەوەی زمانی کوردی لەکۆتاییدا، بەڕێگاو کاریگەری سێ زمانی سەربەیەك خێزان هاتۆتە کایەوە.

یەکەم پاشماوەی زمانی چینی دەسەڵاتداری دەوڵەتی میتانیایەو دووەم بەبڵاوبوونەوەی هۆزانی سەکەس و کیمیری لە باشوری کوردستان دا، سێیەم پەیدابوونی ئیمپراتۆریتی مادەکانە".

ئەوی ڕاست بێ دوکتۆر جەمال ڕەشید زۆر بەوردی و دورو درێژی و پشتبەستوو بەسەرچاوەی لێکۆڵەرەوە زبانەوانی و مێژوییەکان باسی پەیدابوون و نەشونمای زبانی کوردی ئەکات. کەوا لێرەدا چەند پارچەیەکی پەیوەندی نزیکی بە باسەکەمانەوە هەیە بڵاوئەکەینەوەو لەسەری ئەڕۆین.

ئەمە جگە لەوەی کە هەموو باسێك بەبیروڕاو بۆچوونی جۆراوجۆر زۆرتر لەڕاستی نزیك ئەبێتەوە، بەتایبەتی باسی زبانی کوردی کە ماوەیەکی کەمە پسپۆڕو زاناکانی کورد کەوتونەتە لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەو بەدووی سەرچاوە ڕەسەنەکانیدا گەڕان.

هەروەها ئەم بابەتانە هەموویان ڕێبازی باسەکەمان بۆ ڕەوان دەکەن، بناخەی زانستی پتەوترو بەرچاوی خوێنەری کورد خۆشتر ئەکەن.

بۆیە جارێکی تر دێینەوە سەر بیروڕاکانی دوکتۆر جەمال کە ئەڵێت[٣١] "بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی گشتی، وا دەردەکەوێت زمانی کوردی کەمەرجێکی گرنگی نەتەوایەتی کوردانە لەمێژوودا، وە بەراوردکردنی لەگەڵ کارەساتەکانی مێژوویی و زمانە کۆنەکانی وڵاتی کوردەواریدا، ئەوەمان بۆ دەردەخات کەوا سەرەتای ئەم زمانە لە پلەیەکی تایبەتیدا (هەزارەی دووەمی پێش زایین) بناخەی خۆی لەو وڵاتەدا چەسپاندووە، هەرچەندە ناتوانرێت نێوی (زمانی کوردی) لێ بنرێت تاکو ئەو سەرەتایە پاش موتوربە بوونی بەزمانە ناوچەیی‌یەکانی و کەوتنی بەر شەپۆلی کاریگەری زمانەکانی مادو سکیث و کیمیری و ئالان و تێکەڵاو بوونی ئەم دیاردەیەش بە کولتوری یۆنانی و ئارامی لەچەرخی هیللیندا. بەرێی دەسەڵاتداریتی ڕامیاری و ئایینیدا کە لەگشت ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئاسیادا ڕووی دابوو ئەو ئەنجامەی پێ گەیاندووە. ئەمجا دەتوانرێت بەو ئامانجە زمانەوانییەی کۆتایی هەزارەی یەکی پێش زایین، کە دانیشتوانی کوردستان پێی دوواون، بگوترێت (شێوە کۆنەکانی زمانی کوردی)، چونکە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ زمانی کوردی نوێدا هەیە".

هەر درێژە بە باسەکەی ئەدات و ئەڵێت[٣٢] "جا لەئەنجامی ئەم شیکردنەوانەی زمان و مێژوویی یەی وڵاتی کوردەوارییەدا سەرەڕای ئەوەی کە هێشتا پشکنینێکی گشتی تەواوی لێ نەکراوە و بۆتە هۆی ڕوون نەبوونی پلە کۆنەکانی مێژووی ئەو وڵاتە، بینیمان کەوا لەم بوارەدا دەتوانرێت پشت بەو نووسراوانەی چینی دەسەڵاتدارانی کۆنی دەوروبەری وڵاتەکە وەکو ئاسورو ئورارتوو هی دی ببەسترێت لەو پارچە نووسراوانەدا لەپاڵ ڕووداوە سیاسی و جەنگی و کۆمەڵایەتیەکان زۆر نێوی کەسی و تۆپۆنۆمی و ئیداری واهەیە کە بەمێژووی وڵاتی کوردەوە پێوەستەو لایەنێکی گرنگی مێژووی کۆنی ئەو وڵاتە پڕ دەکاتەوە هەروەها پێوەندییەکی زمانەوانی توندی لەگەڵ زمانی کوردی نوێدا هەیەو دەتوانرێت بگوترێت کە زمانی کوردی پاشماوەی زمانی خاوەن ئەو نێوانەن وەیا ئەو دانیشتوانەن کەنێوی کەسی و هۆزیان واتای ئەمڕۆ لە کوردیدا بەجێهێشتووە بەزمانێك دوواون کەشێوەیەك لەشێوەکانی زمانی کوردی کۆن بووە.

بەم جۆرە دەبێت زنجیرە ونبووەکانی مێژووی کوردو زمانەکەی بەڕێی بەراوردکردنی ئەو نێوانە لەگەڵ زمانی کوردی نوێدا سنووردار بکەین. بۆ ئەوەی بتوانین لەدواییدا پلەی گۆڕینی زمانەوانی و پەیدابوونی مەرجی نەتەوایەتی کورد ڕوون بکەینەوە".

دوکتۆر جەمال ڕەشید باش بۆی چووە کە ئەبێ بەدوای لایەنە ونبوەکانی زبان و مێژووی کوردا بگەڕێین. ئەم بەدوادا گەڕانە باسەکە دەوڵەمەندو تێروپڕو بایەخدارتر ئەکات.

ئەوەی ئێستاو داهاتووی کورد چاکتر چاوی گەش بە زبان و مێژووی نەتەوەکەیانا هەڵئەمێنن، بەڵام ئەم بۆچوونە بایەخدارەش ئەو ڕاستی یە ناگۆڕێت کە زبانی ئێستای نەتەوەی کورد زبانێکی پوختەو پاڵاوتەو جێگا دیارە لەنێو زبانە زیندووەکانی جیهانداو سەر بە زبانەکانی ئێرانی یە کە ئەوانیش سەر بەسەرجەم زبانی گەلانی ئارییایین لەجیهاندا. هەروەها لە ناوەڕۆکە سەرەکییەکەی باسەکەمان لە لاپەڕەکانی داهاتوودا بە تێروپڕی لێی ئەدوێین.

# نەتەوایەتی کورد

ئەم بابەتە زانیارییەی کەسەرچاوەی باسەکەمانە، ئەوی ڕاست بێ باسێکی پڕ لەگریێو کێشەو ئاساییە، نەك هەر سەبارەت بە نەتەوەی کورد کە تا ئێستا لەهیچ بەشێکی پارچە پارچە کراوەکەیدا قەوارەیەکی سەربەخۆی نییە، بەڵکو سەبارەت بەزۆر گەلو نەتەوەی تری ئەم سەر زەمینەشەوە.

هۆی هەرە گرنگی ئەم کێشەیە ئەوەیە کە لە لایەکەوە بوونو نەبوونی کۆمەڵو خەڵکێك بەنەتەوە یاخود بەرەو نەتەوە چوون، بۆ کۆمەڵو خەڵکەکە خۆیو بۆ هەموو ئەو گەلو نەتەوەو دەوڵەتانەی پەیوەندی سیاسیو ئابووری‌یان بەمانەوە هەیە، لەسەر گۆڕەپانی کردەوەدا ڕەنگێکی سەیر ئەداتەوە، کە هیچ لایەك ناتوانێت خۆی لێ لابدات. وە هەر خۆلێلادانو خۆلێ گێل کردنو چاولێ پۆشین، یاخود چوون بەگژ پێداویستەکانی ئەنجامی سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیری ئەم پەیدابوونە بەئاسانی ئەبێ بەپێکادانو بەگژ یەکتریدا چوونو تائەگاتە شەڕو شۆڕ. ئەنجامەکانی ئەم دوو کردەوەیەش دیارو ئاشکرایە.

لەلایەکی تریشەوە کە لەئاستی بایەخو گرنگی‌دا یەکسەر بەدوای خاڵی یەکەمدا دێت ئەوەیە کە پسپۆڕانو زانایانو مێژوونووسانی ئەم بابەتە، بەپێی سەرچاوەی سیاسیو ئایدیۆلۆژی قازانجی ئابوری خۆیانو گەلەکانیان، بیروڕای جیاجیایان دەربارەی واتای نەتەوە هەیە. چ ئەوەی نەتەوە لە چ کاتێکی ژیانی کۆمەڵە خەڵکێکەوە پەیدا ئەبێ تا هەلومەرجی پەیدابوونی نەتەوەو پێوەرو سەنگو تەرازووی ئەم مەرجانە.

لەمانە هەن بە هەموو کۆمەڵە خەڵکێك کە پێکەوە بژین با لە ڕەگەزو ئایینو مەرجی تریشدا لەیەکتری جیاوازبن، ئەڵێن نەتەوە.

هەشە هەر بە کۆمەڵە خەڵکێك کە مەرجێك یاخود چەند مەرجێکی بەپێی بیروڕای خۆی تێدا دیارو ئاشکرا بێت ئەڵێت نەتەوە.

ئەمە جگە لەوەی هەن نەتەوە ئەبەستن بە بوونی دەوڵەتەوە، وە زانایانی تر هەن لایان وایە کە مەرجی یاخود مەرجەکانی پەیدابوونی نەتەوە یاخود هەر گەلاڵە بوون مەرجەکانی ڕێگا خۆش ئەکات بۆ دامەزراندنی دەوڵەت. ئیتر ئەبێ بەکارێکی ئاسایی و ڕەوا کە گەلان و دەوڵەتان و لایەنە سیاسی‌یەکانی دەرەوە دەستی یارمەتی‌یان بۆ درێژ بکەن.

کۆسپ خستنە ڕێگای ئەم کارو مافە ڕەوایە لای ئەمانەی باسمان کرد بە زۆرداری و مرۆڤایەتی و چاو برسێتی و تەماعکردنە ماف و خاك و ئابوری ئەم نەتەوەیە لەقەڵەم ئەدەن.

بۆیە ساغ کردنەوەی ئەم کێشەیەو لەسەر ڕۆیشتنی و هەوڵدان بۆ سازکردن و گەشە پێکردنی مەرجەکانی پەیدابوونی نەتەوەو هەوڵدان بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئامانجەکانی لەم کاتەدا بەلای نەتەوەی کوردەوە لە هەموو گەل و نەتەوەیەکی تر پتر پێویستە، بەتایبەتی کە ئێستا کێشەی نەتەوەی کورد لە سەرانسەری کوردستانا کە ئەمە زۆر گرنگ و بایەخدارە بووە بەکێشەی هەموو کۆمەلانی خەڵکی کوردستان بەهەموو چین و کۆڕو کۆمەڵ و توێژەکانی‌یەوە هەروەکو کەوتوشەتە کۆڕی نێو دەوڵەتە خاوەن بڕیارەکانەوە. وەکو ئەڵێن لە گەورەترین دەرگاوە بۆیان چۆتە ژوورەوە.

وە نەبێ ئەمەش لەخۆیەوە یاخود بەدەستی خێر خوایانی بیانی بەم ئاست و ئەندازەیە گەیشتبێ بەڵکو ئەبوایە هیچ نەبێت لەکۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانەوە کەکێشەی نەتەوەی کورد لەکۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبة الامم)دا باسکرا، وە پەیمانی سیڤەر بەئاشکراو بەپێی بەندەکانی ٦٢، ٦٣، ٦٤ بڕیاری لەسەردرا، ئەبوایە ئەم کێشە گرنگە ڕەوایە چارەسەر بکرایە، وە نەتەوەی کورد بەئامانجی ڕەوا ئاسایی خۆی بگەیشتایە.

نەتەوەی کورد وەکو لە لاپەڕەکانی پێشودا باسمان کرد لە نەتەوە هەرە کۆنەکانی ناوچەکەیەو پێش نەتەوەی عەرەب و تورك لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاست لەخاکی کوردستانا کەگەلێك لەپانایی ئێستای فراوان و بەرینتر بووە، ژیاوە، بەلام زوڵم و

زۆری دراوسێ و ئیمپراتۆرییەتە نزیك و دوورەکان نەك هەر لەمافی نەتەوایەتی بێ بەشیان کردووە، بەڵکو دەستی کوشت و کوشتارو جانەوەری و چەپاوەڵ و دەربەدەری و زۆر کۆچ پێکردن و لەناوبردنیان تێ وەرداوە کەتا ئەم ساڵانەی دواییش بەڵگە و نیشانەی گومان لێنەکراوی پێوە دیارە.

وە نەبێ ئەو دوژمنە تەماعکارە بێ مروەتانە هەر بەوە داکەوتبن بەڵکو کەسان و ئەم بەش و ئەو بەشی عەشیرەتەکانی گەلەکانی خۆیان بەزۆرو بەخوایشت لە مەڵبەندی کۆنی خۆیانا هەڵکەندوون و لەشوێنی بەشێکی نەتەوەی کوردا، لە بەپیت و بەرەکەت ترین زەوی کوردستانا نیشتەجێیان کردوون و ئەو خاکەیان خستۆتە سەر خاکی خۆیان.

سەرنجێکی وردی لاپەڕەکانی پێشو، ئەو ناوچانە ئەخاتە پێشچاوی خوێنەری بەرێز کەهەزاران ساڵ یاخود تا سەدان ساڵ لەمەوپێش خاکی پاکی ڕەوی نەتەوەی کورد بووە و ئێستا بووە بەپارچەیەك لەخاکی بیانی.

نموونەی دەیان ساڵ و چەندان ساڵیش بە بەڵگە هانینەوە بۆ ڕاستی ئەم بەسەرهاتە تاڵە، زۆر سوك و ئاسانە!!.

ئەوی ڕاست بێ هەڵکەوتی جیۆپۆلیتیکی کەبە دوورو درێژی لەساڵی ١٩٨٦دا بەپێنج ئەڵقە لەگۆڤاری بەنرخی ڕۆشنبیری نوێدا بڵاومان کردەوە، دەستێکی گەورەی لەم بەسەرهاتە تاڵە پڕ ئێشو ئازارو کوێرەوەرییەی نەتەوەی کوردا هەیە.

پەیدابوونی دەوڵەتی هاخامنشی‌یەکان لەسەر ئێسکو پۆسکی ئیمپراتۆرییەتی ماددەکان و بەهێزو توانای سەرکردەو چەك و تفاقی ئەوان خۆیان دامەزران و پتەوو گەورە کرد، دوای ئەوان پەلاماردانی ئەسکەندەرو یۆنانی‌یەکان بۆسەر کوردستان شکستی ئەم لەشکرە و گەڕانەوەیان بەکوردستانا بەڵگەی ڕاستی ئەم باسەیە.

لەم بارەیەوە مامۆستا صالح قەفتان ئەڵێت[٣٢] "جا ئەم (کاردۆخۆ) یانەن کە ڕێگایان لە (کەسەنۆفۆن)ی سەرەك لەشکری ١٠ هەزار سەربازی شکستەی یۆنانی گرت کە بەرۆژهەلاتی تورکیای ئێستادا گەڕابوونەوە هەتا سەر (دەریای ڕەش) جەنگیان لەگەڵ کردبوون لە ٤٠٢پ. م.دا.

ئەم چەرمەسەریەی دەهەزار سەربازی شکستەیە کە (یادداشت)ی حەربی کەسەنۆفۆن نووسیبوی‌و ناوی نابوو (ئانا بازیس) کە گەڕاوەتەوە بۆ یۆنانستان‌و داویە بە حوکومەتی یۆنانی ئەوکاتە".

ئنجا دوای ئەمان پەیدابوونی دوو دەوڵەتەکەی سەفەوی‌و عوسمانی فارس‌و تورك‌و ئنجا شەڕەکانی قەیسەرو تورك‌و ئنگلیزو فەرەنسا و ئەڵەمان‌و ئیتاڵیا کە کوردستان مەڵبەندێکی خوێنینی ئەم شەڕو جەنگانە بوون، شوێنەواری وێرانکاری‌و ڕاوو ڕووت‌و دەربەدەری‌و لەخاکی کوردستان زەوت کردنیان بەدووی خۆیانا بەجێهێشتووە.

هەروەها دوای شکاندنی یەزد جرد کسرای دەوڵەتی ساسانی لەجەنگی قادسییەداو هێرشی لەشکری عەرەبی ئیسلامی تازە کورەی پڕجۆش‌و خرۆش بەدوای شکاندنی لەشکری یەزد جرد بەناو کوردستانا، ئەویش بەشی خۆی کوێرەوەری‌و سەرگەردانی بەسەر نەتەوەی کوردا هانی.

ئەوی ڕاست بێت پێویستە لێرەدا ڕاستی‌یەك بخەینە پێشچاو کە:

یەکەم: نەتەوەی کورد لەپێش ئیسلام دا مافی خۆ هەڵکێشان‌و شانازی ئەوەی هەیە کەخاوەنی ئاینێکی تاکە یەزدان بووە (دين التوحيد) کەئایینی زەردەشت بووە‌و بڕوای بەژیان‌و مردن‌و زیندوبوونەوەی گیان‌و لێ پرسینەوە هەبووە.

بڕوای بەڕوناکی‌و تاریکی هەبووە، خوای گەورە نموونەی خێرو بیری چاکەو ڕوناکی‌و شەیتان-یش نموونەی پیاو خراپی‌و تاریکی بووە. کەمرۆڤ پێویستە سەر بەخوای گەورەو گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی‌و دژی شەیتان‌و کارو کردەوەکانی بێ.

سێ ئامۆژگاری‌یە بەناوبانگەکەی ئاوێستا، کتێبی پیرۆزی زەردەشتیان، ئایینی ئەوسای خەڵکی کوردستان، -بیروباوەڕی چاك، کردەوەی چاك، گفتوگۆی چاك- نیشانەی دیارو بەنرخ‌و بایەخداری ئەم ئاینەن.

ئایینی پاکی ئیسلام-یش کە ناوەڕۆکی لە ئایەتێکی پیرۆزی قورئان‌و وتەیەکی پێغەمبەر محمد درودی خوای لێ بێت ڕەنگ نەداتەوە (الآمر بالمعروف والنهى عن المنكر ومن سلم الناس من يدة ولسانه)

واتا فەرمان کردن بەچاکەو دوورخستنەوەی خراپەو ئەوانەی خەڵکی لەدەست‌و زمانیان پارێزراو ئەبێت.

لێرەدا کە باسی ئاینی زەردەشت ئەکەین و شانازی پێوە ئەکەین چونکە خەڵك و گەلانی تر بت پەرست و دارو دەوەن و ئاژەڵ پەرست و خوا نەناس بوون. ئێمە لەسەر ئاینێك بووین خواشمان ناسیوەو ڕێگای خێرو شەڕیشمان زانیوە. ئنجا بەدوای ئەمدا کە ئاینی ئیسلام بڵاوبۆتەوە، ئاینێکی پاڵاوتەو ڕێك و پێکتر بووە، بەڵام داخی گران ئەوانەی دوای (محمد) درودی خوای لێ بێ بەناوی ئیسلامەوە لەکوردستانا لەشکرکێشیان کردووە وە یا فەرمانڕەواییان کردووە بەشێکیان بەناوی ئاینی پاکی ئیسلامەوە، کەئەم ئاینە پیرۆزە لە کردەوەکانیان بێ بەرییە، لە کاولکاریی و زۆرداریی و چەپاوەڵ و تاڵانکردن درێخییان نەکردووە. لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆڵە دلێرە جوامێرەکانی کورد لەکۆڕی ئاین و زانیاریی و لەشکرکێشیدا ڕۆڵێکی ئێجگار بەنرخ و پڕ شانازییان لەگۆڕەپانی ئاینی ئیسلامدا دیوە.

جگە لە زانا و پسپۆڕو زبانەوان و شارەزایانی زانستی ئاینی ئیسلام، صلاح الدین-ی ئەیوبی کورد زبان و کورد ڕەگەز ئاینی ئیسلامی لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا پاراست.

بەدرێژایی مێژووی ئیسلام جەنگاوەران و جوامێرانی کورد تاجەنگەکانی ئەم دواییەی فەڵەستین لەریزی پێشەوەدا بوون، چ لەتەك لەشکرەکانی سەرجەم ئیسلام یاخود لەتەك لەشکری عەرەب لەپێناوی ئیسلامدا.

# نەتەوە چی‌یەو چۆنە

وەکو لەپێشەوە چەند جارێك بەبۆنەی جۆراوجۆر باسمان کردووە پسپۆڕان‌و زانایانی ئەم بابەتە لەسەر پێناسێکی سنور کراودا یەك نین.

بۆیە ئەبێ بیروڕای ئەوان‌و باری سەرنجی خۆشمان بەوردی‌و پشت بەستو بە وتەی شارەزایان بخەینە بەرباس‌و لێکۆڵینەوە، تاکو شێوەیەکی ڕووناکی بێ گیروگرفت بخەینە پێشچاو، خوێنەر لەسەر لێشێوان‌و ڕاڕایی‌و دوو دڵی دەربارەی نەتەوە ڕزگار بکات.

هەروەها پێویستە نەتەوە لە گەل‌و کۆمەڵە خەڵکێك جوێ بکرێتەوە کە لەهەندێ زبان دا هەریەکەیان بە وشەی تایبەتی ناو ئەبرێن وە لە هەندێ زبان-یش دا بۆ گەل‌و نەتەوە یاخود قەوم‌و نەتەوە تاکە وشەیەك بەکارئەهێنرێت. ئەوەتا خۆمان بەزبانی کوردی، خەڵك‌و گەل‌و نەتەوەمان هەیە کە لامواییە ئەبوایە (القوم) قەوم-یشمان هەبوایە نیاز لەڕەگەزێکە کە هەموو مەرجەکانی نەتەوەی تیا نەیەتە دی وە لە نەتەوە کەمتر یاخود هەر تێکەڵی بیانی نەبووبێ. بەڵام عەرەب هەرچەندە بەچەند واتایەك بەپێی ئایدیۆلۆژییەتی نووسەرەکانیان ئەم وشانە بەکاردێنن لەگەڵ ئەوەشدا (القوم) و (الشعب) و (الجماهیر) و (الامە) یان هەیە.

لە زبانی ئینگلیزی‌دا (*Nation*) نەیشن واتای نەتەوە، گەل، قەوم ئەدات، *National* ناشناڵ واتای (قومی، شعبی، وطنی) تایبەت بە نەتەوە یا گەل ئەدات وە *People* پیپڵ واتای خەڵك، ئەهالی (الناس) ئەدات.

لەبەر ئەوە بەناچاری وشەی قەومی عەرەبی بەواتای ئەو خەڵکانەی بەڕەگەز کوردبن بەکاردێنین، لەو کاتانەدا کەبەلای ئێمەوە کورد هەموو مەرجەکانی

پێکەوەنانی نەتەوەی بۆ نەهاتۆتە دیو پڕ نەکردۆتەوەو لەئێستا پتر ڕەگەزو خوێنی خۆی پاراستووە.

پاش ئەم پێشەکی‌یە کورتە کە دەست ئەکەین بەچوونە ناو باسەکەوە ئەبێ ئەو بۆچوونە بخەینە پێشچاو کەلامان وایە گەل بەچەند مەرجێکی پالاوتە یاخود هەندێکی با لە گەلاڵە بوون-یش دابێ ئەبێ بە نەتەوە، بەلام هەربوونی گەل بەبێ مەرجەکانی نەتەوە، دەوڵەتی هەبێ یاخود بێ دەوڵەت بێ، نەتەوەی لێ پێك نایەت.

بۆنموونە گەلی عێراق و گەلی ئێران و گەلی تورکیا و گەلی سویسراو گەلی جارانی سۆڤیاتی هەریەکەیان نەتەوەدیەك نین، بەڵکو هەریەکەیان لەچەند نەتەوەیەکی یەکگرتوو پێك هاتوون.

ئێستا یەکێتی سۆڤیاتی جاران بەپێی بنچینەی نەتەوایەتی بوون بەچەند دەوڵەتێکەوە.

کەواتا ئەبێ مەرجەکانی نەتەوایەتی چی بن؟

بە باشی ئەزانین هەموو ئەو مەرجانەی پسپۆڕان و زانایانی سیاسی و کۆمەلایەتی تاك تاك و لە دوو مەرج و زیاتر باسیان کردووە بیانخەینە پێشچاو، کۆمەڵگا و خەڵکی کوردستان-یش لەتەکیانا واتا لەتەك ئەو مەرجانەدا بەراورد بکەین.

١-ڕەگەز *Race*

هەندێ لەمانەی باسمان کردن ڕەگەز بەمەرجی سەرەکی پەیدابوونی نەتەوە ئەزانن. خۆ ئەوانەی کوێرانە سەیری نەتەوایەتی ئەکەن ڕەگەزیان خستۆتە ژوور هەموو مەرجێکی ترەوە، لەدوای ڕەگەزی خۆیان هەموو ڕەگەزێکی تر بەخوار دەستەی خۆیان لەقەڵەم ئەدەن. تا ئەو ئاست و ڕادەیەی هەر قێزیان لەهەندێ ڕەگەزی تر ئەبێتەوە.

نازی‌یەکان پێشەنگی ئەم بیروباوەڕە بوون و بەم چەکە ناپاکە دوژمنایەتی ڕەگەزەکانی تریان ئەکرد و ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆژییەتەکەشیان هەر بۆ ژێر دەستەکردن و داگیر کردن و چەوسانەوەو دۆشینی گەلان و نەتەوەکانی تری سەرزەمین بوو.

وە نەبێ ڕەگەز هیچ پایەو سەرچاوەی ماددی لەم سەرزەمینەدا نەبێت، بەڵام لە باسکردنی ڕەگەزدا پێویستە دوو خاڵی گرنگ بخرێتە ڕوو:

یەکەمیان هیچ نەتەوەیەك نییە لەم سەر زەمینەدا پاڵاوتەی یەك ڕەگەز بێت و تێکەڵ بەهیچ ڕەگەزو گەل و نەتەوەیەکی تر نەبوو بێت، یا زۆربەی زۆریشی سەر بەڕەگەزێکی تایبەتی بن.

دووەمیان هیچ ڕەگەزێك نییە لەهەموو ڕوویەکەوە باڵادەست بێ بەسەر ڕەگەزێکی تردا. ڕاستە هەندێ نەتەوە لەکۆڕێکی ژیان دا سەبارەت بەهەڵکەوتی جوگرافیایی و ئاووهەواو مێژووی تایبەتی و هەندێ مەرجی تر لە بابەتێکی دەست ڕەنگینی یا پیشەسازی یا کشتوکاڵی یاخود بارێکی تری ژیان دا بەچەند هەنگاوێك پێش نەتەوەیەکی تر کەوتوون، وەکو نەتەوەی ژاپۆن کە لە ڕەگەزی زەردەو، بەلای نازییەکانەوە پلە سێی ئادەم زادن، ئەوەتا لەزانست و تەکنۆلۆژیادا لەڕیزی هەرە پێشەوەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دان. ئەمە جگە لەوەی لەکۆڕی ئابوری دا گرەویان لەسەرجەم دەوڵەتانی ئەم جیهانەمان بردۆتەوە.

ئەوی ڕاست بێ ڕەگەز لە مەرجەکانی تری پەیدابوونی نەتەوە کێشەو بەرەی زیاتری بەدواوەیەو گەلێك پتر لەوانی تر لێی کۆڵراوەتەوەو دۆست و دوژمنی بۆ پەیدابووە، هەرچەندە دوژمنەکانی فرەو دۆستەکانی کەمن!.

بەلای ئێمەوە هەروەکو لەپێشەوە وتمان خاکی ئێستای کوردستان کە لەوەبەر گەلێك لەئێستا پان و بەرینتر بووە هەر لەئادەم زادی نیاندەرتاڵی پێش ئادەم زادی ژیر (العاقل)-ەوە تائەم خەڵکەی ئێستا پێکەوەن تێیدا ئەژین.

لەم ماوە مێژووییە دورو درێژەدا کە لە دەیان هەزار ساڵ تەمەنی پترە، جگە لەخەڵکەکەی خۆی، هەر ئەوەی لەلاپەڕەکانی مێژوودا نووسراوە دوو شەپۆلی زۆر گەورەی کۆمەڵانی ئاری زبان و ئاری ڕەسەن ڕوویان تێکردووەو تێیدا حەواونەتەوە. ئنجا ئەو کۆمەڵە زۆرانەی بەدەم شەڕو داگیرکردنەوە لەیۆنان و ڕۆمان و تورك و فارس و مەغۆل و ئەفغانی و عەرەب ڕوویان تێ کردووەو گەلێکیان تێدا ماونەتەوەو لەخاکی کوردستانا ئامێتەی گەلەکەی بوون، لەناو ئەوانەی پێشوودا تواونەتەوەو زبان و خوو ڕەوشت و مێژووی نەتەوەکانی خۆیان لەبیرچۆتەوەو بوون بە پارچەیەك و نەتەوەی کوردیان پێك هێناوە.

هەروەکو زۆربەی زۆری ئەوانەی لەخاکی کوردستانەوە دەربەدەرکراون و لەناو فارس و تورك و عەرەب دا بڵاوبوونەتەوە زبان و ڕەگەزی خۆیان لەبیرچۆتەوە و بوون بە بەشێك لەو نەتەوانە.

لەگەڵ ئەم ڕاستی‌یانەشدا نەتەوەی کورد، نەتەوەیەکی هەڕەمەکی نی‌یە، بەڵکو زۆربەی زۆری سەربە سەرچاوەیەکی ڕەگەزو زبان و مێژو و خوو ڕەوشت و نەریتێکی تایبەتی‌یە، وە لایەنە هەرە کەمەکەی سەر بەگەلانی دراوسێ‌یەو لە بەشە هەرە زۆرەکەیدا تواوەتەوە.

ئەوی ڕاست بۆ هەرچەندە ڕەگەزمان کرد بەخاڵێکی سەربەخۆ، بەڵام پەیوەندییەکی توندو تۆڵی بەمێژووی ناوکۆیی (التأريخ المشترك)-ەوە هەیە، کەمێژووی ناوکۆیی کە مەرجە سەرەکی‌یەکانی پەیدابوونی نەتەوەیەو لەخاڵێکی تری سەربەخۆدا باسی ئەکەین.

لەگەڵ ئەم باسکردنەوەی سەرەوەیشدا، هەر بۆ پتر شارەزا بوون لەڕووی بیروباوەڕو یاساناسی‌یەوە باسی هەندێ بیروباوەڕی شارەزایانی ئەم لایەنە ئەخەینە بەرچاو:

لەم بارەیەوە باسی بیروباوەڕەکانی عەرەب پەروەر ساطع الحصري ئەکەین کە یەکێکە لە عەرەبە هەرە بەناوبانگەکان، بەکوڵ و بەدڵ باسی قەومییەت و نەتەوەی عەرەب و مەرجەکانی پەیدابوونی قەوم و نەتەوەی عەرەبی کردووە.

بەلای ساطع الحصري‌یەوە دوو خاڵ مەرجی پێکەوەنانی نەتەوەن کەئەم دوو خاڵە، خاڵێکی تر دێننە کایەوە، یەکەم و دووەم زبان و مێژوون و خاڵی سێ‌یەم ڕۆشنبیری و یەکێتی بیروڕای دەروونی‌یە واتا (الثقافه والحالة النفسيه المشتركه).
ساطع الحصري زۆر دوژمنی ڕەگەزو خوێنەو ئەڵێت هیچ نەتەوەیەك بەڕەگەزو خوێن نابێت بەنەتەوە، چونکە ئەم مەرجە هەرگیزاو هەرگیز نایەتە دی، وە هەموو نەتەوەکانی جیهان لەکۆمەڵە ڕەگەزو خوێنی جۆراو جۆر پێك هاتوون و زۆر بەتوندی ئەچێت بەگژ پسپۆڕانی ئەم ڕێبازەدا.

ئەوی ڕاست بێ ئەگەر ساطع الحصري وەکو ئاوا دوژمنی ڕەگەزایەتی و ڕەگەز پەرستی‌یە خۆشی لەئەك گەلان و نەتەوەکانی دراوسێی عەرەب وابوایە، ئەوا ئەبوو مرۆڤ بەهەردوو دەست چەپڵەی ئافەریقی بۆ لێ بدات، بەڵام کەباسی پێکەوەنانی

نەتەوەی عەرەب ئەکات، ئەم بیروڕایانەی خۆی دەربارەی ئەو نەتەوانەی کەوتوونە ژێر دەستی عەرەبەوە لەبیر ئەچێتەوەو وەکو تیمساح و ماسی قرش دەمیان بۆ ئەکاتەوە تاکو بەئاسانی بێ دەنگ و سەنگ قوت بدرێن.

ئەوەتا زۆر بەشانازییەوە ئەڵێت[٣٢] "زبانی عەرەبی پێش پەیدا بوونی ئیسلام هەر لەدورگەی عەرەب و قەراغ و بیجاخی هەندێ وڵاتی دراوسێدا بوو.

بەڵام بڵاوبوونەوەی ئەم زبانە ناوبراوە لەهەموو بەشەکانی جیهانی عەرەبی ئێستا بەهۆی (فتوحات)ی عەرەبی لەژێر ئاڵای ئیسلام دا هاتە دی.

بەشی زۆری عێراق و شام وە هەموو لاکانی ئەفەریقای باکور لە میسر و سودانەوە تا ئەوپەڕی ڕۆژئاوا (المغرب الاقصى) عەرەب نەبوون و پاش ئیسلام نەبێت نەکران بەعەرەب.

مێژوونووسان و نووسەران کە مێژووی ئیسلامیان نووسیوەتەوە وەکو پێویست گوێیان نەداوەتە (خەڵکی بەعەرەب کردنەکان)، هەر باسی دەست بەسەرا گرتنەکانیان کردووە (الفتوحات)و هەندێ ڕووداوی سیاسی کەبە دوایانا هاتوون، بێ ئەوەی وەکو پێویست گوێ بدەنە مەسەلەکانی بەعەرەب کردن (اسقراب)ی وڵاتە دەست بەسەرا گیراوەکان".

وە لەسەر باسەکەی ئەڕوات و ئەڵێت "ڕاستییەکەی عەرەب لەپێش ئیسلام-یش دا هەر ڕوویان کردۆتە وڵاتە دراوسێکان.... بەڵام ئەو قەبیلە عەرەبییانەی لەچاخەکانی پێش ئیسلام دا دورگەیان بەجێ هێشتووە، هیچ پەیوەندییەکیان بەنیشتمانی پێشوویانەوە نەماوەو بەزنجیرەیەك گۆڕان و ڕووداو، ڕابوردووی خۆیان لەبیرچۆتەوەو لەناو دانیشتوانی ئەو وڵاتەی بۆی چوون تواونەتەوە.

بەڵام ئەو شەپۆلە خەڵکەی لەدورگەی عەرەبییەوە پاش ئیسلام دەرپەڕین، جیاوازییەکی گرنگیان لەتەك پێشووەکانیانا هەبوو. ئەویش پەیوەندی لەتەك سەرچاوەی پێشویدا نەپچڕی بەڵکو زۆر بەتوندی پارێزگاری پەیوەندی ماددی و دەروونی لەتەك پێشوویدا پاراست، جگە لەوە توانی لە دانیشتگای نوێیدا زبانەکەی بڵاوبکاتەوە وە دانیشتوانی بەشێکی فراوانی وڵاتە دەست بەسەرا گرتووەکان (البلاد المفتوحه) بەتەواوەتی بکات بەعەرەب.

ساطع الحصری لە باسێکی پەیدابوونی نەتەوەی عەرەب دا لەبەگژاچوونی ڕەگەزو خوێن دا ئەڵێت "ئێمە ئەرەرمانە ڕەگەزو خوێن بکەین بەمەرجی بوونی نەتەوە، چونکە وەکو باسمان کرد بەشی زۆری عێراق و شام و هەموو ئەفەریقای باکور لەمیسرو سودانەوە تا ئەوپەڕی ئەفەریقا پاش ئیسلام نەبێت نەکراون بەعەرەب".

نەتەوەی کورد سەبارەت بەوەی لەسەرەتای سەدەی بیستەوە وەکو نەتەوەکانی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی و ناوەڕاست و شان بەشانی ئەوان مەرجەکانی پێکەوەنانی نەتەوایەتی تێدا بەدی کراوەو وردە وردە بەهێزتری کردوون، لەبەر ئەوە پێویستی بەوە نی‌یە وەکو هەندێ نەتەوەی تر کەخۆیان بەچەند نەتەوەیەکی تر ناوساندووە، پەنابەرێتە بەرمەرجێك و دوو مەرج لە کۆڕی پێکەوەنانی نەتەوایەتیدا. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە هەموو بیروڕایەکی جۆراوجۆر دەربارەی هەموو لایەنەکانی باسەکە بخرێتە ڕوو بۆیە ئێستا لەڕووی دەستورو یاساوە لەم باسە ئەدوێین.

ئەم باسە چمکێکی پەیوەندی بەپێناسنامە (الجنسیە)وە هەیە واتا کەسێك لەهەر ولاتێك دا چۆن بەکەسێکی هاوولاتی ئەناسرێت و ئەبێ خاوەنی چ مەرجێك بێ تاکو لە ماف و فرمانی ولاتەکەیدا وەکو یەك بەشدار بێت.

لەم بارەیە هەندێ پسپۆرانی ئەم بابەتە لایان وایە کە نەتەوەو دەوڵەت پێویستی یەکترین، بەتایبەتی ئەگەر دەوڵەت نەبێت نەتەوە پێك نایەت.

بەلام پێش ئەوەی بچینە باسەکەوە ئەبێ ئەو ڕاستی‌یە بخەینە ڕوو کە نەتەوە لەوانەیە هەبێت جارێ بەدەوڵەت دامەزراندن نەگەیشتبێ، یاخود نەتەوەیەك خاوەنی دەوڵەت بێ و دەوڵەتێکی تری داگیرکەر، دەوڵەتەکەی ڕوخاندبێ، ئەم نەتەوەیە بەمە لە نەتەوایەتی ناکەوێت بەڵکو هەوڵ و تەقەللا ئەدات داگیرکەرەکە لە ولاتەکەی دەربکات و دەوڵەتە سەربەخۆکەی خۆی دابمەزرێنێتەوە.

ئەم جۆرە ڕووداوە لەمێژووی نەتەوەکانی جیهاندا نموونەی دوور و نزیکی زۆرە. وەکو نەتەوەی پۆڵەندی کە چەند جارێك دەوڵەتەکەی تێك و پێك دراوەو خۆشی پارچە پارچە کراوە، بەلام لە ئەنجامدا تێکۆشاوەو دەوڵەتەکەشی دامەزراندۆتەوەو خۆشی لەپارچە پارچەکردن ڕزگار کردووە.

نەتەوەی ئەڵمان-یش لەجەنگی دووەمی جیهانیدا بوو بەنموونەی ڕووناکی ئەم باسەمان، لەلایەکەوە دەوڵەتە سەربەخۆکەی ماودیەك لەدەست چوو، وە لە لایەکی

تـردوه بـوو بـەدوو پارچـاوه، پارچەیـەکی بـۆ یـەکێتی ئـەڵمانیای ڕۆژئـاوا (المانیـا الاتحادیـه)و پارچەکەی تری، بوو بە ئەڵمانیای دیموکراتی، بەڵام لە ئەنجامدا هەردوو پارچەکە لەیەك کۆماری بەکگرتووی سەربەخۆدا یەکیان گرتەوە.

باسەکەی ئێستامان لـەڕووی دەسـتووری‌و یاسـاییەوە دەربـارەی ئـەو نەتـەوەو گەلانەیە کە یەکێکیان بەتەنیا یاخود چەندێکیان بەیەکەوە دەوڵەتێکیان هەبێت.

ئێمـە لێرەدا باسـی دوو جـۆر پێناسـنامە ئەکـەین. یـەکێکیان لەسـەر بناخـەی خوێن یاخود ڕەگەز ئەدرێت‌و ئەوی تریان لەسەر بناخەی نیشتمان‌و خاك. ئەمە جگـە لـەوەی دەوڵـەت هەیـە زۆربـەی زۆری دانیشـتوانی یـەك نەتـەوەن‌و دەوڵـەت هەیـە دانیشـتوانەکەی لەچـەند نەتـەوەو گـەلێك پێـك هـاتووە. مەسـەلەی پێناسـنامە (الجنسیه)ی تاکە کەس (الفرد) لە دەوڵەتدا دیسانەوە پەیوەندی بە دیموکراتییەت‌و دیکاتۆرییەتی کار بەدەسـتانی دەوڵەتەکـەوە هەیـە. چونکـە دەسـتوورو یاسـای هـەر دەوڵەتێك ڕەنگدانەوەی ئایدیۆلۆژییەتی بەڕێوەبەران‌و کاربەدەستانی دەوڵەتەکەن.

لـەتورکیای کەمالی‌دا لـە پێناسنامەکەیانا، تـورك‌و کـورد‌و ئەرمـەنی‌و عـەرەب‌و یۆنانی‌و هاووڵاتیانی تری ئەم وڵاتەدا ئەنووسرێت تورك، واتا ئەمانە نەوەی قـەومی تورکن‌و خوێنی تورك لە دەمارەکانیاندا ئەگەڕێت!!.

کەچی لە وڵاتی سویسراو ئەمەریکا خوێن‌و ڕەگەزی هیچ نەتەوەو گەلێك بەسەر کەسـانی گەلـە پێکـەوە ژیاوەکـانی ئـەم دوو وڵاتـە نـە بـەزۆرو نـە بەخوایشـت ئەسەپێنرێت.

لەلایەکی تریشەوە هەندێ دەوڵەت هەن دژی تێکەڵ بوونی گەلەکانیانن بەڕۆڵەی گەلانی ترەوە بۆیە دەرگای پێناسنامە (التجنس) دائەخەن، یاخود ناوبەناو بەئاستەم بۆ ماوەیەکی کەم دەرگا ئەکەنەوە.

دەوڵـەتی واش هەیـە پێویسـتی بەدەسـتی کرێکـارو زانایـان‌و پسـپۆڕان‌و شـارەزایان هەیە، بۆیـە هەمیشـە دەرگـای لەسـەر پشـتە، بەچـەند مـەرجێکی ئاسـان، هاووڵاتیـانی بیـانی لای خـۆی وەرئـەگرێت. وە لەماوەیـەکی کـەمدا هـەموو مـافێکی هاووڵاتێکی کۆنی خۆی پێ ئەبەخشێت.

پێناسنامە (الجنسیه) واتای هاووڵاتێتی‌و ناشنالێتی *Nationality* ئەگەیـەنێت. دەوڵەتان بەم پێناسـنامەیە هاووڵاتیانی خۆیـان لەیـەکتری جیائەکەنـەوە، لەهەندێ

وڵاتدا کەسانی نەتەوەیەک ئەبن بەبناخەو لەهەندێ وڵاتانی تردا هەر هاووڵاتی‌یەک لەژێر سێبەری ئەو دەوڵەتە بژی بێ ئەوەی ناوی نەتەوەیەکی بەسەردا بسەپێنرێت پێناسنامەکەی پێ ئەدرێت.

لە سێبەری ئیسلامدا خاوەنێتی ئاینی ئیسلام ئەبوو بەبناخە بۆ دەستکەوتنی ئەم مافەو ئێستاش هەر ئەبێ وابێ.

"[٢٤]پێناسنامە بەپێی واتای تازەی دوای شۆڕشی فەرەنسا هاتە کایەوە، بەتایبەتی لەکۆتایی سەدەی هەژدەیەمین دا لەئەنجامی پەیدابوونی دەوڵەتی نوێو دەست گرتنی بەسەر سەروەرێتی‌یەوە هەروەها بەهێز بوونی گیانی ڕزگاری هێنەرو بزوتنەوەی قەومی، لەئەنجامی ئامۆژگارییەکانی نووسەرو فەیلەسوف و سیاسەتمەداراندا وەکو کافور لە ئیتاڵیاو بسمارک و فتشە لەئەڵەمانیاو مونتسکیۆو ڕۆسۆ لە فەرەنساو کەسانی تر لە ئەوروپادا".

پێناسنامە وەکو لەکتێبە یاساییەکانا باسکراوە، ئەو پێوەندییە سیاسی و یاسایی‌و دەروونی‌یەیە، لەنێوان تاکە کەس‌و دەوڵەت دا کەماف و ئاڵوگۆڕکردنی لەیەکتری پرسینەوەی لێ ئەوەشێتەوە.

لێرەدا هەر ئەوەندە دەربارەی ئەم باسە ئەخەینە پێشچاو کە بەگشتی لەسەر دوو بناخە پێناسنامە ئەدرێت.

لەم بارەیەوە دوکتۆر ممدوح عبدالکریم حافظ ئەڵێت[٢٥] "پێناسنامە یا ڕەسەن (اصلی) یا دەستکەوتە (مکتسب) ئەبێ". وە لە پێناسنامەی ڕەسەن دا *Imposed*
*Nationlity On Nationlity at Birth* ئەڵێت "ئەو پێناسنامەیەیە کە بۆ مرۆڤ ساغ ئەکرێتەوە هەر یەکەمجار لە کاتی لە دایک بووندا ئەمەش یا بەهۆی ڕەسەنی خێزانەوە (اصله العائلی) یا سەبارەت بەپەیوەندی بەو هەرێمەی تیا لەدایك بووە، بۆیە پێی ئەوترێت پێناسنامەی ڕەسەن یا پەیوەست بەسەرچاوەیەوە . وە پێشی ئەوترێت پێناسنامەی سەپێنراو (المفروضە) چونکە لەلایەن دەوڵەتەوە ئەبەخشرێت و دیسانەوە پێی ئەوترێت پێناسنامەی لەدایك بوون. چونکە بەهۆی لەدایك بوونەوە لەکاتی هاتنە دنیاوە دەست ئەکەوێت.

پێناسنامەی ڕەسەن ئەوەیە کە مرۆڤ یەکەمجار لەژیانیا دەستی ئەکەوێت، وە ئەو بناخەیەی کەبەپێی ئەوە پێی ئەبەخشرێت یا لەسەر بنچینەی مافی خوێن

(الـدم) یـاخود لەسـەر مـافی هـەرێم (الاقلیـم) دائـەخرێت. ڕەنگـە بـەپێی هـەردوو بنچینەکەش بێت".

ئا لێرەدا بەپێی ئەو دەوڵەتانەی کەزۆربەی هەرە زۆری گەلەکەیان نەوەی یەک نەتەوە بن و حەز بەوە نەکەن گەلەکەیان ببێت بەگەلە هەڕەمە، ڕەنگە مرۆڤ ئەوەندە بۆئەوە نـەچێت کـە کاربەدەسـتانی دەوڵەتەکـە پشـتیان بـە ئایدیۆلۆژییـەتی ڕەگـەز پەرستی بەستبێ.

بـەڵام ئـەو دەوڵەتانـەی کـەفرە گـەل و نەتـەوە بن پێناسـنامە ببەسـتێ بـەخوێنی نەتەوەکەیەوە، گومان لەوەدا نامێنێت کە ڕەگەز پەرستی‌یان کردووە بەبناخـەو پێوەر وەکو لەپێشەوە باسمان کرد.

# ئاین و نەتەوە

پێش ئەوەی هۆشی نەتەوایەتی و نەتەوە بەم شێوە زانستییەی ئێستا لەناودایە، بەتایبەتی کە لە سەدەی نۆزدەیەمینەوە بەڕوونی دەست پێ بکات و تا بە پالاوتەیی بەم ڕۆژەی ئێستامان بگات.

پێش ئەمە لەجیهان دا بەتایبەتی لەنێو مەسیحیان و موسولمانان، مەسەلەی ئاین لەناودا بوو.

نیازی ڕاستی فەرمانڕەوایان و دەسەلاتدارانی ولاتان هەرچییەك بوو بێت، هەر ئاین-یان کردو بەچەترو لەژێر سایەو سێبەریا فەرمانڕەواییان کردووەو ئامانجەکانی خۆیان بەناوی ئاینەوە بردووە بەڕێوە.

بۆیە ئیسلام تاجەنگی یەکەمی جیهانی بالی خۆی کێشا بوو بەسەر هەموو ولاتە ئیسلامی‌یەکانداو بەناوی‌ئیسلامەوە جارێك و بەناوی ئاین زایەکی ئیسلامی‌یەوە جارێکی تر ولاتانی ئیسلام ئەبرا بەڕێوە. وە بۆ پتەوکردنی ئەم ڕێبازە نەتەوەی ئیسلام بەبێ جیاوازی قەوم و گەل کرابوو بەچەکی ئایدیۆلۆژی ئەم ڕێبازە.

بۆیە دەسەلاتدارانی دەولەتە ئیسلامی‌یەکانی ئەو کاتە چەندیان لەباردا بوایە بەکاریان ئەهانی لەپێناوی خەفەکردنی هەست و هۆشیاری قەومیدا.

گەلە دەسەلاتدارەکەی دەولەتێکی ئیسلامی یاخود ئیمپراتۆرییەتێکی ئیسلامی کە بەناوی ئیسلامەتی‌یەوە هێزو توانای خۆی لە گەلە ئیسلامی‌یەکانی نێو قەوارەی ئەو دەولەتە یاخود ئەو ئیمپراتۆرییەتە هەل ئەهێنجا، کەچی لەژێر پەردەی ئایدیۆلۆژی بەڕوالەت ئیسلامەتی‌یەوە گەلە ئیسلامی‌یەکانی تری ژێر دەستە ئەکرد. ئەمە جگە لەوەی کە گەلانی ئەوکاتە دەسەلاتدارو بێ دەسەلات، نیاز لە سەدە کۆنەکانی پێش بزوتنەوەی قەومی‌یە، هەستی ئاینیان لەهەستی قەومی بەهێزتر بوو.

زۆر کورد هەن گلەیی تاڵو ترش لە (صلاح الدین)ی ئەیوبی کورد ڕەگەزو کورد زبان ئەکەن کەبۆچی خەباتی خۆی ئاراستەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی نەکردووەو خۆی بەئیسلامو ئیسلامەتی یەوە خەریك کردووە؟

وەڵامی ئەم پرسیارە هەر ئەوەیە کە ئەوکاتەی (صلاح الدین)ی ئەیوبی تێیدا ژیاوەو لەنێو بارودۆخی ئەو گۆڕەپانەی ئەو تێیدا هەڵسوڕاوە، هەستی نەتەوایەتی چەکی دەستی سەرکردەکانی ئەو کاتە نەبووە، نە لەنێو گەلانی ئیسلامیو نە لەنێو ڕیزی ئاینەکانی تری سەرزەمیندا.

دەنا هەر مۆڵەتی (صلاح الدین)ی ئەیوبی یان نەئەدا لەو پایە بەرزەدا دانیشێت!. هەروەکو وڵاتانی مەسیحی ئاین لەسەر بنچینەی ئاینی مەسیحی ئەبران بەڕێوە.

گەڵ جار نەك سەرجەم ئاینێك بەڵکو لکێکی ئاینێك وەکو سوننی یاخود شیعە یا کاثۆلیکیو پرۆتستانتیو ئارثۆذۆکسی بوون بە ئاڵاهەڵگری بزوتنەوەیەکی گەلێك یاخود چەند گەلو ناوچەیەك.

بوونی ئیمپراتۆرییەتی سەفەویو ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەنێو ئاینی ئیسلامدا کە یەکەمیان دەستی بە ئاین زای شیعەو دووەمیان بە ئاین زای سوننی یەوە گرتووە ڕێگای ئەم بۆچوونەمان بۆ روون ئەکاتەوە.

هەروەها لەدنیای مەسیحیان-یش دا روسیای قەیسەری ئارثوذوکسی ئیتاڵیای کاثولیکیو بەریتانیای پرۆتستانێتی هەرنیشانەی ئەم ڕێڕەوەن.

زۆرجار گەل-ێك بۆخۆپاراستنو خۆبەهێز کردن، توندو تۆڵ دەستی بەئاین یاخود ئاین زایەکەوە گرتووەو کردویەتی بەقەڵخانی پارێزگەری خۆی وەکو یۆنانی ئارثوذوکسیو ئێرانی شیعە.

جارێك لەساڵی ١٩٦٤دا لە( شیخ الاسلام)ێکی فارسی-م پرسی، ئێوە لە نەوەی فارسن هۆی چی یە بەم توندو تیژی یە دەستتان بە شیعایەتی یەوە گرتووە؟ لە وەڵامدا وتی تاکو خۆمان لەعەرەب بپارێزین، ئەگەر ئەم ڕێگایەمان هەڵنەبژاردایە لەناو عەرەب دا ئەتواینەوە!!.. بیروڕای ئەم( شیخ الاسلام)-ە فارسی یە هەر چەندێك ئامانجی نەتەوایەتی فارسی پێکا بێت، بەشێکە لە خەباتی ئایدیۆلۆژی ئەم نەتەوەیە لە کۆڕی پاراستنی نەتەوایەتی فارسیدا.

هەروەها نەتەوەی یۆنان و هەندێ نەتەوەی تر ئاین و ئاین زایان کردووە بەبەشێك لەخەباتی نەتەوایەتی خۆیان.

بەلأم دەربارەی کوردو کوردستان بەدرێژایی مێژوو جگە لەخودا پەرستی و جێبەجێکردنی فرمانی ئایینی، نەتەوەی کورد ئەوەندە مەرجەکانی نەتەوایەتی تێروپڕو هەستی قەومی لە ئاستێکی بایەخداردا بووە، پێویستی بەوە نەبووە ئاین بکات بەچەکی دەستی لەکۆڕی سیاسی و ئابوری‌دا یاخود بە هۆی ئاینەوە گەلانی تر بکات بە کوردو خاکی کوردستان پان و بەرینتر بکات بەڵکو بەپێچەوانەی ئەمەوە گەلانی تر بەگەلی کورد ژمارەی خۆیان زیاترو بەخاکی کوردستان خاکی خۆیان پان و بەرینتر کردووە.

لەبەر ئەوە بەدەگمەن بەرچاوئەکەوێت پیاوێکی ئایینی کورد، هەر ئاینێکی هەبوو بێت، بەکاری هێنابێ لەپێناوی رەگەز پەرستی دژی نەتەوەو و گەلانی تردا.

لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی پیاوە ئاینیەکانی کورد چ ئەوانەی بوون بە موسوڵمان یاخود لەوەبەر زەردەشتی و مەسیحی بوون یاخود لەسەر هەر ئاینێك لەم ئاینانە بووبن لەپاڵ ئایندارى خۆیاندا کوردیان لەبیرنەچۆتەوەو لەتەك بەدەست هێنانی رەزامەندی خودادا هەوڵی پاراستنی مافە رەواکانی کورد-یشیان داوە.

رۆڵی پیاوانەو مەردانەی پیاوە ئاینیەکانی کورد لەسەرەتای بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردا واتا دوای سەدەی نۆزدەیەمینی زایینی لەکۆڕی شیعرو وێژەو نووسین و مێژووی کوردو کوردستانا لاپەڕەیەکی رووناکی ئەم رێبازەیە.

خۆ رابەرایەتی کۆنی پیاوە ئاینیەکانی کورد لەجەژنی نەورۆزی نەتەوایەتی کورد بەکاشی نووسینەوەو سەیران کردن، سەرەڕای پڕوپاگەندەی بیانی‌یەکان کە نەورۆز جەژنی ئاگرپەرستانە، بەڵگەو نیشانەی گومان لێنەکراوی کردەوەی نەتەوە خوازی ئەم پیاوە ئاینیانەی کوردە.

ئەبێ لەکۆڕی ئەم باسەدا ئاماژە بۆ بزوتنەوەی هەندێ لەپیاوە ئاینیەکانی گەلانی ئیسلامی تر بکەین کە ئاینیان کردووە بەمەرجی پێکەوەنانی نەتەوە وە سەرجەم گەلانی موسوڵمانی جیهان لەهەر رەگەزو قەومێك بن بەیەك نەتەوەی ئیسلامیان لەقەڵەم ئەدەن، وە ئەم بیروڕایە لە هەندێ ولأتانی ئیسلامی لەم ساڵانەی

دواییدا تاوی سەندووەو پەردەیەکی داوە بەسەر هەموو ئایدیۆلۆژییەتێکی تر داو لەهەندێ وڵاتانی تردا وردە وردە بەرەو هەمان ئەندازە پەرە ئەسێنێ.

وە نەبێ ئەم ئایدیۆلۆژییەتە، یاخود ئەم بزوتنەوە فیکرییە بێ بناخەو پایە بێت، بەڵکو هەندێکیان پایەی قایمو بەخاکا چوویان هەیە. ئەوی راست بێ ئەم رێبازە ئەبێت بە دوولکەوە. لکی یەکەمیان لەسەر بناخەیەکی کاتیو لەئەنجامی چەند هۆیەکی تایبەتی کە بەندن بەسەرجەم رەوتی بزوتنەوەی سیاسیو نەتەوایەتی( گەلێ) کەوە دامەزراوە. ئەم لکە لامان وایە تەمەن کورتو بێ ئەنجام ئەبێت. لەزۆر وڵاتی ئیسلامیدا بزوتنەوەکانی سیاسی چەپڕەوو قەومیو دیموکراتی نەیانتوانیوە رژێمە دیکتاتۆرییەکانی وڵاتەکانیان لەناو بەرنو رژێمێکی سۆشیالیستی یا دیموکراتی یا نەتەوایەتی ئازادی خوازانە لەشوێنەواری ئەو رژێمانەدا دابمەزرێنن. لەلایەکی ترەوە رژێمە دیکتاتۆرییەتەکان بەئاگرو ئاسنو بێ رەحمانە بزوتنەوە سیاسییەکانیان لەکارکردن خستووەو سەرکردەکانیان لەناو بردوونو دەربەدەرکردوون. بۆیە هیچ رێگایەك نەماوە تا ئازادیخوازانی ئەو گەلانە پەنای بۆبەرن، رێگای ئاینو خودا پەرستی نەبێ کە بەراستی چەکێکی کاریگەری کوشندەیە دژی دوژمنانی ئەو گەلانە.

بەڵام تەمەنی ئەم بزوتنەوە ئاینیانە بەندە بە رژێمە دیکتاتۆرییە دوژمن بە گەلەکانەوە، کەی ئەم جۆرە رژێمانە لەکۆڕی کارکردنو فەرمانڕەوایی لەپێشە هەڵکێشران، بەرەبەرە ئەم بزوتنەوە ئاینیانەش لەدڵی خەڵکیدا سارد ئەبنەوەو ئاین ئەبێتە پەیوەندییەکی پیرۆز لەنێوان کەسو پەروەردگاردا بەس.

بۆ پاراستنی ئاین لە تۆمەتو لەکە، وە بۆ رزگارکردنی لە نۆباڵی نەشارەزاییو لە رێلادانی سەرکردەکانی بزوتنەوە ئاینییەکان وە سەبارەت بەوەی جیهان رۆژ بەرۆژ بەرەو پێشتر ئەڕواتو کێشەکانی زیاترو چارەکردنی ئەم کێشانە گرانترو فرە لکتر ئەبێ واچاکە نۆباڵی چارەسەرکردنی مەسەلە سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیرییەکانی هیچ گەلێك نەخرێتە ئەستۆی ئاین.

بەڵکو ئاین ئەو پەیوەندییە پیرۆزە بێت کەفرمان بەهەموو کەسێك ئەکات چاکە بکاتو لەخراپە دووركەوێتەوەو زەرەرو زیان بەکەسێکی تر نەگەیەنێت: (الامر بالمعروف و النهی عن المنکر)

لەم كۆڕەدا بیروڕای دژی عەرەب پەروەرو خاوەنی بیروڕای قەومی و نەتەوایەتی کۆن و نوێ ساطع الحصری و دوکتۆر منیف الرزاز دەربارەی نەتەوەی عەرەبی و ئیسلام ئەخەینە ڕوو:

ساطع الحصری ئەڵێت[٣٦] "ئەگەر بەگشتی چاوێك بخشێنین بەمێژوودا، وە دەستی ئاینەکان لە پێکهێنانی یەکێتی یە سیاسی یەکاندا بخەینە بەردەم، ئەبینین کە ئاینە جیهانی یەکان تەنیا لە سەدەکانی ناوەڕاستداو بۆ ماوەیەکی کەم و لە گۆڕەپانی سنورکراودا نەبێ نەیانتوانیوە ئەو گەلانەی بە زبانی جۆراوجۆر ئەدوێن یەکبخەن.

ئەو یەکێتی یە سیاسی یەی کەنیسەی مەسیحی هەوڵیدا پێکی بهێنێ نەیتوانی کاتێك جیهانی ئارثوذوکسی لەتەك جیهانی کاثولیکی دا کۆبکاتەوە. هەروەکو ئەو یەکێتی یە سیاسی یەی پاپایەتی (البابویە) هەوڵیدا لەجیهانی کاثولیکی خۆیدا پێکی بهێنێ تەمەنێکی ئەوەندە درێژی نەبوو.

هەروەها لەجیهانی ئیسلامیدا ئەو یەکێتی یە سیاسی یەی لەسەرەتای ئیسلام دا هاتەدی ماوەیەکی زۆر بەرگەی هەڵتەك و داتەکی ڕۆژانی نەگرت. وە خەلیفایەتی عەبباسی لەوپەڕی هێزو گەورەیەتیدا نەیتوانی هەموو موسوڵمانان لەژێر ئالایەکی سیاسی دا کۆبکاتەوە. وە ئەوەندە بەسەر دامەزراندنی خەلیفایەتی ناوبراودا ڕەت نەبوو تا وای لێهات لە دەسەڵاتی ڕواڵەت ئامێز بەولاوە هیچ دەسەڵاتێکی ماددی بەسەر ئەو وڵاتانەدا بمێنێ.

بۆیە نەیتوانی نەیەڵێت دەنگی زنجیرەی ئەم وڵاتانە لەیەك نەترازێن و نەبێت بەچەند یەکێتی یەکی سیاسی سەربەخۆوە.

ئنجا لەسەر باسەکەی ئەڕوات و ئەڵێت "کە یەکێتی سیاسی لەسەدە ڕابوردووەکان دا سەرەڕای سانایی ژیانی کۆمەڵایەتی و بێ بایەخی پێوەندییە سیاسی یەکان وە لەژێر سێبەری خوو ڕەوشتە ئاینیەکان لە هەموو سوچێکی کردارو بیروباوەڕدا بەئەنجام نەگەیشتبێ، ئاخۆ چۆن پاش ئەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی قورسترو کێشە سیاسی یەکان گرانترو زانست و پیشەسازی لەژێر دەسەڵاتی خوو ڕەوشت و بیروڕای کۆندا ڕزگار بوو لەم سەدەیەدا ئەم یەکێتی یە سیاسی یە دێتە دی".

هەر لەسەر باسەکەی ئەڕوات و ئەڵێت "من دووبارەی ئەکەمەوە ئەوانەی بە بیانووی یەکێتی ئیسلامەتییەوە دژی یەکێتی عەرەبین، دژی بچوکترین پێویستی‌یەکانی ئەقڵ و لێکدانەوەی ئاسایی (المنطق)-ن".

ئەوەتا هەر لەم بارەیەوە بیرکەرەوە (المفکر)ی قەومییەتی عەرەبی دوکتۆر منیف الرزاز لە ساطع الحصری ڕوون و ئاشکراتر دوای (١٨) ساڵ لە وتەکەی ساطع الحصری[٢٧] " ئیسلامەتی لە دورگەی عەرەبیدا لەسەر دەستی محمد پەیامنێری خودا دەرکەوت. عەرەب ئەم پەیامەی گەیاندە بەشی زۆری جیهانە دراوسێکانی.... وەچوونە ناو وڵاتانی فارس و ڕۆم و قیپتی و هند و ئەفغان و تورك، وە دەوڵەتێکی پاڵاوتە (خالص)ی عەرەبی‌یان پێکەوەنا.

سەبارەت بەوەی هەڵگری ئەم پەیامەو خاوەنی چوونە ناوەوە بوون، بوون بە فەرمانڕەواو سەروەریان، نەهەستیان کردو نەئاسایی-ش بوو هەست بە تەنگوچەڵەمەیەك بکەن لەنێوان ئەم عەرەبایەتی‌یەی نوێنەرایەتی ئەکەن و ئەو ئیسلامەتی‌یەی بەسەر شانیانەوەیە. ئەوان عەرەب و هەڵگری ئیسلامەتین بەڵام نەتەوەکانی ئەم وڵاتانە، ئەو نەتەوانەی تازە ئیسلامەتی کەوتۆتە نێوانیانەوە، بەتایبەتی ئەو نەتەوانەی خاوەن قەومییەتێکی بەهێز بوون، هەستیان بە تەنگوچەڵەمە کردو نەیانتوانی لەپێناوی ئەم پەیامە نوێیەدا دەست لە قەومییەتی خۆیان هەڵگرن. بۆیە بەفارسی و تورکی و هندی لەژێر سێبەری دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی‌دا مانەوەو ئیسلامیان پەسەند کرد، بەڵام فەرمانڕەوایەتی عەرەب دەوڵەتی عەرەبی‌یان پەسەند نەکرد. هەر هەلیان دەست بکەوتایە، جارێك و دووجارو سێ‌جار، نەتەوە دوای نەتەوەو قەومییەت دوای قەومییەت شۆڕشیان بەرپا ئەکرد. وە بەهۆی هەستی قەومی و بەخۆوە نازین لەئاستی عەرەب دا، هەوڵیان ئەدا جڵەوی فەرمانڕەوایەتی بگرنە دەست.

ئیسلام بوو (العقیدە)-ی یەکخستن، بەڵام نەیتوانی قەومییەتیان لەناو بەرێت. بۆیە فەرمانڕەوایەتی لەدەست عەرەبەوە ئەکەوتە دەست فارس و دەست تورك، وە کینە لەنێوان عەرەب لەلایەك و فارس لەلایەکی ترەوە ماوەیەکی دوورو درێژ زۆر بەهێز بوو، وە ئەم کینەیە نەڕەوییەوە تاکو ئەوان لەمان جیابوونەوەو دەوڵەتی جیاوازیان بۆ خۆیان دامەزران.

دەوڵەتی ئیسلامی ڕۆژێك لەڕۆژان دەوڵەتێکی ناقەومی نەبووە، تاکۆتایی چاخی ئەمەوی‌یەکان، بەدەوڵەتێکی ئیسلامی مایەوە، ئنجا فارسی تێ کەوت، تاچاخی مەئمون بەتەواوی یاخود خەریك بوو ببێت بەفارسی تەواو.

ئنجا لە دەوروبەری موعتەسم دا بەتەواوی یاخەریك بوو ببێت بەتورکی. دوای ئەمە لەنێوان فارس و تورك و عەرەب دا ئەم دەست و ئەو دەستی ئەکرد.

ئنجا دەوڵەتی عوسمانی دامەزرا، ئیسلامی تورکی بوو، عەرەب تێیدا بەڕێوە براو (رعیە) بوو. نە لە دەوڵەت و نە لە فەرمانڕەوایەتیدا شتێکیان بەدەستەوە بوو".

لەسەر باسەکەی ئەڕوات و ئەڵێت "کەواتا قەومییەتی عەرەبی کەبەهۆی دەسەڵاتدارێتی قەبیلایەتی‌یەوە پێش ئیسلام لاواز بوو، کەپەیامی ئیسلامی هەڵگرت، دیارو بەهێز کەوتە ڕوو، بەڵام بەهەمان هێز ناحەزی کەوتە نێوانی و نێوان قەومەکانی ترەوە، وە ئەم ناحەزی‌یە سەرەڕای هەموو ئەو هۆیانەی کە ئەبوو لەناوی بەرن، لەناو نەچوو، بەڵکو بەپێی زروف بەهێزو لاواز ئەبوو بەڵام هەر درێژەی ئەکێشاو نەئەپسایەوە. وەنەك هەر لەدورگەی عەرەبی بەتەنیا بەڵکو لە هەردوو شانی ئەم دورگەیە هیلالی خەسیب لە باکورەوەو لە باکوری ئەفەریقا لە ڕۆژئاوادا درێژەی کێشا".

ئیتر چ بیروڕایەك لەمە ئاشکراترو ڕۆشنتر بوترێت کە سەرەڕای ئەوەی عەرەب بەهۆی ئاینی ئیسلامەوە مێژووی خۆیان بایەخدارو خاکی خۆیان زۆر پان و بەرین و زبانی خۆیان بڵاوکردۆتەوەو گەلێکی بەژمارە زۆریان پێکەوە ناوەو دەسکەوتێکی بەخەیاڵدا نەهاتووی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری‌یان دەستکەوتووە.

سەرەڕای ئەمانە هەموو ئەوەتا دوو ڕابەری ئایدیۆلۆژی قەومایەتی عەرەب ساطع الحصری و دوکتۆر منیف الرزاز پێوەندی عەرەب و ئایینی ئیسلام بەو جۆرەی لەسەرەوە باسکراوە لەتای تەرازوو ئەدەن.

ئەبێ لێرەدا ئەوە بیر خۆمان بخەینەوە کە بۆچوونەکانی ئەم دوو بیرکەرەوەیەی عەرەب هەرچەندە ناوی کوردی تێدا نەهاتووە بەڵام کوردیش وەکو فارس و تورك و هندی و گەلە موسوڵمانەکانی تر بووە. لەتەك ئەوەی کەدەستێکی درێژی لەبڵاوکردنەوەو پاراستن و پێشخستنی ئیسلامدا هەبووە، بەڵام لەهەمان کات دا،

هەرچـەندە بـۆی لوابێـت هـەوڵیداوەو نموونەشـی ئێجگـار زۆرە لـەخۆی لـەخاکی کوردستانا خاوەنی دەسەڵات و سەروەری بێت وە لەپێناوی ئەم ئامانجە ڕەوایەدا گەلێ جار دووچاری کوشت و کوشتارو چەپاوەڵ و داگیرکراوی ناڕەوا بووە.

وەکو باسمان کرد ئاین و قەوم و نەتەوە وەکو بووەیەکی دوو پەل وایە.

پـەلی یەکـەمی بـەو جۆرەیـە کـەباسمان کـرد و تێکـەڵ بـە مەرجـەکانی قـەوم و نەتـەوە نـابێت و هـەندێ جاریش ڕووبـەڕووی یـەکتری ئەوەسـتن و لایـەکیان ئـەبێت بەکۆسـپی ڕێگـای پێشـکەوتنی ئـەویتریان، بـەڵام لکێکـی تـری هەیـە کـە ئەگـەر نەبێت بەمەرجی سەرەکی قەومییەت و نەتەوایەتی، ئەبێ بەمـەرجێکی دیارو گرنگـی ئەم مەسەلەو کێشەیە.

واتا ئاین یاخود ئاینزا لـەناو هـەندێ قـەومدا جێگایـەکی تایبـەتی بـۆ خـۆی ئەکاتەوەو ئەبێ بە بەشێکی گرنگ و بەنرخی مێژو و ڕۆشنبیری و هەستی دەروونـی قەوم و نەتەوەیەك.

وە ئـەم پێکـەوە نووسـان و یەکبوونـە لەتـەك مەرجـەکانی تـردا وەکـو مێـژو و زبان و... نەتەوە گەڵاڵـە ئـەکات و لەئەنجامدا لەدەستی بیانی-ش ئەیپارێزێ،یـاخود نەتەوە ئەیکات بەچەبەرێکی ئاسنینی قایم دژی تەماعکاران و دەست درێژ کەران.

ئـەم دیاردەیـە ئـەوی ڕاسـت بێ لـەنێو ئاینـە ئاسمـانی و نائاسمانی‌یـەکانی ئـەم سەرزەمینەدا نموونەی دیارو ئاشکرای هەیە.

ئـەتوانین پاکسـتان وەکـو نموونـەی هـەردوو لایەنەکـە واتـە بـێ بایـەخی ئـاین لەکۆڕی یەکێتی و بایەخداری لەم کۆڕەدا بەنموونە بهێنینەوە. کە هندستانی گـەورەی پێشو دوای جەنگی جیهانی دووەم بوو بەدوو دەوڵەتی گەورە.

یـەکێکیان هندسـتانی ئێسـتا و ئـەوی تریـان پاکسـتانی یـەکگرتوو، واتـا پاکسـتانی ئیسـلامی ڕۆژئـاوا کـە ئێسـتاش بـەناوی پاکسـتانی ئیسـلامییەوە ماوەتـەوە و پاکسـتانی ئیسـلامی ڕۆژهـەڵات (بـەنگلادیش)، ئـەوە بـوو زۆری پێ‌نـەچوو ئـاینی ئیسـلام نـەیتوانی ئـەم دوو گەلـە ئیسـلامە لەیـەکتری جیـاوازە لـەڕووی نەتەوایەتی‌یـەوە لـە کۆمەڵگایـەکی ئیسـلامی یـەکگرتوودا بپـارێزێت وە هۆیـە نەتەوایەتی‌یەکانی هـەردوولا بـوون بـەماکی تەشـەنە کـردووی نـاکۆکی و جیـاوازی لەئـەنجامدا لەیـەکتری تـرازان و دوو دەوڵـەتی ئیسـلامی لەهـەردوولا

پەیدابوون، دەوڵەتی پاکستانی ئیسلامی ئێستاو دەوڵەتی بەنگلادیشی بەنگالی‌یە موسوڵمانەکان.

بەڵام لایەنی دووەمی ئەوەیە کە سەرەڕای ئەوەی هەموو قەومو نەتەوەکانی ناو سنوری پاکستان نەوەی شەپۆلی یەکەمی ئاری‌یەکان و زبانەکەشیان هەر هی ڕەسەنی ئاری‌یەوە ئەم خاسییەتەی زۆر بەڕۆشنی پێوە دیارە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئاینی ئیسلام بووە بە بەشێك لەخوو ڕەوشت و نەریت و ڕۆشنبیری و هەستی دەروونی کۆمەڵگای پاکستان. ئاینی ئیسلام جێگایەکی دیارو بایەخداری لەناو سەرجەم گەلی پاکستان دا بۆ خۆی کردۆتەوە.

هەرچەندە لەزۆر ڕووی سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری‌یەوە جیاوازی ناو قەومو نەتەوەکانی لەچوارچێوەی وڵاتی پاکستان دا هەیە، بەلام لەڕووی ئاینەوە هەموو لەچوارچێوەی قازانجی گشتی کۆمەڵگاکەیان دا مل کەچی ڕێبازی ئاینی ئیسلامین. خۆ پۆشاکی خاتو بەنازیر بۆتۆی سەرەك وەزیرانی پاکستان و سەرۆکی پارتی گەلی پاکستانی، لەسەر ئاینی ئیسلامی ڕۆیشتو نموونەیەکی ڕۆشنی ڕاستی ئەم بۆچوونەیە. هەروەها پێوەنانی نازناوی ئیسلامی بەکۆماری پاکستانەوە.

ئنجا جەزائیری‌یەکان لەجەنگی ڕزگاری هێنەری وڵاتەکەیانا دژی داگیرکەرە فەرەنسایییەکان کەخاکی جەزائیریان بە بەشێك لەخاکی فەرەنسا لەقەڵەم ئەدا، زۆر کەڵکیان لەئاینی ئیسلام وەرگرت و کردیان بەچەکێکی کاریگەر دژی داگیرکەرە ئیمپریالی‌یە فەرەنساییەکان.

وەکو ئەزانین لەجەزائردا لایەکی خەڵکەکەی بەهۆی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە بوون بەعەرەب و خۆیان بەعەرەب لەقەڵەم ئەدەن. بەلام لاکەی تری با لەمانیش بەژمارە کەمترین هەر لەسەر بنجی قەومی کۆنی خۆیان ماونەتەوە، کە بە (بەربەر) ناسراون، وە وەکو مێژو نووسان ئەڵێن ئەمانە لەچاخی سەهۆڵبەندانەوە لە فینلەندەو وڵاتانی ئەسکەندەنافیاوە لەتاو سەرما و بەستەلۆك ڕوویان کردۆتە باکوری ئەفەریقاو لە ئەنجامدا ئاینی ئیسلامیان پەسەند کردووە.

سەرکردەکانی بزوتنەوەی ڕزگاری هێنەری جەزائری کەچەند کەسێکی دیارو دەسەلاتدارو جوامێریان (بەربەر) بوون دژی ئەوە بوون عەرەبایەتی بکەن بەدەزگای

ڕاگەیاندنی بزوتنەوەکەیان، بەڵکو هەر بەناوی ئیسلامەوە شۆڕشەکەیان گەشە پێ ئەکردو دەزگاکانی ڕاگەیاندنیان وەکو گەلێکی موسوڵمان و شۆڕشێکی ئیسلامی کارەکانی خۆیان بەڕێوە ئەبرد.

بۆ نموونە بەسەرهاتێکی ئەم ڕاستی‌یە ئەگێڕمەوە:

لەدوای شۆڕشی پیرۆزی چواردەی تەموزی ١٩٥٨ لە کاتێکدا کە (عبدالکریم قاسم) سەرەك وەزیرانی عێراق بوو، (کریم بلقاسم)ی سەرکردەیەکی بەناوبانگی شۆڕشی جەزائر بەمیوانی هات بۆ بەغدا، بەو بۆنەیەوە لێپرسراوانی پارتی‌یەکان و نوێنەرانی ڕۆژنامەکانی ئەوسای عێراق و هەندێ لێپرسراوانی ئەوسای وڵات بانگ کران بۆ فڕۆکەخانەی بەغدا، بۆ پێشوازی کردن لەم میوانە شۆڕشگێڕە خەباتکەرە.

لەپاش گەیشتن و دانیشتن بۆ حەسانەوە پێش بەجێهێشتنی فڕۆکەخانەکە، (عبدالکریم قاسم) بەخێرهاتنێکی گەرمی لێکردو پێی وت "ئێمە بەفرمانی سەرشانی خۆمانی ئەزانین کە بەهەموو جۆرێك دەستی یارمەتی بۆ گەلی عەرەبی جەزائری درێژ بکەین.

(کریم بلقاسم) لەوەڵامدا تکای لێکرد کە لەمەولا ناوی گەلی جەزائری بە گەلێکی موسوڵمان ببرێت چونکە وەکو ئەو وتی گەلی جەزائری هەمووی عەرەب نی‌یە بەڵکو گەلی (بەربەر)یشی لەگەڵدا ئەژی، جێگایەکی دیارو گرنگ و بایەخداریان وەکو میللەت و هەرێمەکەشیان کە هەرێمێکی شاخاوی سەختی بەکەڵکە بۆ جەنگی پارتیزانی هەیە، ئەگەر شۆڕشەکەمان کرد بەشۆڕشێکی عەرەبی کاروکردەوەی شۆڕشگێڕانەی کاریگەری بەنرخی ئەم گەلە موسوڵمانەمان لەدەست ئەچێ!!.

ئاوا لێرەدا ئایینی پیرۆزی ئیسلام نەك هەر بووە بەهەوێنی یەکێتی گەلی جەزائری بەڵکو بووشە بەئاگر خۆشکەری ئەو شۆڕشە پیرۆزە خاوەن ملیۆن شەهیدەی خاکی جەزائری لەچنگ ئیمپریالی‌یە فەرەنساییەکان ڕزگار کرد.

لەکاتی نووسینی ئەم لاپەڕەیەدا لە ٢٠/ ٤/ ١٩٩٣دا گوێم لە گفتوگۆیەکی نێوان کارمەندێکی ئێستگەی لەندەن و لێپرسراوی ڕاگەیاندنی پارتی (کۆبوونەوە لەپێناوی ڕۆشنبیری و دیموکراتییەت) (حزب التجمع من اجل الثقافە و الديمقراطيە)ی جەزائریدا بوو، دەربارەی ئەو خۆنیشاندانەی ئەو پارتی‌یە لەپێناوی بڕواکردن

بەڕۆشنبیریو زمانی (بەربەری) لەجەزائردا کردوویانە، سەرەڕای ئەوەی حکومەتی جەزائر خۆنیشاندانەکەی پەسەند نەکردووەو بە لەیاسا لادان لەقەڵەمی داوە.

لە وەڵامی پرسیارەکانی کارمەندی ڕادیۆی لەندەن دا لێپرسراوی ڕاگەیاندنی ئەم پارتی‌یە وتی "ئێمە بۆیە ئەو خۆنیشاندانەمان کردووە تاکو هەموو لایەك لەجەزائر بڕوا بەمافی ڕەوای ڕۆشنبیریو زبانی تایبەتی (بەربەر) بکەن. چۆن زبانی عەرەبیو فەرەنساییو ئینگلیزی لەجەزائردا ئەخوێندرێت، پێویستە زبانی بەربەریش لەلایەن خەڵکی بەربەرەوە بخوێندرێت، کە تا ئێستا ئەو مافەمان بەرەسمی بۆ نەسەلمێندراوە".

ئنجا کارمەندی ئێستگەی لەندەن لێی پرسی: باشە عەرەبەکانی جەزائر بەمە تووڕە نابن؟ لە وەڵامدا وتی "نابێ کەس پێی ناخۆش بێ چونکە کێشە نیيە لەنێوان عەرەبو بەربەردا، خەڵکی ئەم وڵاتە هەموو جەزائرین، هەندێکیان بەعەرەبی ئەدوێنو هەندێکیان بە بەربەری! وە ئێمە دوای هیچ پارتی‌یەکی ئیسلامی ناکەوین بەڵکو ڕژێمێکی دیموکراتی-مان ئەوێت".

بێگومان ئەمە ڕەنگدانەوەیەکی ئاسایی ژیانی قەومیو کۆمەڵایەتی جەماوەری خەڵکی بەربەری جەزائرە، کە دوای خەباتێکی سەختو خوێناوی لەپێناوی سەربەخۆیی جەزائردا لایەکیان عەرەبایەتیو لایەکی تریان موسوڵمانەتی ئەکەن، بێ ئەوەی گوێ بدەنە مافی قەومی بەربەر لەجەزائردا.

دیارە کە لەمافو فرمان پێکردندا پێوەرێکی داد ڕەوانەو جوامێرانە نەبێت ئەوا ئەمانیش لەجاران پتر دەست بەمافی قەومی خۆیانەوە ئەگرنو لە پێناویدا خەبات ئەکەن.

لەهەر وڵاتێکی فرە نەتەوەدا، نەتەوە دەسەڵاتدارە کە هەر مافی نەتەوایەتی خۆیو گەشە پێکردنی بەخۆی ڕەوا ببینێو ئەوانی‌تر بێبەش بکا، ئەوا دوو بەرەکییەکی تاڵ ئەکەوێتە نێوانەوە کە زۆرجار بە هەڵوەشانەوەی یەکێتی ئەو وڵاتە بەئەنجام ئەگات، وە جیهان پڕە لە نموونەی جۆراو جۆری ئەم بابەتە، کەخەباتی نەتەوە بچوکەکان بەیەکێتی فیدراڵیو جیابوونەوەو دەوڵەتی سەربەخۆ دامەزراندن لەلایەن نەتەوە بەش خوراوە چەوساوەکانەوە بەئەنجام ئەگات.

له وڵاتێکی موسوڵمانیتر له ئێرانا، ئەم وڵاته نەك هەر ئایینی ئیسلام بەڵکو ئاینزای شیعایەتیشی تێدا بووه به بەشێك لەهێزی پێکەوەنانی نەتەوەی فارس.

ئەم نەتەوەیه دوولانه کەڵکی لەم ڕێڕەوه ئاینییه وەرگرتووه، لەلایەکەوه وەکو لەپێشەوه باسکراوه، کردوویانه بەچەپەری پارێزگاریکەری نەتەوەی فارس لەتوانەوه لەناو عەرەب دا، وه لەلایەکی ترەوه چەند گەلێك یاخود چەند بەشێکی گەله ئێرانییه فارسەکانیان بەخۆیانەوه بەستووەو تاڕادەیەکی دیارو گرنگ هۆشی نەتەوایەتی ئەم گەلانەیان لاواز کردووەو به ئاینزای شیعایەتی جێگای ئەو هۆشەیان پێکرتۆتەوه، وەکو کوردەکانی لوڕستانی بچوكو گەوره (بەختیاری)و ئازربایجانیو تورکومانەکان!

ئەوی ڕاست بێ ئاینزای شیعایەتی مێژوویەکی زۆر کۆنی له ڕەوتی فارس دا هەیه، وه ناکۆکیو دووبەرەکی نێوان فارسەکانو خۆراسانییەکان به (ابو مسلم الخوراسانی) کورد ڕەگەزیشەوه لەتەك ئەمەوییەکانو دامەزراندنی خەلافەتی عەبباسیو ئنجا تێکچوون لەتەك عەبباسییەکانیشداو کوشتنی (ابو مسلم الخوراسانی) بەفڕو فێڵو ناجوامێرانه بەدەستی (ابو جعفر المنصور) له سەلمانپاك دا بەڵگەی بێگومانی ئەم بۆچوونەیه.

هەروەها ململانێو دووبەرەکی نێوان دەوڵەتی سەفەوی ئێرانی شیعه ئاینزاو دەوڵەتی عوسمانی سوننی ئاینزا هەر ڕەنگدانەوەی بەکارهێنانی ئاینی ئیسلامه لەلایەن هەر دوو دەوڵەتەوه.

لەگەڵ ئەم حاڵەتەشدا لەکۆڕی خەباتی ڕەوای درێژخایەنی گەلانی ئێران دژی شا زۆردارەکانی ئێران لەلایەن پیاوه ئاینییه گەورەکانی سەر به ئاینزای شیعه که له ئێرانا به ئایەتوڵڵاو حوجبەتو ئیسلام ناویان دەرکردووه، ئیسلامەتیو شیعایەتی کراوه بەچەکی دەستی هەژارانو زۆربەی زۆری کۆمەڵانی خەڵك.

ڕووداوی مەشروتییەتی ساڵی ۱۹۰۸ی بەناوبانگی ئێرانی بۆکزکردنی دەسەڵاتی شای ئێرانو هاتنه کایەی لیژنەی بەرزی پیاوه ئاینییه گەورەکانی ئێرانو خۆنواندنیان لەکۆڕی دەسەڵاتو بڕیاردانی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابوریو ڕۆشنبیری ئێران دا، ڕەنگدانەوەی ڕۆڵی گرنگی سوود لێوەرگرتنی ئەم ئاینزایەیه.

کارو کردەوەی ئەم ئاینزایه دژی حەمه ڕەزاشاو لەئەنجامدا بەهاوکاری هەموو بزوتنەوه سیاسییه ئازادیخوازەکانی ئێران، لەناوبردنی ڕژێمی شایەتیو

دامەزراندنی کۆماری ئیسلامی ئێرانی بەری ساڵی ١٩٧٩ی ئەم ئاینزایەیە لەناو دڵ و دەروونی خەڵکی فارس بەتایبەتی و شیعە ئاینزاکان لەسەرانسەری ئێران دا بەگشتی.

لێرەدا باسی راستی و ناراستی ئەم رووداوو دیاردەیە لەکۆمەڵگای ئێران دا ناکەین، بەڵکو ئەو کارە کاریگەرەی ئەم ئاینزایە ئەخەینە پێشچاو کەهیچ نووسەرو مێژوو نووسێك لەباسی ئێران و بزوتنەوە سیاسی و ئابوری‌یەکانیا ناتوانێت بەهیچ کلۆجێك فەرامۆشی بکات.

فارس، شیعایەتییان کردووە بەمەرجێکی پێکەوەنانی نەتەوەکەیان یاخود راستتر، شیعایەتی دەستێکی گەورەی لە پێکەوەنانی نەتەوەو قەوارەی نەتەوایەتی فارس دا هەیە.

نەك هەر خۆیان لەعەرەب و تورك پێ پاراستووە، بەڵکو دەسەلات و نفوزێکی فراوانیشیان لەناو گەلانی شیعە ئاینزادا پێ پەیدا کردووە.

سەیری مێژو و ئەدەب و هەڵبەست و چیرۆك و داستان و هونەرو فۆلکۆری فارسی بکەین، بۆمان دەرئەکەوێت کە لە ئەدەب و بەسەرهات و رووداوو ئامۆژگاری ئایینی و کارەساتەکانی ئاینزای شیعایەتیدا شەپۆل ئەدەنەوە.

ئەمە بێگومان بووە بە بەشێکی گرنگی لایەنی رۆشنبیری فارسەکان و جێگایەکی دیاری لەدڵ و دەروونی هەموو کەسێکی فارس دا کردۆتەوە، کە ئەمە مەرجێکی گرنگی سەرەکی پێکەوەنانی نەتەوە و دەوڵەتی نەتەوایەتی‌یە.

هەروەکو ئاینی ئیسلام لەهەندێ وڵاتدا بووە بەمەرجێکی گرنگی پێکەوەنانی نەتەوەیەکی موسوڵمان ئاین، هەروەها لەنێو گەلە مەسیحیەکان-یش دا نەك هەر ئاینی مەسیحی بەڵکو لکێکی ئەم ئاینە بووە بە هەوێنی پێکەوەنانی نەتەوەیەك و ئاگر خۆشکەری خەباتی قەومی ئەو نەتەوەیە.

نەتەوەی یۆنان نموونەی ئەم باسەمانە، یۆنانی‌یەکان بۆ خۆرزگار کردن لە سەڵتەنەتی عوسمانی جگە لەخەباتی نەتەوایەتی پالاوتە، ئاینزای ئارثوذوکسی-یان کرد بەچەکێکی کاریگەری بەسام لەناو خۆیانا، بۆ جۆشدانی خەباتی نەتەوایەتی لەپێناوی رزگاری لەدەست ئەم سەڵتەنەتەو پێکەوەنانی دەوڵەتێکی نەتەوایەتی یۆنانی سەربەخۆ.

لەم كۆڕەدا نەتەوەی یۆنان دەستیان دایە ئەم خەباتە ڕەوایەو پێش نەتەوەكانی تری بەڵقان كەوتن و بەئامانجی ڕەوای خۆیان گەیشتن.

دەربارەی ئەم باسە ساطع الحصری ئەڵێت[٣٨] "نەتەوەی یۆنان بەهۆی دەسەلآت و تێكۆشانی ئەم كەنیسەیەوە (نیازی كەنیسەی ئارثۆذوكسی یە) توانی پارێزگاری پێكەوە بوون و پشتیوانی خۆی بكات و دەست بەزبان و ڕەوشت و نەریتی خۆیەوە بگرێت و هەست بەقەومایەتی خۆی بكات. لەسەر باسەكەی ئەڕوات و ئەڵێت "دیارە بوونی ئەم دامەزراوە (كەنیسەیی)یە قەومیانە پشتیوان و یاریدەدەرێكی گەورە بوون كە گیانی قەومی لەدڵ و دەرونی یۆنانی یەكانا لە دەسەلآتدارێتی عوسمانی یەكانەوە خوڵ بخوات هەروەكو لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە ئاگری شۆڕشی سەربەخۆیی تیاكردنەوە". درێژە بە باسەكەی ئەدات و ئەڵێت "لەگرێی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمین دا بیروڕای سەربەخۆیی قەومی لە دەرونی یۆنانی یەكانا وەكو پێویست هەڵهات (التخمر)وە بوو بەهۆی ئەوەی هانیان بدات شۆڕشێكی چەكدارانە دژی سەڵتەنەتی عوسمانی هەڵگیرسێنن".

وە ئەبێ ئەم نموونەیە واتا بەشداربوونی ئاین یاخود ئاینزا لەخەباتی نەتەوایەتی نەتەوەیەكدا، تاقە نموونەی ئەم كۆڕە بێت، ئەوەتا ئاینزای كاثولیكی لەمە زیاتر ڕۆڵی ئاشكراو بایەخداری لەنێو ئێرلەندی یەكانی باكوردا ئەنوێنێ. وەكو چەكێكی كاریگەر خەباتی گەلی ئێرلەندەی باكور لەپێناوی سەربەخۆیی لە بەریتانیا جۆش ئەدات.

هەروەها زۆر دەمێكە جولەكەكان ئایینی موسایيان كردووە بەچەكێكی كاریگەری دەستی خۆیان بۆ كۆكردنەوەی هەموو جولەكە بلآوبووەكانی جیهان لەخاكی فەلەستین داو دامەزراندنی دەوڵەتێكی عیبری پشت بەئاین و بەیارمەتی هەموو دەوڵەتە ڕۆژئاواییە مەسیحی یەكان، تا لەئەنجامدا بەو ئامانجە گەیشتن.

لەم پێشەكی یانەدا بۆمان ڕوون ئەبێتەوە كە ئاین و ئاینزا ئاسمانی یەكان لە سەرانسەری جیهانداو لەنێو هەموو گەل و نەتەوەكانی جیهاندا یەك ڕەوت و ڕێبازیان نەبووە.

لەنێو هەندێ گەل بێ لایەن و هەندێکی تردا ڕووبەڕووی بزوتنەوەی قەومی بوو نەتەوەو لەنێو چەند گەل و نەتەوەیەک-یش دا لەپێناوی ئازادیو سەربەخۆییدا بوون بەئاگر خۆشکەری خەباتی نیشتمانیو نەتەوایەتی ئەو گەلانە.

بەختیارانە ئاینی موسوڵمان بەهۆی پیاوە گەورە ئاینییە جوامێرە کوردەکانەوە هەرگیز خۆی بەجێگری بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد نەزانیوە، تەنانەت پیاوە گەورە ئاینییەکانی کورد کە سەرکردایەتی شۆڕشی کوردیان کردووە، کەڵکیان لەئاینی ئیسلام وەکو ئاینێکی دادپەروەرو دژ بەزوڵم و زۆرو داگیرکەریو چەوساننەوە بینیوەو لەپێناوی ڕامالینی چەوساننەوە نەتەوایەتیو دەستخستنی مافی ڕەوای نەتەوایەتی کوردو کوردستانا تێکۆشاون.

لە لاپەڕەکانی مێژووی نەتەوایەتیو ئەدەبو هونەرو ڕۆشنبیری بەدرێژایی مێژووی وڵاتی کوردستان پڕن لە دەستڕەنگینی پیاوە ئاینییە سەر بەرزەکانی کورد.

## زبان لەکۆڕی پێکەوەنانی نەتەوەدا

زبان لە هەرە مەرجە گرنگەکانی پێکەوەنان و هاتنەکایەی نەتەوەیە تائەو ڕادەیەی پسپۆڕان و زانایانی ئەم بابەتە هەموویان بەمەرجی سەرەکی ئەم باسەی ئەزانن. وە هەندێکیان بوونی زمانێکی پاڵاوتە ئەکەن بەنیشانەی بوونی نەتەوە وەکو میر مصطفی شهابی کە لە پێناسینی عەرەب دا ئەڵێت[٣٩] "هەرکەسێك بەعەرەبی بدوێت و بیەوێت ببێت بەعەرەب".

ئەوی ڕاست بێ زبان هەر لەو کاتەوە دەست پێ ئەکات کە منالی ساوا ئەکەوێتە گڕوگاڵ و دادەو بابە تا ئەگاتە ئەوەی نووسەرانی میللەتێك بڕوا بە زبانەکەی خۆیان ئەکەن و بیروڕای خۆیانی پێ ئەخەنە سەر کاغەز و تۆماری ئەکەن. لەهەموو مەرجێکی تر پتر گەلان و قەوم و نەتەوە لەناوخۆیانا بەیەکەوە ئەبەستێت.

چونکە زبان دەسکەلایەکی گرنگ و بایەخداری پێوەندی نێوان نەتەوەیە و هۆی بیرکردنەوە و دەربڕینی بیروباوەڕی تاك و بەکۆمەڵی نەتەوەیە، کەبێ زبان کەس ناتوانێ نە لەبەر خۆیەوە یاخود بەئاشکرا بیروباوەڕ و پێویستییەکانی خۆی بخاتە ڕوو، ئەمە جگە لەوەی بەهۆی زبانەوە هەر نەتەوەیەك، ئەوە دوای ئەوە، کەلەپورو ڕووداوە مێژوییەکان و سامانی زانستی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و ڕۆشنبیری خۆی ئەپارێزێ. جگە لەمانە سامانە هونەرییەکانی هەر نەتەوەیەك لەناخی گیانی نەتەوایەتییەوە بەزبان ئەدرکێنرێت.

هەندێ شارەزایانی کۆن ئادەم زادیان لەئاژەڵ بەزبان لەیەکتری جوێ کردۆتەوە و بەئادەم زادیان وتووە ئاژەڵی قسەزان.

نووسین و زانستی ئەم بابەتە، واتە زبانەوانی و بایەخی زبان لەنێو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا لەهەموو دیاردەکانی نێو ئەم کۆمەڵگایە فراوانترو پڕ سامانترە.

کەس نەیتوانیوە خۆی لەبایەخداری و پێویستی ئەم مەرجە لەکۆڕی باس کردنی نەتەوەدا لابدات و لەپایەو بناخەی ئەم دیاردەیە کەم بکاتەوە.

بۆیە هەر خوێنەرێك کە بە دووی ئەم باسەدا ئەگەڕێت ئەبینێت پسپۆڕە کۆمۆنیستی‌یەکان و بۆرژوازی‌یەکان و دەستە چەپ و دەستە ڕاست و نێوانەکانیشیان هەموو توندو تۆڵ دەستی نرخ و گرنگی‌یان لەزبان ناوە.

تەنانەت ستالین لەنێو تیۆریستەکانی جیهان دا بەتوندڕەو لەقەڵەم دراوە، دەربارەی زبان لەوەڵامی ڕۆژنامەی پراڤدای ئۆرگانی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیاتیدا ئەڵێت[٤٠] "زبان سەبارەت بەوەی هۆی پێوەندییە، هەمیشە لەمەوپێش و ئێستاش بۆ کۆمەڵگایەك، وە بۆهەموو ئەندامانی کۆمەڵگا شتێکی ناوکۆییە، وەبوونی زاراوەو شێواز نابێ بەهۆی لابردنی زبان، بەڵکو بوونی تاقە زبانێك لەنێو گەل دا ئەسەلمێنێت، چونکە ئەم زاراوەو شێوازانە لك و پاشکۆی ئەون.

شێوەی چینایەتی بەزبانەوە بەستن ناڕاست و نامارکسی‌یانەیە".

بەمە ستالین لەباسێکی زبانەوانی دوورو درێژدا وەڵامی ئەو کەسانەی داوەتەوە کە لایان وابووە هەر چینێکی نەتەوەو گەلێك زبانێکی تایبەتی خۆی هەیە. لە باسەکەیدا زۆر بەتوندی ئەم بیروباوەڕە بەدرۆ ئەخاتەوەو ئەڵێت "زبان موڵکی ناوکۆیی هەموو گەل و نەتەوەیە، بەهەموو چین و توێژاڵەکانی‌یەوە".

زانایانی ئەم بابەتە سورن لەسەر ئەوەی کە زبان قەڵخانی پۆڵایینی پاراستنی نەتەوەیە، چونکە بەدرێژایی مێژوو زۆر قەوم و نەتەوەو گەلانی ئەم سەر زەمینە، کە نەتەوەی کورد نموونەیەکی دیاری بەڵگەداری ئەم بۆچوونەیە، دەسەڵاتی سیاسی‌یان لێ زەوت کراوەو وڵاتەکانیان ژێر دەستەکراوەو سەروەری‌یان لەناوبراوە، توانیویانە بەزبان خۆیان لە فەوتان و تواننەوە بپارێزن و لە ئەنجامدا سەربەستی و سەربەخۆیی خۆیان بخەنەوە دەست.

دەربارەی ئەم باسە دوکتۆر (ابراهیم انیس) نەتەوەی پۆڵەندەیی بەنموونە ئەهێنێتەوەو ئەڵێت[٤١] "پۆڵەندە لەمێژوویەکی دوورو درێژدا دووچاری داگیر کردن و دەستدرێژی دەوڵەتە گەورە دراوسێکانی بووە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش توانیوێتی

یەکێتی زبانو قەومییەتی خۆی بپارێزێت. لە سەدەی هەژدەیەمیندا ئەڵەمانەکان لەسنوری ڕۆژئاواوە زۆریان بۆ هانیوە ڕوسەکان لەسنوری ڕۆژهەڵاتەوە، وەخاکی پۆڵەندە لەنێوان ڕوسیاو پڕوسیاو نەمسادا بەش بەش کراو ئەم سێ دەوڵەتە هەوڵیاندا گیانی قەومایەتی لە پۆڵەندەدا لەناوبەرن وە زمانو کولتۆری خۆیان بەسەر گەلی پۆڵەندەدا سەپان. بەڵام هێشتا جەنگی جیهانی یەکەم کۆتایی نەهاتبو دیمان کە قەومییەتی پۆڵەندەیی خەفەکراو وەك بورکان تەقییەوە، وە پۆڵەندە گەڕایەوە دۆخی جارانیو کۆمارێکی نوێی لەساڵی ١٩١٨دا دامەزران وە کۆنگرەی ڕێککەوتن (مؤتمر الصلح) لەپاریس دا ساڵی ١٩١٩ بەگشتی بەپێی زبان سنورەکانی ڕۆژئاواو باشوری پۆڵەندەی نیشانە کرد".

مرۆڤی کورد کەچاو بەمێژووی نەتەوەی پۆڵەندەدا ئەخشێنێت دەستبەجێ کوردستانو نەتەوەی کوردی دابەش کراوو لەمافی نەتەوایەتی بێبەش کراوی بیر ئەکەوێتەوەو ئاهو ناسۆرەی کردەوەکانی دەوڵەتە داگیرکەرە خوێن ڕێژە بێ مروەتەکانی دوژمنی کوردستانی دێتەوە بەرچاو، کە کتومت وەکو داگیرکەرانی پۆڵەندە زبانو کولتورو خوو ڕەوشتی خۆیان بەسەر خەڵکی بەش بەش کراوی کوردستانا سەپاندووە، کە تا ئەم ڕۆژەی ئێستامان لە بەشەکانی تورکیاو ئێرانو سوریادا زەقو ئاشکرا بە بەرچاوەوەیە.

دەربارەی زبان فەیلەسوفی ئەڵەمانی فیختە ئەڵێت[٤٢] "ئەوەی ئەڵەمانی لە گەلانی تر جوێ ئەکاتەوە شتێکی بنچینەیی سروشتییە کە لە زباندا خۆی ئەنوێنێ وە هەموو ئەڵەمانییەك تێدا بەشدارەو بەشێوەیەك لە لاکانی تر جوێیان ئەکاتەوە".

هەر فیختە لە وتەیەکی پڕجۆش لەنێو لاواندا ئەڵێت "بۆ هەموو ئەوانەی بە زبانی ئەڵەمانی ئەدوێن کە من ڕووی قسەتان تێ ئەکەم، ئێوە ئەی ئەو کەسانەی لێرەدا کۆبوونەتەوە هۆشم بۆ ئەوانە ئەچێت کە لەودیوی دیوارەکانی ئەم هۆڵەوەن، بۆ هەموو ئەوانەی بەزبانی ئەڵەمانی ئەدوێن" هەر لەبارەی زبانەوە شاعیری گەورەی ئەڵەمانیا موریس ئارنت لە هەڵبەستێکی ڕەنگینی خۆیدا دەربارەی نیشتمانی ئەڵەمانی ئەڵێت[٤٣] "ئایا پڕوسیایە یا باڤاریایە یا ستفالیایە؟ لە وەڵامدا ئەڵێت نەخێر "پێویستە نیشتمانی ئەڵەمانی لەمانە هەموو بەرزو گەورەتر بێ، بریتییە لە سەرانسەری ئەو وڵاتەی لەهەموو لایەکیدا دەنگی زبانی ئەڵەمانی تێدا ئەزرنگێتەوە".

دوکتۆر (ابراهیم انیس) دەربارەی توانەوەی گەلانی تر لەناو عەرەب دا بەهۆی زمانی عەرەبی‌یەوە ئەڵێت[٤٤] "دووبەرەکی لەنێوان عەرەبی و زمانەکانی تردا، هەرچەندە کتێبە مێژوویییەکان بە دوورو درێژی باسیان بۆ نەکردوین، بەوە کۆتایی هات کە زەمینەی زمانی عەرەبی لەعێراقەوە درێژەی کێشا تا شام و میسرو وڵاتی ڕۆژئاوا (بلاد المغرب)و ئنجا تا (اندلس). ئەو خەڵکە باوو باپیریان لەسەر چی بوون لەبیریان چووەوەو وایان لێهات کە هیچیان لەبیر نەمێنێت، ئەوە نەبێت کە عەرەبن و یەك زمان کۆیان ئەکاتەوەو بیری پێ ئەکەنەوەو میراتی کۆنی خۆیانی پێ ئەنووسن و هەستیان یەکئەخات و کۆیان ئەکاتەوە".

ئەم بۆچوونەی دوکتۆر (ابراهیم انیس) لەتەك بیروڕاکەی (ساطع الحصري)دا یەك ئەگرێتەوە کە لەمەوپێش باسمان کردووەو ئەڵێت "خەڵکی عێراق و شام و باکوری ئەفەریقا هەموو بەهۆی ئیسلام و زمانی عەرەبی بوون بەعەرەب".

داگیر کەران و ئیمپریالیستەکان لە سەرانسەری جیهانداو بەدرێژایی مێژوو بەهەڵە نەچوون کە هەر وڵاتێکیان داگیر کردبێ لەپێش هەموو شتێکدا پەلاماری زمانی گەلانی ئەو وڵاتانەیان داوەو هەوڵێکی بێوچانیان داوە لەپێناوی جێگیرکردنی زمانەکانی خۆیاندا.

هەوڵ و تەقەللای فەرەنسایییەکان لە وڵاتە داگیرکراوەکانی ئەفەریقادا نموونەی بەڵگە بەدەستی ئەم کردەوە ناپەسەندە زۆردارانەیەی داگیر کەرانە.

جێگای شانازی و بەختەوەری نەتەوەی کوردە کە سەرەڕای بێبەشکردنی لەهەموو هۆیەکانی پاراستن و گەشەکردنی زمان، جوامێرانە، توندوتۆڵ دەستی بە زمانی کوردی‌یەوە گرتووەو لەتوێی دڵی ڕۆڵەکانیدا وەك جگەرگۆشەی خۆی پاراستویەتی و بەو پاراستنە خۆی لە توانەوەو لەناوچوون ڕزگار کردووەو لەپاڵ زمانی ئایینی ئیسلامدا (زمانی عەرەبی) دەستی گرتووە بەزمانی شیرینی بایەخداری بەسامانی کوردی خۆیەوە، وە لە کۆڕی ململانێی زماندا گرەوی سەرکەوتنی بەسەربەرزییەوە بردۆتەوە.

# نیشتمان

نیاز لە نیشتمان ئەو زەوییەیە کە کۆمەڵێک خەڵکی لەسەر ئەژین. بێگومان هەر زەوییەک لەوانەیە شاخ و دەشت و ڕووبارو دەریاچەو دۆڵ و بەرزایی و نزمایی و بیابان بگرێتە خۆی یاخود خاوەنی هەندێک لەمانە بێت. وە بەپێی هەڵکەوتی جوگرافی خۆی لە هەریەکە لە وەرزەکانی ساڵدا جۆرە ئاووهەوایەکی هەبێت، سارد و گەرم و مام ناوەندی و فێنک.

هەروەکو بەچەند زەوییەکی گەلانی ترەوە دەورە ئەدرێت، وە هەڵکەوتی لەنێو ئەم دەوڵەتانەداو پیت و بەرەکەت و سامانی کشتوکاڵی و کانزایی و بوونی نەوت و سامانە بەنرخەکانی تر قەوارەیەکی جیۆپۆلیتیکی بۆ ئەکێشێت کە بایەخی ئەم قەوارەیە یاخود بێ بایەخی، هەندێجار بۆی ئەبێت بەخێرو خۆشی هەندێجاری تر بۆی ئەبێت بەمایەی کوێرەوەری و سەرگەردانی. وەکو خاکی کوردستان و هەڵکەوتی جیۆپۆلیتیکی و ستراتیژی بۆی بووە بەتەوقی پۆلایین و گیر بووە لەگەردنی گەلەکەیدا!.

هەرچەندە زەوی لەئاست و ئەندازەی زیاندا بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدراوە، لەگەڵ ئەوەشدا گەلێک پسپۆڕان و شارەزایانی ئەم بابەتە واتا ئەوانەی باسی مەرجەکانی نەتەوەیان کردووە، زەوی و نیشتمانێکی دیارو ڕەوایان کردووە بەمەرجێکی سەرەکی پەیدابوونی نەتەوە. هەروەکو گەلێک لەمانە خوو ڕەوشت و زیرەکی و ڕەنگی پێست و قەدوو بالای گەلێک نەتەوەیان بەستووە بەخاک و ئاووهەوای ئەو خاکەوە، نەک بەخوێن و ڕەگەزو ڕەسەنەوە.

بەپێی بیروڕای ئەوانە وڵاتی فێنك كەسانی پێست سپیو زرنگ پەروەردە ئەكاتو وڵاتی گەرم كەسانی پێست ڕەشو تەمەڵ. وە بەم پێیە دانیشتوانی بیابان لەهی ناوچەی بەرزو فێنكو پڕ كانیاو ڕووبارو دەریاچە جیا ئەكەنەوەو هەرلایەكیان ئەبەستن بەكۆمەڵە خاسییەتو خووڕەوشتو نەریتێكەوە.

هەر لەسەر خاكو زەوی وتوێژو لێكۆڵینەوەیەكی فراوان هەیە، كە ئایا ئەم مەرجە بەتاقی تەنیا وەكو هەندێك لێكۆڵەرەوەی ئەم لایەنە لایان وایە كەمەرجی زمان بەتاقی تەنیا نەتەوە پێك ئەهێنێت یان نا؟

تائێستا شارەزایەكی بەناوبانگی ئەوتۆی ئەم باسە نییە كەخاكو نیشتمان بەتاقی تەنیا بكات بەمەرجی پێكەوەنانی نەتەوە.

بەڵام بێگومان هەر كۆمەڵە خەڵكێك نیشتەجێی هەر خاكێك ئەبن، ئەو خاكە بۆیان ئەبێت بەنیشتمانو پێوەندییەكی ماددیو دەروونی ئەكەوێتە نێوان خەڵكو خاكەكەوە.

بۆیە نیشتمان، گیانی نیشتمان پەروەری لەدڵو دەروونی دانیشتوانەكەیدا پەروەردە ئەكاتو جێگاو ڕێگایەكی ئێجگار گرنگو بایەخدار بۆ خۆی ئەكاتەوە، كە لەپێناوی پاراستنیدا هەموو فیداكاریو لە خۆبوردنێك سوكو ئاسان ئەبێت.

مرۆڤ هەر لەوكاتەی بەساوایی پێ ئەنێتە سەرزەویو دێتە جیهانەوە چاوی بەخاكی نیشتمانەكەیدا هەڵدێت، بەرەبەرە ئۆگری ئەم نیشتمانە ئەبێتو دیمەنەكانی لاشیرین ئەبێت، پێوەندییەكی پیرۆز لەتەك ئاووهەواو شاخو دۆڵو ڕووبارو چەمو دەریاو بیابانو جەنگەڵو هەموو بووەكانی نیشتمانەكەی خۆیدا پەیدا ئەكاتو لە بەرژەوەندی ماددییەوە ئەچێتە هەستو هۆشێكی دەروون ئامێزكە ئاگرێكی گەورە لە گیانو دڵدا ئەكاتەوە. ئەمە جگە لەوەی كەنیشتمان پەیوەندییەكی توندی بەگەلێ لایەنی ژیانی كۆمەلایەتییەوە هەیە، وەكو لایەنی پێناسنامە (الجنسیه) كە گەلێ دەوڵەت ئەیكەن بە پێوەری ژیانو گوزەرانی تاكەكەسو خێزانەكەی لەنێو دەوڵەتەكەدا.

هـەروەها خـاك‌و ئاووهـەواو پیت‌و بەرەكـەتی، كـارێكی فـەرامۆش نـەكراو ئەكەنـە سـەر دوو مـەرجی تـری پێكـەوەنانی نەتـەوە، ئـابوری‌و مێـژوو، كـە لەمـەولا لەسەریان ئەنووسین.

بێگومان خاكی بەپیت‌و بەرەكەت‌و خاوەن كانزاو ڕەخسێنەری هەل‌ومـەرجی ژیـان‌و گوزەرانێكـی لـەبارو ئاسـان، دانیشـتوانەكەی تونـد بەخۆیـەوە ئەبەسـتێت‌و بەپێچەوانەی ئەمەشەوە خەڵكەكەی ڕەوی لێ ئەكەن‌و ڕوو ئەكەنە وڵاتانی تر.

هـەر دووبارەكـەی ئـەم دیاردەیـە، بـەدرێژایی ژیـانی ئـادەم زاد مێژوویـەكی دوورو درێـژی كۆچكـاری‌و داگیركـاری‌و پێكاهـەڵپژان‌و جـەنگ‌و خوێـن ڕشـتن‌و ئـاوەدان كردنـەوەو شارسـتانێتی گواسـتنەوەی لـەنێو كۆمـەڵگای مرۆڤایـەتیدا دروست كردووە.

شەپۆلە كۆچكاری‌یە بەناوبانگەكانی دورگەی عەرەبی بەرەو وڵاتانی عـێراق‌و سـوریاو لوبنـان‌و فەڵەسـتین‌و بـاكوری ئەفـەریقا، بەگشـتی لەسـەرەتای پـەیدابوونی ئـاینی ئیسـلامەوە، هـەروەها شـەپۆلی كۆچكاری یەكـەم‌و دووەمی ئاری‌یەكان لـەودیو دەریـای خـەزەرەوە بـەرەو ئێران‌و هندسـتان‌و ئەفغانسـتان‌و كوردسـتان كەخـەڵكی ڕەسـەنی ئـەم ناوچانـەیان لـەخۆیانا توانۆتـەوەو بـوون بـەخاوەنی ڕاسـتەقینەی ئـەم وڵاتانە، هـەروەها كۆچی یـەك لـە دوای یـەكی تـورك‌و مـەغۆل بەرەو ئـێران‌و ئاسـیای بچوك نموونەی ئەم ڕەوتە كۆنەن.

ئـەم كۆچكردنانـەو ئـەو شـەڕو پێكاهاتنـەی لەئـەنجامی ئـەم كۆچكردنانـەدا هاتونەتە كایەوە، بوون بە بەشێكی گرنگ لەمێژووی نەتـەوەكانی كـوردو عـەرەب‌و فارس‌و تورك‌و ئەفغانی‌و هندی‌و پاكستانی‌و بلوژی ئەم ناوچانە.

بۆیـە شـارەزایانی ئـەم باسـە واتـا باسـی نەتـەوەو هـەندێكیان وەكـو (سـاطع الحصـری)و پسـپۆڕانی تـری ئـەم باسـە، هـەر خاكیـان فـەرامۆش كـردووە، چونكـە خۆیـان پـێ لـەوە ئـەنێن وەكـو لەمـەوپێش باسمـان كـردووە، ئـەو خاكـەی ئـەمڕۆ بەنیشـتمانی عـەرەب ناوبـانگی دەركـردووە (١٥٠٠) سـاڵ لەمەوبـەر جگـە لـە دورگـەی عـەرەبی‌و دوو پارچـەی زۆر بچـوك لـە ڕۆژئـاوای فـورات‌و خـواروی فەڵەسـتینی ئێسـتادا هیـچ خـاكێك لەمانـە، خـاكی قەومییـەتی عەرەب نەبووە.

لێرەدا جگە لەمانە بوونی خاکی تایبەتیو نەبوونی خاك، دوو زاراوە لەنێو کۆمەڵانی ئەم جیهانەدا دێنێتە کایەوە، کە نووسەرانی ئەم باسە تەنانەت زۆربەی شارەزایانی بابەتی قەومو نەتەوەش فەرامۆشیان کردووە.

ئەو خەڵکانەی زۆر بێ یاخود کەم لەسەر خاکی باووباپیری خۆیانو بەمیراتی هەزاران ساڵ بۆیان مابێتەوە، پێیان ئەوترێت قەوم یا نەتەوە.

بەڵام ئەوانە لەلایەکەوە کۆچیان کردووە یاخود کۆچیان پێ کراوەو چوونەتە سەر خاکی گەلو نەتەوەیەکی تر پێیان ئەوترێت کەمایەتی قەومی (الاقلیه القومیه)، وەکو تورکمان لە کوردستانی عێراقو چەرکەس لە ئەردەنو عەرەب لە تورکیا...

دیارە نیاز لەوانە نییە کە بەدرێژایی مێژوو قەومە ڕەسەنەکەیان لەناو بردووەو لەناو خۆیانا تواندویانەتەوەو نەتەوەی خۆیان کردووە بەخاوەنی خاکەیان وەکو عەرەب لە ژووررووی ئەفەریقاو ئەوروپاییەکان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا.

بەڵام داخی گران لە باسکردنی نەتەوەی کوردا لەلایەن زۆربەی مێژوو نووسانی عەرەبو دەزگاکانی ڕاگەیاندنی هەندێ وڵاتانی ئەوروپاوە کورد بە کەمایەتی قەومی ناو ئەهێنن، پشت بەوەی کورد بەژمارە لەعەرەبو تورکو فارس لەوڵاتانی عێراقو ئێرانو تورکیادا کەمتر بێ.

کورد ئەشێ لە ئازربایجانی جارانی سۆڤیاتیو ئەرمەنستانو قەفقاسیادا بە کەمایەتی قەومی ناوببرێت هەروەها لە لوبنانو ئەردەن دا، سەبارەت بەوەی لەخاکی نەتەوەیەکی تردا ئەژی.

دەربارەی خاكو نیشتمان زانای ئیتاڵیایی (باسکال مانتشینی) بەم جۆرە لەسەر نەتەوەی نووسیوە:

"[45]نەتەوە کۆمەڵگایەکی مرۆڤانەی سروشتکارە، بناخەی یەکێتی زەویو سەرچاوەو خوو ڕەوشتو هەستی کۆمەڵایەتیدا جۆش دراوە".

هەروەها فەیلەسوفی ئەڵەمانی (هردر) لەباسی نەتەوەدا ئەڵێت[46] "شوێن گای سروشتکار بەتایبەتی ئاووهەوا، دروستکەری سەرەکی پەیدابوونی قەومەکانە کە لە درەختی ناوکۆیی مرۆڤایەتی لکی لێ بۆتەوە".

هەروەها جۆرج حنا لەم بارەیەوە ئەڵێت[47] "هیچ نەتەوەیەك پێك نایەت ئەگەر خێزانی ئادەم زادییەکەی پێکەوە ماوەیەکی دوورو درێژ لەسەر خاکێك دا نەژین وە

ئەم کۆمەڵە خێزانە ئەبێ لەتەك یەکتریدا کار لەیەکتری بکەن و پێکەوە لەو ماوەیەدا جۆش بخۆن".

ئەوی ڕاست بێ لەکۆڕی ئەم باسەدا، دوو زاراوە هاتونەتە کایەوە، یەکەمیان نیشتمان پەروەری کەئەوە ئەگەیەنێت مرۆڤ دەست بەنیشتمانەکەیەوە بگرێت و خۆشی بوێت و بیپارێزێت و تەماعکارانی بیانی لێ دوور بخاتەوە.

دووەمیان نەتەوە پەروەری کە پێوەندی بەخۆشەویستی ڕۆڵەو نەوەی نەتەوەکەوە هەیە کە بەکۆمەڵە مەرجێك هاتۆتە کایەوە.

دەربارەی خاك و نیشتمان ئەو پسپۆڕانەی زۆر بایەخیان پێ نەداوە، لایان وایە کەخاکێ ئاووهەوای جۆراوجۆری هەبێ و لەیەکتری دوورو بەهۆیەکانی سروشتییەوە لەیەکتری داپچڕاو، وەکو شاخی بەرزو دۆڵی قوڵ و گەرماو سەرمای لەیەکنەچوو، بەرووبارو دەریاچەی پچڕ پچڕ بوو، گیانی نەتەوایەتی لاواز ئەکات و لەناو هەر کۆمەڵە خەڵکێك دا یەك زبان و یەك ڕەگەزیش بن.

هەروەها ئەڵێن زۆر هەن بەسەدان هەزارو بەملیۆنان وڵاتی باووباپیری خۆیان بەجێ هێشتووەو ڕوویان کردۆتە وڵاتێکی ترو کردویانە بەنیشتمانی خۆیان، وەکو خەڵکی ئێستای وڵاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکا.

هەرچۆنێك بێ مایەی شانازییە کە نەتەوەی کورد لەمانە ناچێت و هەزاران ساڵە لەسەر خاکی ڕەسەنی باووباپیرانی خۆی ئەژی هەر لەبەر ئەوەشە کە مۆسیقای خاکی کوردستان لەگوێچکەی هەموو کوردێکا هەمیشە ئەزرنگێتەوە!.

# مێژوو

مێژوو لەمەرجە هەرە گرنگەکانی پێکەوەنانی نەتەوەیە، کەزۆربەی پسپۆڕان و شارەزایانی کێشەی نەتەوەو نەتەوایەتی بەمەرجی سەرەکی یان لەقەڵەم داوە.

بێگومان ئەبێ هەربەم ئاست و ئەندازەیە بایەخ بدرێت بەمێژووی نەتەوە، چونکە مێژوو، وەنەبێ هەر بەخۆیەوە بەندبێ، بەڵکو ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەچۆنێتی پێکەوەنانی چەند ساڵە یاخود چەند هەزار ساڵەی هەر قەومێکەوە هەیە، هەروەکو پەیوەندی توندو تۆڵی بەهەستی قەومی و نەتەوایەتی و دەروونی و ڕۆشنبیری یەوە هەیە.

جگە لەمانە مێژوو لەکۆڕی بەربەرەکانی ژیان و خەباتی نێو گەلان و پێوەندییە گرنگەکانی نێو دەوڵەتاندا ئەبێت بە بناخەی هاندانی لاوانی ئەو قەوم و نەتەوەیە.

خاوەنێتی مێژووی جوامێری و ئازایەتی و شارستانێتی و خەبات کردن لەپێناوی ئازادی و سەربەخۆیی و پاراستنی زبان و خووڕەوشتی نەتەوایەتی، ئەوەندەی تر ئەو قەوم و نەتەوەیە بەرەو هەورازو ئاسۆی سەربەرزی و سەرفرازی و پێشکەوتن هان ئەدات. بۆیە هەندێ زانایانی بابەتی قەومی و نەتەوایەتی لایان وایە کەپێویستە لایەنە گەشەکەی مێژووی قەوم و نەتەوە بخرێتەوە بیرو لاوانی تازە نەمامی پێ پەروەردە بکرێت و ساوایانی پێ گۆش بکرێت.

دیارە مێژووی هەر گەل و نەتەوەیەك کاری ساڵ و دوو ساڵ و دەیان ساڵیش نی یە، بەڵکو زنجیرەیەکی دوورو درێژی بوون و نەشونما و پەروەردە بوون و هاتنە کایەی ئەمانەیە. هەروەکو لەنێو گەلانی تریش دا بایەخێکی گەورەی هەیە، کەخاوەنەکەی واتا خاوەن مێژووەکە لەنێو گەلان و نەتەوەکانی تری جیهان دا پێی

نەناسرێت، وەکو نەتەوەیەکی ئازاو جوامێرو سەربەرز، یاخود نەتەوەیەکی ئاشتیخوازو هاوسێ ویستو چاوتێر، یاخود بەپێچەوانەی ئەمەوە خاوەن مێژووی دڕندەو چاو برسیو شەڕ خوازو دەست درێژکەرو بێ ئامان.

بەسەربەرزی‌یەوە ئەتوانین بڵێین کە نەتەوەکەمان خاوەنی مێژوویەکی جوامێرانەو دلێرانەیە. لەتەك قەومو گەلو دۆستی ڕەوشت بەرزو خاوێن دا چاكو پاكو بەکەڵك بووە. بەڵام بەرامبەر زۆرداران و دەست درێژکەران و کەم فرسەتان و ناپاکان، جەنگاوەرو دلێرو لەکۆڕی بەربەرەکانی لەپێناوی مافی خۆیدا جوامێرو فیداکار بووە.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ڕاستی‌یەك بکەین کە وەکو هەندێ کەس خۆیان بەمێژوو نووس لەقەڵەم ئەدەن، مێژوو بەوە ئەزانن کەباسی چەند هۆزو عەشیرەتو سەردارو سەرکردەیەك جەنگی نێوان ئەمانە لەنێو خۆیاناو لەتەك هی گەلانی بیانی‌دا بکەن.

ڕاستی‌یەکەی ئەمە بریتی‌یە لە بەسەراچوونەوەو تۆمار کردنی چەند ڕووداوو بەسەرهاتێكو بەس!. دەنا مێژوو ئەو کۆمەڵە ڕووداوو بەسەرهاتە دوورو درێژە گرنگو بایەخدارەیە، بە لێکدانەوەی زانستیانەشیانەوە کە لە ئەفسانە هەرە کۆنەکانی نەتەوەکەوە بەناو هەموو لایەنە خۆش و ناخۆشی نەتەوەکەدا، تائەگاتە پێکەوەنانی قەوارەی نەتەوە کە لە دڵو دەروونی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەدا جێگیر ئەبێو هەمیشە لەبیرو هۆشیانا وەکو زەنگۆڵەیەکی خۆش ئاواز دەنگ ئەدەنەوە. بەلایەنە خۆشە بایەخدارە سەربەرزانەکانیان شادمان ئەبنو بەلایەنە لاوازەکانی چاکی هەوڵو تەقەللای لێ ئەکەن بەلادا کەچارەسەری بنەڕەتی بۆ بدۆزنەوە.

بێگومان هیچ نەتەوەیەك نی‌یە کە سەرانسەری مێژووەکەی بێگەردو لەکە بێت، بەتایبەتی کە نەتەوە وەکو هەموو بووەیەکی تری ئەم سەرزەمینە بەقۆناخی ساوایەتی‌و کۆرپەیەتی‌و هەرزەکاری‌و لاوێتی، تا پێگەیشتنی تەواودا تێئەپەڕی، ئەو زنجیرە ڕۆیشتنە، هەمەڕەنگە بەسەرهات بەخۆیەوە ئەگرێت.

جگە لە ڕەوتی چینایەتی، سەرکردەو دەسەڵاتدارانی هەموو قەومو گەلو نەتەوەیەك لەکۆڕی سەرکردایەتی چاكو خراپ، ڕاستو هەڵەیان لێ ئەوەشێتەوە کەئەبێتە بەشێك لەمێژووی ئەو قەومو گەلو نەتەوانە.

ئەوەتا بۆ نموونە قۆناخی دەرەبەگایەتی هەموو نەتەوەیەك پڕە لەكارەسات و ڕەوشتی خۆپەرستی و عەشیرەت و هەرێم خوازی كە لەتەك ڕەوشتی نەتەوایەتیدا ڕووبەڕووی یەكتری وەكو دوو دیاردەی ناكۆك لەیەكتری ڕاست ئەبنەوە.

بۆیە لێكۆڵینەوە و پیاچوونەوە و دەست بەسەرا هێنان و بژاركردن و گەشە پێكردنی لایەنە چاكەكانی مێژووی نەتەوە و ڕەخنە لێگرتن و شیكردنەوەی لایەنە ناتەواو و كزەكانی ئەم مێژووەش كارێكی گرنگی نووسەرانی دەست ڕەنگین و مێژووناسانی لێهاتوو نەتەوە پەروەرە.

كارڵ ماركس زۆر لەمەش زیاتر بەرەو پێش ڕۆیشتووە و ئەڵێت ئێستا كاتی ئەوە نەماوە مێژوو نووسان تەنیا مێژوو لێك (تفسیر) بدەنەوە، بەڵكو ئەبێ مێژوو بگۆڕن واتا گەلان لەقۆناخێكەوە بەرەو قۆناخێكی پێشكەوتووتر ببرێت.

فەیلەسوفی ئەڵەمانی بەناوبانگ فیختە *Fiehte* لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمین دا پاش ئەو كوێرەوەرییەی ناپلیۆن بەسەر وڵاتەكەیدا هانیبوی، كتێبێكی بەناونیشانی (وتووێژێكی نیشتمانێتی) بڵاوكردۆتەوە تێیدا لەتەك پیاوێكی پروسیاییدا ئەم وتووێژەی خوارەوە ئەكات.

[٤٨] "فیختە: تۆ، ئەڵەمانی نیت؟ وەڵامی پیاوەكە:

بێچەندو چوون، نەخێر.. ئەڵەمانی نیم بەڵكو من پروسیم، وە شانازی بە پروسێتی خۆمەوە ئەكەم و بە شتێكی تر قایل نابم.

فیختە پێی ئەڵێت: چاك گوێم لێ بگرە، ئەو جیاوازییەی لەنێوان خەڵكی پروسیا و بەشەكانی تری ئەڵەمانیدا هەیە تەنیا ڕووداوی لاوەكی سەرزارەكی لابەلایە كەلەئەنجامی ڕووداوی بێسەرو پێی لە (صدفە)ی ڕووتەوە لەدایك بوو هاتۆتە كایەوە.

بەڵام ئەوەی ئەڵەمانی لەگەلانی تر جوێ ئەكاتەوە شتێكی بنچینەیی سروشتكارە كە لەزماندا خۆی ئەنوێنێ و ناوكۆیی نێو هەموو ئەڵەمانێكە و لە هیتریان بەشێوەیەكی سەرەكی جیا ئەكاتەوە".

فیختە هەرچەندە لێرەدا باسی زمان ئەكات، بەڵام ڕاستییەكەی پەیوەندی بەمێژووە پتر هەیە تا زمان، چونكە ئەوساكە هەرێم پەرستی لەناو لەناو ئەڵەمانێكاندا فەرمانڕەوا بووە و هێشتا بەتەواوەتی گیانی نەتەوایەتی پەرەی نەسەندووە و هەموو

ئەڵەمانییەکی دەوڵەتۆکەکانی ئەڵەمانیا خۆیان بەخاوەنی یەك مێژوو نەزانیوە یا یەك زبانیشیان هەبوو بێت تائەو مێژووە لەتەك مەرجەکانی تردا یەکیان بخاتو دەوڵەتێکی نەتەوایەتی بۆ خۆیان پێکەوە بنێن.وەکو لەم ساڵانەی دواییدا دەیان ساڵ دوای دوو پارچەکردن ئەڵەمانیای ڕۆژئاواو ڕۆژهەلات بوونەوە بە نەوە ئەڵەمانێکە.

ئەگەر نەتەوەیەك مەرجەکانی نەتەوایەتی خۆی پالاوتە یا کاکڵە کردبێت نە داگیر کردنو نە پارچە پارچە کردن ڕێگای یەکێتیو دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوایەتی لێ ئەگرن. هەروەها (ساطع الحصری) گلەیی لەو میسرییانە ئەکات کە ئەیانەوێت میسر لەعەرەبایەتی داماڵن.

بەنموونە لطفی السید ئەهێنێتەوە کە باسێکی سیاسی لەگۆڤاری (المصور)دا بلاوکردۆتەوەو لە بەشێکیدا ئەڵێت:

"[٤٨]هەروەها ئێمە، میسرییەکان پێویستە دەست بە میسریایەتی خۆمانەوە بگرینو خۆمان بەهیچ نیشتمانێکەوە نەبەستین جگە لە میسر، با رەسەنیشمان حجازی یا سوری یا چەرکەسی یاهیتر بێت، پێویستە پارێزگاری قەومییەتی خۆمان بکەینو دەستی ڕێز لەخۆمانو نیشتمانەکەمان بنێینو خۆمان بە نیشتمانێکی ترەوە نەبەستین..."

هەروەها لە بلاوکراوەکانی تریدا گلەیی لە گەلێك نووسەرانو بیرکەرەوانو کەسانی هەرێم پەرست ئەکات لە سوریاو لوبنانو باکوری ئەفەریقاو جێگایانی تری ناسراو بە نیشتمانی گەورەی عەرەب. وە نەبێ ئەو ڕەخنەو گلەییەی (ساطع الحصری) هەر لە سنوری نووسەراندا پەنگی خوادبێتەوە، بەڵکو یەخەی گەلێ دەوڵەتانی عەرەبو پارتی نەتەوەییو نا نەتەوەیی عەرەبی بە زەقو ئاشکرا نەگرتۆتەوە، کە لە لایەکی تری ئەم باسەماندا هەندێك بە دوورو درێژی لەسەری ئەدوێین.

حزبی قەومی سوریو پرۆژەی (الهلال الخصیب) نموونەی زەقی هەرێم پەرستیو ناوچەخوازی نێو گەلانی عەرەبە.

ئەمە جگە لەوەی کە تا ئێستا عەرەب نەیتوانیوە هەنگاوێکی ڕاستەقینە بەرەو یەکێتی عەرەب بنێت، جگە لەو هەوڵە کاتییە ژێر کەوتووەی کۆماری عەرەبی یەکگرتووی نێوان میسرو سوریا.

ئەوەی ڕاست بێ وەك (ساطع الحصری) یەكێتی عەرەبی بەستووە بەزبان و مێژوووەوە، بەلام بەسەرهاتی كێشەی یەكێتی عەرەب و ناتەبایی و ناكۆكی نێوان دەوڵەتانی عەرەب هیچ نەبێت ئەو ڕاستی‌یە ساغ ئەكەنەوە كەئەم دوو مەرجە هەرگیز نەتەوەیەك پێك ناهێنن، چونكە ئەگەر پێیان پێك بهاتایە ئەبوو دەمێك بوایە نەتەوەی عەرەب لە نیشتمانی گەورەی عەرەبدا لە دوورگەوە تا ئەتڵەسیی دەوڵەتێكی یەكگرتووی عەرەبی دابمەزرانایە.

ساطع الحصری دەربارەی پێكەوەنانی نەتەوە ئەڵێت[49] "گرنگترینی ئەو هۆیانەی ئارەزوی یەكێتی لە دەروندا دروست ئەكەن، وە ئەبن بەهۆی پێكەوەنانی قەومایەتی و ڕێكخستنی نەتەوە هەر ئەمەن- یەكێتی زبان و مێژوو-".

لەجێگایەكی ترا ئەڵێت[50] "بەلام مێژوو كە بریتی‌یە لە هەست و بیرەوەری نەتەوە، هەر نەتەوەیەك لە نەتەوەكان هەست بەخۆیایەتی ئەكات و كەسایەتی خۆی (شخصیتها) بەهۆی مێژووی تایبەتی خۆیەوە پێك ئەهێنێ".

دە باشە ئەگەر وەكو بۆچوونەكەی ساطع الحصری بوایە چ نەتەوەیەك لەنەتەوەی عەرەب زبانێكی ڕێك و پێك و پاراوتری هەیە و مێژوویەكی دیار و نووسراوی بۆ بەجێ‌ماوە؟!

ئەی كەواتا بۆچی تا ئێستا گەلانی عەرەب نەیانتوانیوە یەكێتی‌یەكی عەرەبی هیچ نەبێ لەنێو دەوڵەتە عەرەبی‌یە ئازاد و سەربەخۆكانیانا دابمەزرێنن؟!

بێگومان وەلامی ئەم پرسیارە لە دوو خاڵ تێناپەڕێت.

یەكەمیان: ئەبێ تائێستا عەرەب هەموو مەرجەكانی پێكەوەنانی نەتەوەی گەلاڵە نەكردبێت، وە وەكو ساطع الحصری ئەڵێت بە زبان و مێژوو نەتەوە نەیەتە دی.

دووەمیان: هێزێكی گەورەتر هەیە شورەیەكی پۆلایینی خستۆتە نێوان وڵاتانی عەرەبەوە و جارێ لەئاواتی یەكێتی كەئاواتی هەموو نەتەوە پەروەرێكی عەرەبە نائومێدی كردوون.

لێكۆڵینەوەی ئەم باسە بەندە بەدوو خاڵەوە، كە هەردووكیان توندوتۆڵ بەیەكەوە بەستراون و سەرە و خواری یەكتری شەتەك ئەدەن.

یەكەمیان: ناكۆكی و دووبەرەكی نێوان كۆمەڵگا، دزی جەمسەری هەموو بووەیەكی ئەم جیهانە.

دووەمیان: کێشەی ئابوری، یاخود ژیانی ئابوری مەرجی سەرەکی پەیدابوونی نەتەوە کە فەرامۆشکردنی بۆ نی‌یە. وە لە لاپەڕەکانی داهاتودا بەپێی بەهای خۆیان لێیان ئەکۆڵینەوە.

جارێ بگەڕێینەوە سەرباسی مێژوو، دوکتۆر لطفی عبدالوهاب یحیی دەربارەی مێژووی ناوکۆیی ئەڵێت[51] " بریتی‌یە لە تاقیکردنەوە ناوکۆییەکان کە بەری بوونی کەسانی کۆمەڵگایەکی دیاری کراون بەدرێژایی زەمان لەنێو زروفی سیاسی‌و ئیداری‌و شارستانێتی ناوکۆیی‌دا هاتونەتە کایەوە".

لە لێکۆڵینەوەی بزوتنەوەی نەتەوایەتی هەر نەتەوەیەکدا لەسەرەتاوە ئەم دیاردەیە دێتە پێشچاو کەپێشڕەوانی بزوتنەوەی نەتەوایەتی بە زیندوکردنەوەو بەرچاوخستنی لاگەشەکانی مێژووی نەتەوەکەیان ڕۆڵەکانی گەلەکانیان بۆ خەبات لەپێناوی دەستخستنی مافی ڕەوای نەتەوایەتیدا هان ئەدەن.

هەر دەربارەی ڕۆڵی مێژوو لە پێکهێنانی نەتەوەدا ئیلینا مودر جنسکایا ئەڵێت[52] " مارکسی‌یەکان لایان وایە کەنەتەوە کۆمەڵە خەڵکێکی نیشتەجێ‌یە بەدرێژایی مێژوو پێکهاتووە، دەرکەوتنەکەشی لەسەر بناخەی یەکێتی زمان‌و زەوی‌و ژیانی ئابوری‌و شێوەی دەروونی کەلە ڕۆشنبیری قەومایەتیدا خۆی ئەنوێنێ، دامەزراوە.

نەتەوە دیاردەیەکی مێژووییە، نەتەوە لەقۆناخێکی دیاریکراوی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا دەرئەکەوێت".

ڕاستی‌یەکەی سەرەڕای ئەم مەرجانە هەمووی، ستالین‌و هەموو مارکسی‌یە کلاسیکی‌یەکان ژیانی ئابوری بەمەرجی سەرەکی فەرامۆشنەکراوی پێکەوەنانی نەتەوەی لەقەڵەم ئەدەن، کە لە باسی ژیانی ئابوریدا بەدرێژی لێی ئەدوێین.

## کەلە پورو ئاوازی دەروون

هەروەکو زۆربەی مەرجەکانی تری پێکەوەنانی نەتەوە کەمو زۆر پەیوەندییان بەیەکترییەوە هەیە، هەروەها ئەم مەرجەش لەم بناخە زانستییە ناچێتە دەرێ. بگرە پتر پەیوەندی بە جوگرافیا و مێژو و زبان و بەشەکانی تری پێکەوەنانی نەتەوەوە هەیە.

لێرەدا باسی هەر مەرجێك ئەکەین بە بەشێکی پێویستو ستونێکی گرنگی دامەزراندنی نەتەوەی ئەزانین، چونکە بەدووی ڕەوتی ئەو پسپۆڕو زانایانەدا ناڕۆین کەمەرجێك یاخود دوو مەرج بە ستونی تەواوی دامەزراندنی نەتەوە ئەزانن. بەتایبەتی ئەوانەی زبانیان کردووە بە دەسکەلای گەورەی باسەکەی خۆیان.

چونکە چەند نەتەوەیەکی جیاجیا هەن بەیەك زبان ئەدوێن وە ئەو یەکبوونی زبانە نەیکردوون بەیەك لەتەوە. وەکو ئینگلیزو ئەمەریکایی و نەرویجو دانیمارکیو فەرەنسایی و کیوبگی کەنەدایی.

ئەمانە چەند نەتەوەیەکی جیاجیان وەکو ئینگلیزی بەریتانیا نەتەوەیەکی جیاوازە لە ئەمەریکایی ئنگلیزی زباندا، هەروەها نەرویجو دانیمارك بەیەك زبان ئەدوێنو دوو نەتەوەیان پێکهێناوە، فەرەنسایی-ش نەتەوەیەکەو کیوبگ لە کەنەدا نەتەوەیەکی ترە هەرچەندە هەردوو لایان بەزبانی فەرەنسایی ئەدوێن.

دەربارەی ئەم بەشەی باسەکەمان وەکو وتمان پەیوەندی بە پێشکەوتنو پاراوی زبانو چۆنێتی هەڵکەوتی جوگرافی وڵاتی ئەو قەومو نەتەوەیەو مێژووی دوورو درێژیيەوە هەیە.

ئەو وڵاتانەی فرە ئاووجۆگەو کانیاو کارێزو ڕوبارو دەریاچەن، یاخود کەوتونەتە سەر دەریاوە، خەڵکەکەی سەبارەت بەوەی زوو نیشتەجێ بوونو

شارستانێتی‌یەکی تایبەتی‌یان بۆخۆیان دامەزراندوە، بەپێی هەڵکەوتی جوگرافی وڵاتەکەیان بەجۆرە کشتوکاڵو پیشەسازی‌و هونەری تایبەتی‌یەوە خەریك بوون، ئەم خەریك بوونە تایبەتی‌یە لەگیانی رۆشنبیری‌و نەریتو خوورەوشتو لایەنە هەستخوازییەکانی خۆیدا لە کێشە دەرونی‌یەکانی رۆڵەکانیدا بەشێوەیەکی تایبەتی رەنگی داوەتەوە، کە لە هی گەلانی نزیكو دووری خۆی کەمو زۆر جیاوازی‌یەکی تایبەتی هەیەو بەئاشکرا لەژیانی رۆژانەو هەڵسوکەوتو پەندی پێشینانو چارەکردنی کێشەو بەرەی ناوخۆدا بەئاشکرا رەنگ ئەدەنەوە.

هەروەها ئەم لایەنە واتا گیانی رۆشنبیری‌و دەروونی هەرقەومو نەتەوەیە توندوتۆڵ بەندە بەمێژووی دێرینو نوێی قەوم نەتەوەکەوە. هەروەکو ئاینی کۆنو نوێی ئەو قەومو نەتەوەیەش ئەبێت بە بەشێك لەم لایەنە دامەزراوە.

دەربارەی نەتەوەی کورد کە هیچ نەبێ لە پەیدابوونی دەوڵەتی میدیاوە تا بەهێزبوونی ئاینی ئیسلام لەکوردستانا لەسەر ئاینی زەردەشتی بووەو بەپێی ئاوێستای پیرۆزی ئەم ئاینە بەرێوە چووەو دوای ئەوە ئاینی ئیسلامی پەسەند کردووە، هەردوو ئاینەکە هەروەکو بوون بە بەشێك لەمێژووی کۆنو نوێ، هەروەها بووشن بە کەرەسەی پێکەوەنانی ژیانی رۆشنبیری‌و ئەڵقە ئەڵقەی زنجیرەی ژیانی دڵو دەروونی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان.

زۆر بەرِوونی لەئەفسانەو چیرۆكو گۆرانی‌و پەندی پێشینانو کەلەپوری نەتەوایەتی رەنگیان داوەتەوە. هەروەها کشتوکاڵو پیشەسازی‌و جۆری نیشتەجێ بوونو سەرجەم بەشەکانی تری شارستانێتی کاریان لەقەوارەی هونەرە جۆربەجۆرەکانی نەتەوەی کورد کردووە.

وەکو لەپێشەوە باسمان کرد، قاپو قاچاخی فەخفوری لەچەند هەزار ساڵی پێش زایینی‌دا، دانیشتوانی کوردستان لە چەمچەماڵو خەڵکی چەند ناوچەیەکی تری کوردستان پێش گەلانی تری ناوچەکە زەفەریان پێ بردووەو دەست رەنگینییان تێدا کردووە.

بەکورتی ئەم لایەنە سەرخانی سەدانو هەزاران ساڵی کۆبووەوەی ژێرخانی ماددی‌و ئابوری نەتەوەیە، لەتەك گۆڕانی ئەم ژێرخانەدا بە کزبوونو

پێشکەوتن، با سستڕەوی و گورجڕەوی ئەو قەومە، ئەم سەرخانەش هەنگاو هەڵئەنێ یاخود پێوەی دیار ئەبێ.

واتا کەلەپوورو لایەنە ڕەوانی یەکانی هەر قەومو نەتەوەیەك بەدرێژایی مێژوو لەکۆڕی جۆش خواردنی مێژووی دوورو درێژو جوگرافیاو شارستانێتی و ژیانی ئابوری و ئاست و ئەندازەی پێشکەوتنی زبان و تەنانەت سەروەری و دەسەڵاتدارێتی قەومی یاخود داگیر کراوی و ژێر دەستەییدا دەق ئەگرن و چوارچێوە بەدەوری خۆیانا ئەکێشن.

دەربارەی ئەم ستونەی نەتەوە لەم پەڕی ڕاست تا ئەوپەڕی چەپ بەمەرج و بەڵگەی سەرەتایی پێکەوەنانی نەتەوەیان لەقەڵەم داوە و باسیان کردووە و لێی کۆڵیونەتەوە. هەروەکو خۆشیی شایانی ئەم بایەخ پێدانەیە و بەڕاستی بەشێکی گرنگی تەواوکەری مەرجەکانی دامەزراندنی نەتەوەیە کە هەرگیزاو هەرگیز فەرامۆش ناکرێت، وە فەرامۆشکردنی لایەکی گرنگی گیانی ماددی و دەروونیی ئەم باسە کەل و لەنگ ئەکات.

لەم بارەیەوە خاتو ئیلینا مودر جنسکایای مارکسی بیروباوەڕ ئەڵێت[٥٢] "ڕووکاری چوارەم یەکێتی شێوەی دەروونی یە، ڕەنگ و ڕووی قەومی بەو زروفە مەوزوعییانەی لەئەنجامی بوونی خەڵك و مێژووەکەیانەوە دێتە کایەوە. لەخاك و ئاووهەوا پەیدا ئەبێت و ڕەنگی خاسییەتەکانی پێشکەوتنی ئابوری و سیاسی و خەباتی چینایەتی ئەداتەوە. ڕەنگ و ڕووی قەومایەتی لەباری ڕۆشنبیری قەومایەتیدا خۆی ئەنوێنێ.

نەتەوە کە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی یە، ئەو کۆمەڵێکی ماددی یە (لەڕووی ژیانی ئابوری و خاکەوە)، زبانەوانی و بیروباوەڕە (لەلایەن ڕەنگ و رووی دەروونی یەوە). ڕەنگ وڕووی دەروونی نەتەوە بێگومان ئەنجامی زروفە ماددی یەکانێتی.

بەم جۆرە نەتەوە بەرهەمی پێشکەوتنێکی دوورو درێژی مێژووی قورس و گرانە".

خاتو ئیلینا مودر جنسکایا وەکو ستالین و هەموو مارکسی یەکانی تر، لایەنە دەروونی یەکانی نەتەوە بە سەرخانی ژێرخانی ماددی نەتەوە لێك ئەداتەوە، کەخاك و ژیانی ئابوری وڵاتە، واتا لایەنی ڕۆشنبیری و بیروباوەڕ و هونەرو بەشە

دەروونی‌یـــەکانی تــر هـــەموویان لای ئـــەو ڕەنگدانـــەوەی لایەنـــە ماددی‌یـــەکانی هـەر نەتەوەیــەکن، کــە ڕاســتی‌یەکەی ئەگــەر هــەندێك-یــش زیادەڕەوییــان تێــدا کردبێــت، بــەڵام لــە گەوهــەردا ڕاســتو ڕەوان بــۆی چــوون، چونکــە ئــەم لایەنانــە تــەنیا بــەزیرەکی‌و دانــایی چــەند بیرکــەرەوەو شــاعیروبوێژو مێــژوو نــووس‌و نووسەرێك پێك نایەن.

هــەروەها تــاکو پابــەندی ئایدیۆلۆژییــەتێکی تایبــەتی لــەم کــۆڕەدا نــەبین‌و بیروباوەڕی جۆراوجــۆر بخەینــە پێشــچاو، وا دەربــارەی گیــانی ڕۆشــنبیری وتــەکانی دوکتۆر (ابراهیم انیس) بەنموونە ئەهێنینەوە کە ئەڵێت[٥٤] "کە بە دووی پێناسێکی بەجێدا دەربارەی ڕۆشنبیری ئەگەڕێین، بۆمان دەرئەکەوێت کەهەر واتای ئەو ڕێگا بەمیرات بەجێ ماوەی ژیانی گەلێك لەگەلان ئەگەیەنێت.

کە لە شارستانێتی کلاسیکی گەلێك ئەدوێین ئەبینین کە هونەرو پیشە هەرە دێرینەکان ئەگرێتەوە، هەروەها یاساکان-یشی وە تێڕوانینی دەربارەی دامەزراندنی کۆمــەڵگاو چۆنێتــی ڕەوشــتو چاکــەکاری‌و پایــە بــەرزی ئەوانــەی ئەیگرنــە خۆیــان ئــارەزووی ڕێــك‌و پێــك‌و ئاســۆ بــەرزی‌و لێبوردنــی ئــەو گەلــەش ئەگرێتــەوە، بــەڵکو ڕووخۆشی‌و گاڵتەو گەپی نێوان ڕۆڵەکان-یشی.

کە وشەی شارستانێتی لەتەك بیابان گەریدا بەراورد ئەکەین لەو واتایە بەولاوە شتێکی ترمان ناخاتە پێشچاو کە ئادەم زاد لە شاردا ئاسودەو ڕێك‌و پێك ئــەژی، لەکۆمەڵگایەکدا کەدەست بەیاساوە ئەگرێت‌و ملی بۆ شۆڕ ئەکات.

ئەمەش قۆناخێکە لە قۆناخەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی کە لە پێشکەوتنێکی دوورو درێژی سەختی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا هاتۆتە کایەوە".

لــێرەدا دوکتــۆر (ابراهیــم انیــس) شــارەزایانە دەســتی بــۆ دوو خــاڵی گرنــگ ڕاکێشاوە:

یەکــەمیان: شارســـتانێتی کلاســـیکی بەهونــــەرو پیشــــە میللــــی‌و ژیانــــە دەروونی‌یەکانەوە.

دووەمیان: خۆڕزگار کردن لە کۆچەرایەتی‌و بیابان گەری کە هەردووکیان بــۆ پێکەوەنانی نەتەوە پێویست‌و ستونی پتەوی پێ دادەمەزرێن.

هەروەها ف. افاناسییف دەربارەی نەتەوە ئەڵێت[٥٥] "بناخەی نەتەوە لەسەر پێوەندی خوێن دانەمەزراوە بەڵکو لەسەر بناخەی ناوکۆیێتی خاک و زمان و ڕۆشنبیریێتی دامەزراوە".

بەلای ئەمەوە قەومییەت لە نەتەوایەتی یاخود قەوم لە نەتەوە فراوانترە، چونکە هەر دوا بەدوای باسەکەی پێشووی ئەڵێت "قەومییەت وەکو نەتەوە خاوەنی خاک و زبان و ڕۆشنبیری ناوکۆییە، بەلام قەومییەت بەپێچەوانەی نەتەوەوە کۆمەڵە خەڵکێکی نیشتەجێیە، وە (لینین) ئەوەی بەدیار خستووە کە لایەنە ئابوورییە قوڵەکان قەومییەتیان دامەزراندووە".

وەکو لەپێشەوە وتمان تێکەڵاوییەک لەنێوان وشەو واتای گەل و قەوم و نەتەوەدا لای زانایانی ئەم باسە بەپێی بیروڕای جۆراو جۆری خۆیسان پەیدابووە، بەلام لە ناوەڕۆکدا کە خوێنەر باسەکانیان ئەخوێنێتەوە باسە سەرەکییەکەی بۆ ڕوون ئەبێتەوە، وەکو ئەوەی ف. افاناسییف وشەی قەومی لە بریتی نەتەوە بەکارهێناوە.

لەلایەکی ترەوە (عبداللطیف شرارە) بەم جۆرە لە ڕۆشنبیری ئەدوێت[٥٦] "ڕۆشنبیری بەم مانا گشتییە فراوانە ژیان و وزەو لایەنە بەنرخەکان و بیروباوەڕو هەستە، کە بەو پێیە هەر واتای پێکهێنانی دەروونی ئەگەیەنێت کە ستالین بەیەکێک لەچوار مەرجە سەرەکییەکەی پێکەوەنانی نەتەوەی لەقەڵەم داوە".

نووسەری باسەکە لە لێکۆڵینەوەی خۆیدا ئەڵێت[٥٧] "پێویستە جارێکی تر سووربین لەسەر ئەوەی (یەکێتی ڕۆشنبیری) یاخود (شارستانێتی) یا (پێکەوەنانی دەروونیی) (التکوین النفس) وەکو پایەیەک لە پایەکانی کۆمەڵگای قەومێک یا نەتەوەیەک- بەم زاراوانە نیازمان وایە بۆچوونێکی مەعنەوی پەتی کە بەهۆی بۆچوونەکان و ڕەوشتە بەرزەکانەوە- ئەچێتە ئەو ئاستەی کەهەموو ڕێگاو شێوەیەکی کەسانی کۆمەڵگایەکی دیاریکراو دەربارەی ڕووداوە جۆراو جۆرەکان لەژیانا دووچاریان ئەبێت یەکبخات.

بەم پێیە کەلەپوور و شارستانێتی هەر نەتەوەیەک یەکێکە لەمێیە دەستەبەر کەرەکانی مانەوەی کۆمەڵگا و بەردەوامی پێکەوە بوون کە داواکانی ڕۆڵەکانی کۆمەڵگاکە لەپێکەوە ژیانێکی ڕێک وپێکدا دەستەبەر بکات".

ئەبێ پێش ئەوەی کۆتایی بەم باسە بهێنین دەست بۆ ئەو ڕاستی‌یە ڕابکێشین کەهەرچەندە هەر قەومو نەتەوەیەك خاوەنی کەلەپورو ژیانێکی ڕۆشنبیری تایبەتین، بەڵام وەنەبێ ئەم لایەنەی ژیانیان نە بەکەڵکی نەتەوەو قەومی تر هاتبێ و نەخۆشیان کەڵکیان لەهی قەومو نەتەوەی دراوسێ و هی دووریشەوە وەرگرتبێت.

وەکو ئەزانین لە کاتی ئاشتی و ئاسایشدا گەلان تێکەڵ بەیەکتری ئەبن و ئاموشۆی یەکتری ئەکەن و پەیمانی سیاسی و ئابوری و ڕۆشنبیری لەتەك یەکتریدا ئەبەستن و لەکاتی جەنگ و ناخۆشیشدا لادەسەڵاتدارە زۆردارەکە بۆ ماوەیەکی کەم یا زۆر لایەنە جۆراو جۆرەکانی ژیانی خۆی بەسەر قەومو نەتەوەو گەلە ژێر دەستە داگیر کراوەکەدا ئەسەپێنێ، کە بێگومان کەمو زۆر هەردوولا لە لایەنە باشەکانی یەکتری کەڵك وەرئەگرن. وەکو تێکەڵاو بوونی شارستانێتی میدیا و کاشی‌یەکان و عیلامی و سۆمەری و ئەکەدی و ئەخمینی و یۆنانی ئەسکەندەرو ئاشوری و کلدانی و فیرعەونی لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا .

هەروەها تێکەڵاو بوونی ئەم بارەی ژیانی خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکوری ئەفەریقا بە دەسەڵاتدارێتی دەوڵەتانی عوسمانی و سەفەوی و ڕووسی قەیسەری و بەریتانیای گەورەو فەرەنسا و ئەڵەمان....

وە ئەبێ ئەم کەڵك وەرگرتنەش لەهەر بارێکەوە هاتبێتە کایەوە لەژیانی مرۆڤایەتیدا لایەنێکی نەنگ و بێ کەڵك بێت، بەڵکو بەپێچەوانەی ئەمەوە باری ڕۆشنبیری گەلان و نەتەوەکانی جیهانی بەگشتی بەرەو پێش بردووەو سامانێکی نوێی خستۆتە سەر سامانی تایبەتی هەر گەل و نەتەوەیەك هەرچەندە ناو بەناویش هەندێ داگیرکەرانی درندە بەهەموو توانایانەوە هەوڵی لەناوبردنی ژیانی ڕۆشنبیری و کەلەپوری نەتەوایەتی نەتەوە داگیرکراوەکانیان داوە.

# هەندێ بیروڕای تر دەربارەی نەتەوە

بەپێی هەل‌و مەرجی سیاسی‌و ئابوری‌و ناکۆکی نێوان نەتەوەو نەتەوەیەکی تر، یا دەوڵەت‌و دەوڵەتێکی تر، یاخود چەند دەوڵەتێك لەنێو یەکتریدا هەندێ بیروڕاو تیۆری تر دەربارەی پێکەوەنانی نەتەوە کەوتونەتە ناو ناوانەوە.

ڕاستی‌یەکەی چونکە تاکە مەرجێك هەرخۆی ناتوانێت وە لەمەوبەریش نەیتوانیوە ببێت بەهۆی پێکەوەنانی نەتەوەیەك، یا ڕاستکردنەوەی قەومێك بۆیە هەندێ تیۆریست‌و پسپۆڕانی ئەم بابەتە بۆیان لواوە ئەسپی خۆیان لە گۆڕەپانی بیروڕای نەتەوایەتیدا تاو بدەن‌و تاڕادەیەکیش دۆست‌و باوەڕ پێکەران لەدەوری خۆیان کۆبکەنەوە، یاخود هیچ نەبێت ئاژاوەیەکی ئایدیۆلۆژی لەنێو تیۆری‌یەکانی تردا بنێنەوە.

ئەوی ڕاست بێ نموونەی هەرە زەقی ئەم باسە تیۆری ئارەزوو (المشیئە)ی قوتابخانەی فەڕەنسایی‌یەو بیروڕای پێدا هەڵپژانەوەو خۆ لەمەترسی بیانی ڕزگار کردنە. ئەم دوو بیروڕایە هەردووکیان لکی مەرجەکانی ترن‌و لێیان دابڕیون‌و کردوویانن بەدوو باسی سەربەخۆ.

قارەمانی تیۆری یەکەم کە کراوە بە ستونی سەرەکی دامەزراندنی نەتەوە، واتا تیۆری ئارەزووی پێکەوە ژیان (نظرية مشيئە المعيشە المشتركە) لە لایەن (رینان)-ەوە، وە بەدوای ئەودا مێژوو نووسی فەڕەنسایی (دوکولانج)-ەوەو کەسانی فەڕەنسایی تریش کەبەدوای ئەم دوانەدا دێن.

رینان ئەڵێت[58] "نەتەوە گیان‌و گەوهەرێکی دەروونی‌یە.ئەم گەوهەرە دەروونی‌یە لە دوو فرمان پەیدا ئەبێ، یەکێکیان بەندە بە ڕابوردووەوەو ئەویتریان بەئێستاوە، وە هەردووکیان توندو تۆڵ بەیەکەوە بەستراون.

چونکە هاوبەشێتی لە کەلەپوورێکی بەنرخی بیرەوەری کۆندا وە ئارەزووی پێکەوە ژیان لەتەك دەست گرتن بەم کەلەپورە دەروونی‌یە ناوکۆییەوە، وە تەقەللادان بۆ پەرەپێدانی، ئەمە بناخەی هەموو بناخەیەکی پێکەوەنانی نەتەوەیە".

ڕاستی‌یەکەی ئەم تیۆری‌یە لەکاتێکدا بڵاوبۆتەوە کە نووسەرو بیرکەرەوەکانی ئەڵمانی و فەرەنسایی هەریەکە لەکاتی جەنگی هەفتاییدا (الحرب السبعينيه) باسی ناوچەی (الزاس)یان کردووە، وە هەردوو دەوڵەتی ئەڵمان و فەرەنسایی بەخۆیەوە خەریك کردووە.

هەر لەم بارەیەوە مێژوو نووسی فەرەنسایی دوکولانج ئەڵێت[٥٩] "لەوانەیە ئەلزاسی‌یەکان بەزبان ئەڵمانی بن بەڵام بەهەر حاڵ بەویست و ئارەزوو فەرەنسایین. وە نەبێ (فتح)-ەکانی لویسی چواردەیەمین و پەیمانی (وستناليا) کە ئەڵمانی‌یەکان خەیاڵیان داوەتێ کردبنی بە فەرەنسایی، بەڵکو ئەمە شۆڕشێکی مەزنە، ئەم شۆڕشە تێکەڵکردنی ئەلزاسی بە فەرەنسا خوازو ئەلزاسی‌یەکانی بە واتای تەواو کرد بەفەرەنسایی.

نەتەوە بەزبان دەست نیشان ناکرێت بەڵکو بەویست و ئارەزوو..... گوێ دانە ئارەزووی ئەلزاسی‌یەکان و جێبەجێکردنی خواستەکانیان لەم کۆڕەدا کارێکی دادپەروەرانەیە"...

لێرەدا بیرکردنەوە و خۆماندووکردنێکی ئەوتۆی ناوێت کە هەر کەسێك گورج بگاتە ئەو بڕوایەی کە ئەم بۆچوونە لەچاکترین حاڵدا هەڵوێستێکی تایبەتی‌یە، پەیوەندی بەحاڵەتێکی کاتی تایبەتی پابەند بەهەلومەرجێکی تایبەتی هەڵکەوتووەوەیە و بەس!. دەیان نموونەی جیاوازو دژ بەم هەڵوێستە لە سەرانسەری جیهاندا دێنە بەرچاو.

ڕاستی‌یەکەی پایە و بناخەی ڕەواو هەمیشەیی بەندە بەبوون و نەبوونی پێوەندی نەتەوایەتی پارچەیەك لەتەك بەشە گەورە سەرەکی‌یەکەی نەتەوەکەدا، وەناو بەناو بەهۆی هەلومەرجی تایبەتی و پەیدابوونی هەندێ ناکۆکی ئابوری یاخود بوونی هەندێ سەرکردە و دەسەڵاتداری دیکتاتۆرو زۆردارو خوێن ڕێژ بەسەر بەشە گەورەکەی نەتەوەوە، پاڵ بە بەشە بچوکەکانەوە بنێ بۆ ماوەیەکی کەم دوورە

پەرێز ڕابوەستن، هەرگیزاو هەرگیز تیۆرییەکی تایبەتی لە کۆڕی پەیدابوونی نەتەوەدا دروست ناکەن.

بەلاّم باسی دووەم کە بیروڕای خۆ لەمەترسی بێگانە پاراستن‌و بەگژ مەترسییەکانی دەرەوەدا چوون‌و یەکێتی ئاواتی نەتەوەیە، ئەمە لەلایەکەوە خۆی لەخۆیدا بەشێکە لە مێژو و گیانی ڕەوانی‌و ڕۆشنبیری ناوکۆیی نەتەوەیەك، هەروەکو کارێکی تایبەتی تەنیا سەر بە نەتەوەیەك نی‌یە، بەڵکو لەوانەیە دوو نەتەوە یاخود زیاتر، یان دوو دەوڵەت یاخود زیاتر بۆ خۆپاراستن لەم مەترسی‌یەو لە کۆڕی یەکێتی ئاوات‌و بەرژەوەندی ناوکۆیی لەم گۆڕەپانەدا یەك بگرن‌و چاکی تێکۆشانی ناوکۆیی لێ هەڵبکەن.

یەکێتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ئەوروپای دیموکرات واتا بەریتانیاو فەرەنساو هاوپەیمانەکانیان دژی ئەڵەمانیای نازی‌و ئیتاڵیای فاشی‌و یابانی ئیمپراتۆریی ئۆتۆکراتی نموونەی دیارو ئاشکرای ئەم باسەن.

کەچەند دەوڵەت‌و نەتەوەیەك دژی چەند دەوڵەت‌و نەتەوەیەکی تری دوژمنی خۆیان یەکیان گرت‌و بوو بەهۆی هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانیی دووەم.

هەروەها لەوانەیە چەند نەتەوەیەکی ژێر دەست-یش دژی نەتەوەیەکی دەسەلاّتداری زۆردار یەکبگرن‌و لەپێناوی ڕزگاری نەتەوایەتیدا چاکی خەباتی لێ هەڵبکەن.

وەکو نەتەوەکانی کوردو عەرەب‌و ئەرمەنی دژی تورکە عوسمانی‌یەکان لەکاتی کۆتایی هێنانی جەنگی جیهانی یەکەمدا. کەهەرسێ لا نەتەوەی جیاوازوخاوەنی مەرجی تایبەتی پێکەوەنانی نەتەوایەتی خۆیانن.

هەروەها وەکو ئەم باسە چەند نەتەوەو دەوڵەتێکی جیاواز ئەگرێتەوە، لەوانەیە یەك نەتەوەش بەتاقی تەنیا بگرێتەوە کە نموونەی لە جیهاندا ئێجگار زۆرە، وەکو هەڕەشەی شای ئێران و بە گشتی هەموو فەرمانڕەوایانی ئێران دژی کورد عەرەب.

هەروەها هەڕەشەی ناپلیۆن لە نەتەوەی ئنگلیزو ئەڵەمان و ئیتاڵیا.

ئەم هەڕەشەیە جیا بەجیا هەرسێ نەتەوەی خستە سەرباری دەست بە قەومییەت گرتن و خۆ کۆکردنەوەو ئامادەبوون دژی ئارەزووی داگیرکەرانەی فەرەنساییەکانی سەدەی هەژدەیەم و نۆزدەیەم.

## ژیانی ئابووری

جگــه لــه مارکســییەکان بەتایبــەتی ســتالین کــه بــەتێروپڕی لەســەر نەتــەوەو مەرجــەکانی پێکــەوەنانی نەتــەوەیان نووسیوە، جگــه لەوانــه زۆر کــەم پســپۆڕان و زانایانی ئەم باسە ئاماژەیان بۆ ژیانی ئابوری کردووە.

دیارە هۆی سەرەکی بایەخ پێدانی ژیانی ئابوری لە نیۆمارکسییەکاندا، بەوە لێك ئەدرێتەوە کە ماددەو ئابوری بە بەردی بناخەی هەموو شتێك ئەزانن، واتا ئەم دوو دیاردەیە ژێرخانی کۆمەڵگان و ئەوانی سەرخانی کۆمەڵگان، وەکو حکومەت و سیاسەت و هونەرو هەموو بابەتەکانی تری ژیان. یاخود ئەمانە سەرچاوەن و ئەوانی تر تەواوکەری بنچینە سەرچاوەییەکانن.

لای مارکسییەکان خەباتی چینایەتی رۆڵێکی گەورە لە خەباتی نەتەوایەتیدا ئەگێڕێت. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر زیرەکانە بەتایبەتی مارکس، لینین، ستالین، یەکەم و دووەمیان بە کردەوەو ستالین بە نووسین ئەم دوو خەباتەیان بەیەکەوە شەتەك داوە. خەباتی نەتەوە بەش خوراوە زۆر لێکراوەکان لە پێناوی مافی چارەنووس و دامەزراندنی قەوارەی نەتەوایەتی و دەسەڵاتی سەربەخۆ، واتا دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوایەتی یاخود هەر هیچ نەبێت پێکەوەنانی یەکێتی فیدراڵی لەنێو چەند نەتەوەیەکی بەئارەزوو پێکەوە ژیاودا، لەتەك خەباتی چینایەتی لە پێناوی لەناو بردنی چەوساننەوەی چینایەتیدا.

لەگەڵ ئەم ڕاستییەی سەرەوەش لە دەوروبەری کۆتایی شەستەکاندا لە لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانەی گەورە، دەربارەی بیرو باوەڕی ستالین بەرامبەر نەتەوە، بەتایبەتی لایەنە ئابورییەکەی، ئامادە بووە شارەزاو پسپۆڕەکانی ئەم کۆبوونەوەیە رەخنەیان لە زیادە ڕۆیی ستالین گرتبوو. دەربارەی ئەم لایەنە واتا بایەخدانی لە

پێویست پتر بەژیانی ئابوری لە کۆڕی پێکەوەنانی نەتەوەدا، وە دوابەدوای ئەم کۆبونەوەیە، گۆڤارە زانستیەکانی ئەوسای سۆڤیاتی زنجیرەیەك وتاری رەخنە ئامێزیان دەربارەی توندڕەوی ستالین لە کۆڕی مەرجی ئابوری لە پێکەوەنانی نەتەوەدا بڵاوکردەوە.

لەگەڵ ئەم بۆچوونەو سەرەڕای فەرامۆشکردنی لایەنی ئابوری لەنێو فرەی پسپۆرانی ئەم باسەدا بەڵام ژیانی ئابوری هەرپایەیەکی قایم و قوڵی لە پێکەوەنانی نەتەوەدا هەیە. وە هەر ئەم لایەنەیە بەشەکانی نەتەوەیەك گورجتر یەکئەخات، یاخود ئەبێتە کۆسپ و تەگەرەی جەرگبڕانە لەرێبازی یەکێتی نەتەوەیەکدا.

ئابوری توندو تۆڵ پەیوەندی بە هەندێ سەرەتای سەرەکییەوە هەیە کە لە لایەك خۆی ئەبێت بە بنچینەو لە لایەکیترەوە ئەبێت بە هۆی رەنگدانەوەی سیاسەتی جۆراوجۆری چەند بەشێکی نەتەوەیەك تەنانەت ئەگەر شانی ستراتیژی ئامانجەکانی ئەو نەتەوەیە راستەوخۆ نەگرێتەوە. بێگومان لە کۆڕی خەباتی رۆژانەو ساڵانەی بەرەو بەئامانج گەیشتندا توند شانی تاکتیکی رێڕەوی گەیشتن بە ئامانجی ئەو نەتەوەیە ئەگرێتەوە.

ژیانی ئابوری لەلایەکەوە پەیوەندییەکی توندی بەزەوی و جوگرافیاو ئابوریو کشتوکاڵ و کانزاو پیشەسازی و جیۆپۆلیتیکی هەر نەتەوەیەکەوە هەیە، کەئەم مەسەلە گرنگانە، ئەگەر یەکێتی پێکەوەنانی نەتەوەش دوا نەخەن، یاخود پێش نەخەن، ئەبن بەهۆی پەلەکردن یا کۆسپ خستنە رێگای دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوایەتییەوە، یاخود هیچ نەبێت پێکەوەنانی قەوارەیەکی نەتەوایەتی با لە شێوەو چوارچێوەی یەکێتی فیدراڵی_ش دا بێت.

بەگشتی باری ئابوری کە باری سیاسی رەنگدانەوەیەتی توندو تۆڵ بەستراوە، و بەهیچ شێوەیەك فەرامۆش ناکرێت، بە ناکۆکی و دوو بەرەکی (التنـاقض) نێوان بەشەکانی نەتەوە لەناو خۆیانداو نێوان بەشەکانی نەتەوە، جیاجیاو بەسەریەکەوە لەتەك ناحەزو دوژمنەکانیاندا. ئەوانەی دەستیان لە داگیرکردن و ژێردەستەکردنیانا هەیە.

نەتەوەی کوردو عەرەب و پۆڵەندی جاران نموونە و بەڵگەی هەرە گرنگ و بێگەردی ئەم باسەن.

ئەگەر گەلانی عەرەب بە نموونەی ئەم باسە بهێنینە کایەوە، راستی ئەم باسەمان لە هەموو نموونەیەکی تر باشتر دێتە پێشچاو، کە پارچە پارچە بوون و هەر پارچەیەکی بارێکی تایبەتی ژیانی ئابوری گرتۆتە خۆی و بووە بە کۆسپێکی گەورە لە نێوان ئارەزووی یەکێتی خوازی گەلانی عەرەب و جێبەجێبوونی ئەم ئامانجە گرنگەدا.

جیاوازی ژیانی ئابوری دەوڵەتە عەرەبی‌یەکان، جیاوازی سەرکردایەتی‌و جیاوازی بەرژەوەندی و دەستکەوت و جیاوازی پەیوەندی نێوان خۆیان و دەوڵەتانا، جیاوازی رژێمی سیاسی لە نێو ئەم دەوڵەتانەدا لێکەوتۆتەوە. نووسەرو پسپۆرو رابەرو شاعیرو ئەدیب و سیاسەتمەدارە نەتەوە پەروەرەکانی عەرەب هیچ نەبێت لە جەنگی جیهانی یەکەمەوە تا ئێستا هەموو رێگایەکی هەست بزوێن و دەروون جۆشدانیان هەریەکە بەپێی قوتابخانەی ئەدەبی‌و سیاسی خۆیان لە پێناوی هاندانی جەماوەری خەڵکی عەرەب بۆ بەدیهێنانی یەکێتی عەرەب بەکار هێناوە. ئەوە بوو بەهاتنی سەرەك جەمال عەبدولناسر ئەم هەوڵ و تەقەللایە گەیشتە لوتکەی بەرزترین کێوی ئاوات و بەیەکێتی هەرێمی سوریاو هەرێمی میسر لە ساڵی ١٩٥٨ دا بەئەنجام گەیشت، کەچی ئەوەندەی پێنەچوو لەلایەن هەرێمی سوریاوە هەڵوەشایەوە و نائومێدییەکی تازەی خستە دڵ و دەروونی کۆمەڵانی نەتەوە پەروەری عەرەبەوە.

زۆر هەن ئەم دیاردەیە ئەبەستن بە پیلانی ئیمپریالیزم و دەوڵەتانی دراوسێی ناحەزی عەرەب،وەکو ئەمەریکاو ئیسرائیل و دەسەڵاتدارانی دەوڵەتە پارێز خوازو کۆنەپەرست و شاو میرە عەرەبەکانەوە، بەڵام راستی‌یەکەی ژیانی ئابوری لە یەکتری جیاوازوبەستراو بەقازانج و دەستکەوتی تایبەتی کۆمەڵانی ناو سنورە جیاوازەکانی عەرەبەوە، هۆی سەرەکی و بنچینەیی ئەم دیاردەیەن، کە لە دڵ و دەروونی گەلانی عەرەبی ئەم وڵاتە عەرەبییانەدا رەنگی داوەتەوە.

لەمە بەولاوە پیلانی پیلانگێرانی ئەمانەی سەرەوە تەنیا هەوێنی گەشەکردنی ئەم ژیانە ئابوری‌یە هەرێم خوازییەن.

دەنا ئەگەر وا نەبوایە وەکو خەڵکی ئەڵەمانیای رۆژهەلات رژێمەکەو دیوارەکەی نێوان خۆیان و ئەڵەمانیای رۆژئاوایان رووخان، بەو جۆرەش هێرشی کۆمەڵانی

گەلانی عەرەبی ناو ولاتە عەرەبییەکان پاچ و پێمەرەیان ئەخستە رژێمەکانیانەوە هەرەسیان پێ ئەهانین و ولاتێکی عەرەبی یەککگرتوویان دەمێك بوو دائەمەزران.

واتا هێشتا ئارەزووی یەکێتی خوازی گەلانی عەرەبی لە دەولەتێکی نەتەوەیی یەککگرتوودا نەبووە بە هێزێکی ماددی.

بۆ ئەوەی لە کلاورۆژنەیەکی روناك ترەوە لەم کێشەیە بکۆڵینەوە، پێویستە بزوتنەوەی یەکێتی نەتەوەو نەتەوەخوازی لە ئەورروپاو دوای ئەورروپا لە نێوعەرەب و کورد لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا بخەینە بەرباس و لێکۆڵینەوە، تاکو بزانین بە چ شێوەو رەوتێك ئەم بزوتنەوانە هاتونەتە کایەوەو بەچیو لەکوێ بلێسەیان هەلساوە.

پێش هەموویان ئیتالیا بە نموونە بهێنینەوە پتر کێشەی رۆلی ئابوری لەکۆری پەیدا بوونی یەکێتی نەتەوایەتیدا ئەخاتە روو.

هەر مێژوونوس و پسپۆرێك باسی مەسەلەی قەومی و نەتەوایەتی کردبێ، چ دەستە راست یان دەستە چەپ یا ئەوانەی هەر خۆیان بە زبان ومێژو و رۆشنبیرییەوە خەریك کردووە یا ئەوانەی وەکو ستالین ژیانی ئابوریان بە ستونێکی گرنگی پەیدابوونی نەتەوە زانیوە، کەسیان خۆیان لەو راستییە لانەداوە کە لە رژێمی دەرەبەگی لە نێو هەموو قەومێکی جیهاندا دیواری پۆلایین و خەندەقی پان و قولی نێوان یەکێتی و دامەزراندنی نەتەوە بووە.

لاواز بوون و لە ئەنجامدا روخاندنی ئەم رژێمە بزوتنەوەی نەتەوە خوازی بە ئەنجام گەیاندووە.

نەتەوە بە یەککگرتنەوەی میرنشینەکان یەکیگرتۆتەوەو لە ئەنجامدا دەولەتی سەربەخۆشی بۆ دامەزراوە. سا ئەم میرنشینانە هەموو سەربەخۆ بووبن یاخود ژێر دەستە یا هەندێکیان سەربەخۆ و هەندێکیان ژێر دەستە.

ئەگەر مێژو و زبان و رۆشنبیری ناوکۆیی وە ئاوات و ئارەزووی دەروونی قەومێك نەتەوەی یەککگرتووی پێ پێك بهاتبایە، چۆن دەرەبەگایەتی ئەبوو بە دوژمنی سەرسەختی پێکەوەنانی نەتەوە.

لە قۆناغی بەندەگی و دەرەبەگایەتیدا، قەوم بە واتای رەگەز و زبان و مێژوو دیارو ئاشکرا هەبوون، بەلام پێزی نەتەوایەتی و بزوتنەوەی نەتەوایەتی ئەگەر هەشبووبێت لە لاوازترین شێوەو قەوارەدا خۆی نواندووەو دەسەلاتی شاکان و

ئیمپراتۆر و سوڵتان و ئاین، ئاین ـ یش بەو شێوەی لە چاخەکانی کۆیلەیی و دەرەبەگایەتیدا لێك دراوەتەوە، ئامرازی سەرەکی و راستەقینەی فەرمانڕەوایی و دەسەلأت و ڕەوتی بەڕێوەبردنی ولأتان بووە، هەروەکو پێوەندییەکانی نێو دەوڵەتانی ئەو کاتە لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی و بیروڕای ئەوانە ڕۆیشتووە بەڕێوە.

بەلأم لە پەیدابوونی بزوتنەوەی بیروڕای پیتی بۆرژواو بۆرژوازی بازرگان کاری و دوای ئەو بۆرژوازی پیشەسازکار، کە بنچینەو بناخەکانیان وردە وردە هەڵتەکاندنی پێوەندییە بەرهەم هێنانە دەرەبەگایەتییە کۆنەکان و هاتنە شوێنی پەیوەندی بەرهەمهێنانی نوێی پیشەسازی بوو. ئەم بزووتنەوەیە پێوەندییە دەرەبەگایەتییەکانی هەڵتەکاندو پێوەندییەکی نوێی خستەکایەوە، کە ئەبوو بازارێکی یەکگرتوو، وە شێوەیەکی نوێی دابەشکردنی کارو چینێکی نوێی شۆڕشگێڕی هۆشیار، کە چینی تازە کورەی کرێکاران بوو، پەیدا بکات و دابمەزرێنێت.

ئەو ئارەزووە دەرەبەگایەتییە، بەپێی خواستی ئابووری ئەم قۆناخە، ولأتی قەومێکی کردبوو بە چەند میرنشین و ولایەتێکەوەو سنورێکی لە نێو جەماوەری خەڵکی قەومێکدا پەیدا کردبوو، کۆسپی هەرە سەخت و گەورەی ڕێبازی یەکگرتنی ئەو قەومانە بوو لە بۆتەی نەتەوەیەکی یەکگرتووی یەك زیانی یەك ئارەزووی نەتەوایەتی یەك ژیانی ئابووریدا.

بۆیە بە ئەندازەی لاوازبوونی شیرازەکانی قۆناخی دەرەبەگایەتی و هاتنە کایەی شیرازەکانی قۆناخی بۆرژوازی، بزوتنەوەی سیاسی نەتەوایەتی ئەهاتە کایەوەو بەهێز ئەبوو، کە لە بزوتنەوەی زمانێکی یەکگرتوو خواست و ئارەزوویەکی نەتەوایەتی یەکگرتوو ژیانێکی رۆشنبیری یەکگرتوو کە لە ئەدەب و شیعر و هونەر و مۆسیقا و گۆرانی و بەشە دەروونییەکانی تردا خۆی ئەنوان و ئەهاتنەکایەوە.

بۆ ڕوونکردنەوەیەکی پتری ئەم لایەنە وەکو وتمان بزوتنەوەی یەکێتی خوازی میرنشینەکانی ئیتاڵیا بە نموونە ئەهێنینەوە.

دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەڵێت[٦٠] "کۆمەڵە هۆیەکی دیاریکراوی لە بۆتەیەکدا کار لە یەکتری کردوو بوون بەهۆی ئەوەی ڕاپەڕینی ئیتاڵیا پێش ئەوانی تر بکەوێت.

ئەم وڵاتە لە کۆتایی چاخەکانی ناوەڕاستدا بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر گەشەی کرد. هەر لە سەدەی پانزەیەمینەوە بە گورجی پشتی بە بازرگانەکانی دەرەوە ئەبەست و وزەی پاپۆڕەکانی لە دەریای سپی ناوەڕاستدا بەپەلە زیادی ئەکرد. چونکە دەستی بەسەر هەموو بازرگانەکانی ئەوروپا لەتەك ڕۆژهەڵاتدا گرت...

ئیتاڵیاییەکان بەمە زۆر دەوڵەمەند بوون، هێشتا سەدەی سیازدەیەمین تەواو نەبووبوو کە ئیتاڵیا لە کۆڕپەی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا پێش ئەوانیتر کەوت. جگە لەمەش شارەکانی ئیتاڵیا پێش ئەوانیتر کەوتن، هەر لە شاری (بندقیة)دا (١٦) هەزار کرێکار لە مەیدانی پیشەسازی چنین و (٦) هەزار لە پاپۆڕ دروست کردندا کاریان ئەکرد...

هەروەها (جنوا) و (فلۆرەنسا) و شارە ئیتاڵیاییەکانی دی گەشانەوە و بەڵکو (فلۆرەنسا) لەلایەنە ئابورییە جۆراو جۆرەکاندا پێش بندقیەش کەوت.

چالاکی فراوانی ئابوری لە کۆڕی پیشەسازی وسەڕافیدا (فلۆرەنسا)ی گەیانە پایەیەك کە کار لە ئابووری ئەوروپا بکات، وە وای لێهات دامەزراوانی شێوە سەرمایەداری لە نێو هەموو جیهاندا لەوێ بن بەرووداوێکی ئاسایی.

لە (فلۆرەنسا) سەرەتای پێوەندییە سەرمایەدارییەکان هاتنە کایەوە، مانیفاکتۆرەو یەکێتی داراییەکان، کە پیشەسازو بازرگانان سەرپەرشتی بەرهەم و بەدەرەوە فرۆشتنیان ئەکرد هاتنە کایەوە. لەسەدەی چواردەیەمیندا شوێنە پیشەسازییە گەورەکانی (فلۆرەنسا) کە قوماشیان بە مانیفاکتۆرە بەرهەم ئەهانی لە (٢٠٠) شوێن تێپەڕین.

ئەم پێشکەوتنە پیشەسازییە خێرایە، کرێکارانی گەیانە لە ٨٠٪ی دانیشتووە بەکارەوە خەریك بووەکانی شارەکە.

ئەم ژمارەیە نەك لە ئیتاڵیا بەتەنیا بەڵکو لە هەموو ئەوروپادا هاوتای نەبوو.

هەر لەم قۆناخە مێژووییەدا گەورەترین دامەزراوی سەڕافی نوێ لە (فلۆرەنسا) دامەزرا کە مامەڵەی بە بەهێزترین پارەی ئاڵتونی لە سەرانسەری ئەوروپادا ئەکرد.

نەك هەر دەرگای بۆ بازرگانەکان خستە سەر پشت، بەڵکو دەستی دەوڵەتە ئەوروپاییەکان-یشی ئەگرت، وەکو لەتەك ئنگلتەرەدا چەند جارێك ئەیکرد... بۆیە لە ماوەی سەدەو نیوێکدا ژمارەی دانیشتوانی (فلۆرەنسا) بوو بە دوو هەندەی خۆی، کە

له کۆتایی سەدەی سیانزەیەمیندا، ژمارەی ئەم شارە نزیکەی ٧٠ هەزار کەس بوو، لەناوەڕاستی سەدەی پانزەیەمیندا بوو بە (١٥٠) هەزار کەس...

دوکتۆر کەمال مەزهەر لەسەر باسەکەی ئەڕوات و ئەڵێت: "ئەم حاڵە نوێیە بوو بەهۆی ئەوەی سیستەمی هەر شارێکی ئیتاڵیایی لە هەموو حاڵێکدا پشت بە ساماندارەکان ببەستن، پاش ئەوەی هەندێجار دامەزراوەکانیان وەکو دەوڵەت لە نێو دەوڵەتیان لێهات.

لەمانەی پێشەوە بۆمان دەرئەکەوێت کە شیرازەی پێوەندییە دەرەبەگایەتییەکان پێش جێگاکانی تر تێکچوو، وە بەم پێیە پێویستییەکانی کۆمەڵگای نوێ-ش لەم وڵاتەدا پێش جێگاکانیتر هاتنە کایەوە".

لەم باسەی دوکتۆر کەمال مەزهەردا زۆر بە ڕوونی بۆمان دەرئەکەوێت کە پەیدابوون و نەشونمای بۆرژوازی و سەرمایەدارێتی و هەڵتەکاندنی دەرەبەگایەتی بوون بەهۆی پەیدابوونی ڕاپەڕاندن، واتا ڕێنیسانس لە ئیتاڵیادا. هەر ئەم دەست پێشکەرییەی ئەم وڵاتەش لە چاو وڵاتەکانی تری ئەورووپادا وەکو فەرەنسا و ئینگلتەرەو ئەڵەمانیاو ئیسپانیا مایەی دەست پێشکەری هۆشیاری نەتەوایەتی ئیتاڵیایی و بەهێزبوونی گیانی تەقەللادان بوو لە پێناوی یەکێتی میرنشین و دەوڵەتە بچوکەکانی ئیتاڵیادا. بۆیە سەیرنییە کە لەپێش هەموو ئەورووپا نیکۆلا ماکی ڤیللی لە (١٤٦٩-١٥٢٧)دا لە ئیتاڵیا بەبیرو باوەڕێکی نەتەوە پەروەرییەوە دێتە کایەوەو شاکتێبە بەناوبانگەکەی (میر) بڵاو ئەکاتەوە، کە بریتییە لە نەخشەی یەکگرتنی دەوڵەتۆکەو میرنشینەکانی ئیتاڵیا، وە پێکهێنانی دەوڵەتێکی یەکگرتووی ئیتاڵیایی کە لە دوای هەرەسهێنانی ئامانجەکانی کۆنگرەی (ڤێنا)ی ساڵی ١٨١٥ ئەم بزوتنەوە نەتەوایەتی‌یە لە ئیتاڵیا و وڵاتەکانی تری ئەورووپادا بەسەرکەوتن بە ئەنجام گەیشت.

ئەوەتا دیسانەوە پرۆفیسۆر توینبی باسی هێز و نەشونمای بزوتنەوەی قەومی لەسەدەی نۆزدەیەمیندا بەم جۆرە ئەکات[٦١]"پێش ئەم سەدەیە چەند خێزانە شایەك وەکو خێزانی (هابسبرگ) لە ئەڵەمانیا دەسەڵاتداری چەند دەوڵەتێك بوون، هەر سەدەی نۆزدەیەمین هاتە پێشەوە، دوو هێز خۆیان کرد بەم دەوڵەتانەدا، یەکێکیان دیموکراتییەت، واتا هەوڵدانێکی توند لە پێناوی ئەوەی هەموو کەسێك لە کۆمەڵگادا ڕۆڵێك بگێڕێت و ئەبێ کۆمەڵگا ئاوێنەی قازانجی هاونیشتمانان بێ. بەڵام هێزەکەی

تر ئابوری نیشتمانی بوو کە خەڵکی خستە سەر ئەو بڕوایەی لایان وا بێ شۆڕشی پیشەسازی کە هەموو لایەنێکی ئەورووپای گرتۆتەوە، ژیانی هەموو کەسێکی خستۆتە مەترسییەوە کە هەموو دەوڵەتێك ناچار ئەکات بێ وچان هەوڵ بدات ئابوری قەومی خۆی بپارێزێت".

تەماشایەکی سەرپێیی ئەم دوو خاڵەی هەردووکیان ژێرخان و سەرخانی یەك دیاردەن ئەویش جێگیر بوونی ژیانی پیشەسازی لە شوێنی ژیانی ئابوری دەرەبەگایەتی، کە بێگومان ئەبێ سەرخانەکەی دیموکراتییەت بێ، وە ئەم دووانە مایەی یەکێتی نەتەوە جۆراوجۆرەکانی ئەورووپا و دامەزراندنی دەوڵەتی قەومی بوون. هەروەها لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمیندا، مانتشینی ئیتاڵیایی *maneini* مامۆستا زانکۆی تورینۆی پایتەختی سادینیا لە وتەیەکی لە ٢٢ کانونی دووەمی ساڵی ١٨٥١ دا بەم جۆرەی خوارەوە باسی نەتەوە ئەکات [٦٢]"نەتەوە کۆمەڵگایەکی ئاسایی ئادەم زادە، یەکێتی خاك و رەگەزو داب و نەریت و زوبان بەیەکیانەوە ئەبەستێت. چونکە لەژیان و هەستی کۆمەڵایەتیدا هاوبەشن".

لێرەدا هاوبەشی ژیان لەواتای ژیانی ئابوری بەو لاوە کە هەستی کۆمەڵایەتی_شی لێئەکەوێتەوە هیچ واتایەکی تر نادات، ئەمە جگە لەوەی کە هەرکاتێ رێککەوتنەکەی ساڵی ١٨٥١ کاتی پێشکەوتنی پیشەسازیو تێکچوونی شێرازەی دەرەبەگایەتی و پەیدا بوونی بزوتنەوەیەکی نوێی نەتەوایەتی دەوروبەری پەیدابوونی بناخە سەرەکیەکانی رژێمی بۆرژوازی و دوای ئەو سەرمایەداری ئیتاڵیایە.

ئەگەر لە باسی بزوتنەوەی نەتەوایەتی لە سەرانسەری ئەورووپادا بکۆڵینەوە، وەکو دوکتۆر جۆرج حننا ئەڵێت[٦٣] " بیروڕای قەومایەتی لەسەدەی نۆزدەیەمیندا ئەبێ بە پاڵاوتەیی نەکەوتە ناوناوانەوە، کەبوونی مرۆڤایەتی لە بوونی دەرەبەگایەتیو قەبیلەییو ئایینییەوە بوو بە بوونی قەومایەتی".

ئەگەر بەراوردێکی نەخشەی ئەورووپای پاش کۆنگرەی (ڤیەنا)ودوای تەواو بوونی جەنگی یەکەمی جیهانی بکەین ،دوو نەخشەی زۆر جیاوازو سەرسوڕهێنەرمان دێتە بەرچاو کە بەرهەمی تێکچوونی شێرازەی دەرەبەگایەتیو دەسەلاتی ئاینی کەنیسەی کاثولیکی و دامەزراندنی ژیانێکی ئابوری نوێ کە

ستونەکانی شیرازەیەکی بۆرژوازی یانەی کۆڕەکانی پیشەسازیو کشتوکاڵیو بازرگانی و سیستەمی سەراپای رووڵە سەرمایەدارییە.هەروەکو سەرخانەکەشی تێکدانی بنەڕەتی سەرخانی سیاسیو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیری و هونەری رژێمە دەرەبەگایەتییە کۆنەکەو جێگیربوونی سەرخانێکی هۆشیارانەی سیاسیو رۆشنبیریوهونەری وپێویستییەکانێتی لەسەرانسەری ئەوروپادا، هەر وڵاتە بەپێی رەوتی پێشکەوتنی خۆی لەم کۆڕەدا.[٦٤] "پاش کۆنگرەی (ڤێنا)ی ساڵی١٨١٥ کە مەسەلە قەومییەکان بەهیچ پێودانگێك نەپێوراون، ئەڵەمانەکان لەدەیان میرنشینی سەربەخۆدا بڵاوبوو بوونەوە، ئیتاڵیایەکان یەکێتییەکی سیاسی کۆی نەکردبوونەوەو پۆڵەندییەکان لەنێو سێ دەوڵەتی بەهێزدا روسیای قەیسەرییو ئیمپراتۆرییەتی نەمساویو پروسیای ئەڵەمانیدا دابەش کرابوون و یوغۆسلافییەکان ژێر دەستەی دوو دەوڵەتی گەورە، دەوڵەتی عوسمانیو ئیمپراتۆرییەتی نەمساوی بوون وە ئەم ئیمپراتۆرییەتە دەسەڵاتی بەسەرقەومەکانی ئەڵەمانیو ئیتاڵیاییو مەجەرییو رۆمانیو چیکیو پۆڵەندییو یوغۆسلافیدا گرتبو، هەر وەکو سەڵتەنەتی عوسمانی لە بەشی ئەوروپاییدا، یۆنانیو بولغارییو ئەلبانیو یوغۆسلافی لەژێر دەستا بوو.

ئەگەر ئەم نەخشەیەی ئەورووپای پاش کۆنگرەی (ڤێنا) بەهی پاش جەنگی یەکەمی جیهانی بەراورد بکەین، چەند قەومێکی ئەورووپایی _ مان دێتە بەرچاو، ئەڵەمانەکان وئیتاڵیایەکان هەریەکە بۆ خۆیان یەکیانگرت و پۆڵەندە سەر بەخۆیی خۆی بە دەستهانی و یوغۆسلاڤیا پێکهات و فینلەندە لە روسیا جیابووەوەو نەرویج لە سویدو بەلجیکا لە هۆڵەندە. شان بەشانی ئەمانە چەند دەوڵەتێکی نوێ پێك هاتن کە گرنگەکانیان یۆنان وبولغاریاو ئەلبانیاو چیکۆسلۆفاکیا بوون".

ئەگەر لە ئەورووپاوە بگوێزینەوە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، چوار نموونەی تری بزوتنەوەی نەتەوایەتی کاکڵەمان دێتە بەرچاو، فارس و تورك و عەرەب و کورد، عەرەب لەنێو ئەمانەدا بەنیوە مافی نەتەوایەتی گەیشت،بەڵام مافی کورد لەژێرپێ وبەرژەوەندی تایبەتی دەوڵەتە ئیستعمارییە گەورە هاوپەیمانەکاندا بەهاوکاری لەتەك حوکمەتی کەمالی فاشستی تورك و کۆنەپەرستی عەرەبدا پلیشێنرایەوە.

لە دوای ئەم جەنگە لە ئێران، رەزاخان کە بە رەزا شای گەورە لە ئێران دا ناوی دەرکردبوو، رژێمی فەرمانڕەوای دەرەبەگایەتی رزیوی کۆنی لە رەگ و ریشە

هەڵتەکان و،چاو کردوو لە مستەفا کەماڵی تورك پەرستی بەرچاو تەسکی شۆفێنی، ڕێگای ڕژێمێکی نەتەوایەتی بۆرژوازی توندڕەوی گرتە بەر کە هەر نەتەوەی فارس تێیدا فەرمانڕەوا بێ. بەسەرکەوتنی ڕەزا شا مافە نەتەوایەتییەکانی کوردو ئازربایجان و تورکمان وعەرەب بەچەکمەی دیکتاتۆرییانە پێشێل کران.

هەروەها مستەفا کەمال ئەتاتورك کە بوو بوو بەرابەری بزوتنەوەی نەتەوایەتی توندڕەو، نەك هەر لە تورکیای نوێ بەڵکو لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پاچ وپێمەرەی خستە ژێرخانی ڕزیوی هەرەسهێناوی سەڵتەنەتی عوسمانییەوەو سەرخانێکی بۆرژوازییانەی قەومی توندڕەوی بڕوا نەکردوو بەمافی نەتەوەکانی ناو ئەم سنورە نوێیە، وەکو کوردوئەرمەنی ویۆنانی وعەرەب، لە شوێن ئەو دامەزران. بۆ نەتەوەی تورك و بوژاندنەوەی گیانی نەتەوایەتی کەوتە هەوڵ وچالاکی و کارکردنێکی شەوورۆژیو بەگەڕ خستنی هەموو هێزو توانایەك. تاکو دەوڵەتێکی تورکی نوێی خاوەن دەسگایەکی پێشکەوتوانەی کشتوکاڵ وپیشەسازی و هۆیەکانی زانست و تەکنۆلۆجیای نوێ دابمەزرێنێت. بەپێچەوانەی ئەمەوە زۆر درندانە کەوتە گیانی کورد و ئەرمەنی و کەمایەتییە قەومییەکانەوە.

بەڵام ئەگەر ئەم بزوتنەوەیەی مستەفا کەمال ڕووت و قوت هەر لە کڵاو ڕۆژنەی بەرژەوەندی ئەوسای تورکەوە لێك بدرێتەوە، بە بەلاوە خستنی لایەنە تاوانبارییەکەی دژی نەتەوەکانی تر، ئەو ڕاستییەمان دێتە پێشچاو کە بەلای تورکەکانەوە بزوتنەوەیەکی نەتەوایەتی ڕزگاری هێنەر بووە لە دەسەڵاتی بیانی و لە پێناوی دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوایەتی تورك، کە پایەو بناخەی بزوتنەوەی چالاکی ئابووری بۆرژوازی ناو تورکیا بوو. دەنا هەروەکو جاران حکومەتێکی سەڵتەنەتی ئاینی بچوکتر لە تورکیا دوای شکستی سەڵتەنەتی عوسمانی لە جەنگی یەکەمی جیهانیداو سەرکەوتنی دەوڵەتە هاوپەیمانە ئەوروپاییەکان دائەمەزرایەوە.

هەروەها دەربارەی بزوتنەوەی نەتەوایەتی عەرەب و کورد و ئەرمەنی هیچ ڕێکەوت نییە کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا و لە پاش ترازاندنی هۆکانی بەیەکەوە لکاندنی ئەم سێ نەتەوەیە، سێ بزوتنەوەی نەتەوایەتی گەلاڵە بوو دوای تەواو بوونی جەنگی یەکەمی جیهانی، بزوتنەوەی کوردو عەرەب و ئەرمەنی دێنە

کـۆڕی سیاســەتی دەوڵەتییــەوە. وە بــە ڕەنــگ و ڕوویــەکی نوێــوە داوای مــافی چـارەنووس و دامـەزراندنی دەوڵـەتی نەتەوایـەتی خۆیـان لـە کۆنگـرەی (صلـح) لــە فەڕەنسا ئەکەن.

پێش ئەمە واتا لە پێش جەنگی یەکەمی جیهانی و لـە سەرەتاشیدا عەرەبەکان لەتەك پێشکەوتنخوازەکانی ئەوسای تورکدا وتووێژیان ئەکرد کە لە دوای لەناوبردنی سـەڵتەنەتی عوسمانی ئۆتۆنۆمــی بـۆ گـەلانی عـەرەب بسـەلمێنن. چونکـە ئـەو کاتـە هێشتا بزوتنەوەی نەتەوایـەتی عـەرەبی بە تـەواوی لەسـەر پێـی خـۆی ڕانەوەستابوو. بۆیە هەر لەو بڕوایەدا بوون کە ئەبێ بەم بەشە مافە قایل بن و بەس!!.

بــەڵام دوای پەرەســەندنی بزوتنــەوەی نەتەوایــەتی عــەرەب وردە گەڵاڵـە بوونی و لەلایەکی تریشەوە سەرسەختی تورکەکانی پارتی (اتحاد و ترقی) عـەرەبیان گەیانە ئەو ئاست و ئەندازەیەی کە سەرکردە گەورەکانی ئەو کاتەیان بە تایبەتی شا (حسـین) شـەریفی مەککـە لەتـەك ئنگلـیزدا ڕێکبکـەوێت و شۆڕشــی دژی دەوڵــەتی عوسمانی بەرپا بکات. بەتەمای ئەوەی دوای تەواو بوونی جەنگی نێوان عوسمانی و ئەڵــەمانیا لــە لایــەك و ئنگلــیز و هاوپــەیمانانی لەلایــەکی تــرەوەو شکســتی عوسمانییەکان، دەوڵەتێکی عەرەبی گەورەی سەربەخۆ دابمەزرێت.

چالاکی لۆرەنسی ئنگلیزی کە بە لۆرەنسی عەرەب بە ناوبانگە لەم گۆڕەپانەدا لە لاپەڕەکانی مێژووی جەنگی یەکەمی جیهانیدا زۆر بە ناوبانگ و سەرنج ڕاکێشە.

لینین لـە ڕاپـەڕینی ئاسـیادا ئـەڵێت [٦٥]: ئـەنجامی بزوتنـەوەی سـاڵی ١٩٠٥ لـە ڕوسیا (نیازی شۆڕشی بۆرژوازی یەکەمی ساڵی ١٩٠٥-١٩٠٧، شۆڕشی دیموکراتی، ئەم پەڕو ئەوپەڕی ئاسیا، تورکیا، ئێران، چین-ی گرتـەوەو هندستانی ئنگلیزیش بە تونـدی ئــەکوڵێت. دوای ئــەوە ئــەڵێت -ســەرمایەدارێتی جیــهانی و بزوتنــەوەی ساڵی ١٩٠٥ی ڕوسیا ئاسیای بە تەواوەتی بەخەبەر هێنا، سەدان ملیۆن خەڵکی بێ حورمەتانە مامەڵە لەتەکدا کراو، نقوم بووی سەدەکانی ناوەڕاست، بۆ ژیانێکی نوێ ڕاپـەڕین، خــەبات کــردن لــە پێنــاوی ئــەلف و بێــی مـافی ئـادەم زاد، لــە پێنــاوی دیموکراتییـەتدا- ئینجـا ئـەڵێت -بەخەبـەر هـاتنی ئاسـیاو دەسـت پێکردنـی بەشــە پێشکەوتووەکانی پرۆلیتاریا لە ئەوروپا لە پێناوی دەسەڵاتدا هێمای قۆناخێکی نوێ لەسەرەتای سەدەی بیستەم، لە مێژووی جیهاندا بوو).

# بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردو ژیانی ئابوری

شان بە شانی بزوتنەوەی عەرەب و تورك و فارس بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردیش، هەرچەند ئاست و رەوتی ژیانی ئابوری کورد لە ئاستی ئەوانا نەبوو، هاتە کایەوە.

ئەوی ڕاست بێ جگە لەوەی لە کوردستانا شێوەی بازرگانی و ڕەوتی بۆرژوازی بچوك و مام ناوەندی کەوتبوە ژیانی کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە و پیشەسازی بچوك-یش کەوتبوە ناو شارەکانەوە و بازرگانێتی_یش دەمێك بوو رووی کرد بووە ناو شارەکان لە لایەك و لەتەك دێهاتەکان و ناوچە کشتوکاڵییەکانی کوردستان_یش لە لایەکی ترەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا سی هۆی تر هەبوون کە هانی ئەم لایەنە نوێیە رووناکەیان لە کوردستاندا ئەداو ئەبوونە هۆی بڵاو بوونەوەی هۆشیاری ژیانی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری لە کوردستانا لە لایەك و هاندەری بزوتنەوەیەکی نەتەوایەتی کوردی نوێخواز لە لایەکی ترەوە.

یەکەم: بڵاوبوونەوەی ڕژێمی سەرمایەداری تاڕادەیەك پایە بەرز لە سەرانسەری ئەورووپادا و پێوەندی توندی دەوڵەتە ئەورووپاییەکان بەتایبەتی ئنگلیز و فەرەنسا و ئەڵەمان و روسیا بەناوچەی ڕۆژهەڵات و وڵاتی کوردستانەوە، و ئەو ئایدیۆلۆژییەتی دیموکراتیخوازو ئازادی و مافی چارەی خۆنووسینەی کەوتبووە ریزی گەلانی ئەو وڵاتە سەرمایەدارانەوە، هیچ چەپەرێك لە کایەدا نەبوو ڕێگا لەم ئایدیۆلۆژییەتە بگرێت لەناو کوردستان_یشدا بڵاوببێتەوە.

دووەم: شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧ی روسیا بەسەرۆکایەتی لینین کە مافی چارەی خۆنووسین_ی گەلانی ئاسیا و پشتیوانی بزوتنەوەی بێ هەل و مەرجی نەتەوە ژێردەستەکانی لە پێناوی رزگاری و دەستخستنی دەسەڵاتی نەتەوایەتی

بەرزکردەوە، ئەم شۆڕشە وەکو نەتەوەکانی تری ئاسیا نەتەوەی کوردیشی هۆشیار کردەوەو ڕاپەڕان. پەیوەندی سیاسی و هەوڵی هاوکاری شێخ مەحمودی نەمر لەتەك ئەم شۆڕشە و سەرکردەکانی نموونەی گومان لێنەکراوی کاری بەرزی ئەم شۆڕشەیە.

سێیەم: لەکوردستانا هەندێ پرۆژەی پیشەسازی لەلایەن دەوڵەتە سەرمایەدارەکانی ئەوروپاوە دامەزران وەکو پرۆژەی دەرهێنانی نەوت لە کەرکوك و کرماشان و جێگایانی ترو، پرۆژەی ڕێگاوبان راکێشان و بیناکردن... هتد.

ئەمانە بوون بەهۆی ئەوەی چینێکی تازەی کرێکارانی نوێ لە کوردستانا بێتە کایەوە. ئەم چینە هۆشیارە کۆمەڵ بووە، بزوتنەوەی نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی بەقەدەر حاڵی خۆی لە کوردستانا بەرەو پێشەوە برد.

هەر لەم ساڵانەداو واتا لە سەدەکانی نۆزدەو بیستدا وەکو ئەوروپا و ئاسیا با لەو ئاست و ئەندازەیەشدا کاکڵە و پاڵاوتە نەبووبێت، بزوتنەوەیەکی نەتەوایەتی دیارو ئاشکرا، ئاوات و ئامانج پوخت و بێگەرد لە سێ بەشی کوردستانا، واتا لە کوردستانی ئێران و تورکیا و عێراق دا هاتەکایەوەو دوو شێوە خەباتی گرتەبەر، خەباتی شۆڕشگێڕانەو خەباتی سیاسییانە. وە لە هەرسێ بەشەکەشدا نموونەی هەڵگیرساوو ڕێکوپێکی هەیە.

هەر بۆ نموونە[٦٦] "شۆڕشی سمایل خانی سمکۆ لە نێوان ساڵانی ١٩٢٠-١٩٢٥ دا ئەهێنینەوە کە حکومەتی ئێرانی بەچۆکا هانی و بەشێکی گەورەی ناوچەی ورمێ و جێگایانی تری کوردستانی رزگارکرد، تا بە فرِوفێڵ بە ناوی گفتوگۆ کردنەوە حکومەتی ڕەزا شا لە شاری شنۆ لە ٢١ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٠دا بە نامەردانە کوشتی."

هەروەها پاش تەواو بوونی جەنگی یەکەمی جیهانی شێخ مەحمودی گەورە، حکومەتێکی کوردی سەربەخۆی لە کوردستانی عێراقدا دامەزران کە پایتەختەکەی شاری سلەیمانی بوو، وە ئەم حکومەتە، بەریتانیاو حکومەتی عێراق بە بەیاننامەیەکی ڕەسمی بە ئیمزای هەردوو حکومەتەکەوە لە ٢٢ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢دا بەم شێوەیەی خوارەوە بڕوایان پێکرد[٦٧]"حکومەتی خاوەن شکۆو حکومەتی عێراق دان بەوەدا ئەنێن کە ئەو کوردانەی لە سنوری عێراق دائەنیشن،

حکومەتێکی کوردی لە نێو ئەم سنورەدا بۆ خۆیان دابمەزرێنن وە ئومێدیان وایە، کە کەسانی کوردی هەمە جۆرە لە نێو خۆیانا دەربارەی شێوەی ئارەزوو لێکراوی ئەو حکومەتە و سنورەکانی رێك بکەون، وە کوردەکان نوێنەری بەرپرسیاری خۆیان بۆ لێکۆڵینەوەی پێوەندییە ئابورییەکان لەتەك حکومەتی خاوەن شکۆو حکومەتی عێراقدا بنێرن". لە کوردستانی بەناوی تورکیاوە ناونراو، بزوتنەوەی کورد لە دوو بەشەکە ئێران و عێراق پێشکەوتووتر و لەئەوروپادا بە ناوبانگترو لە جیهاندا دەنگی زیاتر دابووەوە. ئەویش سەبارەت بەوەی ئەم بەشەی پاڵ تورك لە بەشەکانی لەتەك عەرەب و فارسدا، بزوتنەوەی نەتەوایەتی تێدا پێشکەوتووتر بوو.

هەروەکو ئەم بەشەی کوردستان و خاکی تورکیا بەسەریەکەوە بە ئەوروپاوە نووساوە، کە ئەم بۆ هەڵکەوتنە بۆیان بوو بە سەرچاوەیەك کە بە ئەرمەنی تورکیاشەوە پتر کەڵك لە سەرەتا سەرەکییەکانی بزوتنەوەی دیموکراتی و ئازادی تاکە کەس (الفردي) و مافی چارەی خۆنووسین ـ ی بڵاوبووەوەی ناو ئەوروپا، وە بەتایبەتی سەرەتاکانی شۆڕشی فەرەنسا، سەربەستی و دادپەروەری و یەکسانی، وەربگرن.

بزوتنەوەی رزگاریهێنەری کوردستانی تورکیا کەوتە ئەو ئاستەی ژەنەراڵ شەریف پاشا بە سەرۆکایەتی وەفدێکی کورد چوو بۆ پاریس تا کورد بتوانێت دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە کوردستانی باکوردا دابمەزرێنێت وە ئەم دەوڵەتە ببێت بە بنکە بۆ بەشەکانی تری کوردستان، بە تایبەتی بۆ کوردستانی خواروو کە بە کوردستانی عێراق بەناوبانگە.

لەم بارەیەوە دوکتۆر عبدالرحمن قاسملو ئەڵێت[٦٨] " لە ئابی ١٩٢٠ رێککەوتننامەی سیڤەر بەسەر تورکیادا سەپێنرا، کەبەشێکە لە پەیمانی ڤەرسای. هەر دوو لایەنی ئەم رێککەوتننامەیە، بەریتانیای گەورە و فەرەنسا و یۆنان و ئیتاڵیا و رۆمانیا و یۆغۆسلاڤیا و چیکۆسلۆڤاکیا و پۆڵەندەو بەلجیکاو ژاپۆن و حیجاز و ئەرمینیای تاشناق، لایەکی و تورکیا لایەکەی تری بوو. وەفدێکی کوردی شەریف پاشا سەرکردایەتی ئەکرد لەم کۆنگرەیەدا ئامادەبوو، رێککەوتننامەکە دەربارەی کوردستان ئەم بەندانەی تێدا بوو:

بەشی یەکەم، بەندی ٦٢: لیژنەیەك لە قوستەنتینییە، دائەنیشێت لە سێ ئەندام پێکدێت، حکومەتی بەریتانیاو فەرەنسا و ئیتاڵیا ئەیانپاڵێون، وە لە ماوەی شەش مانگی پاش ئیمزاکردنی ئەم ڕێککەوتننامەیە، ئەم لیژنەیە نەخشەی ئۆتۆنۆمییەکی ناوخۆیی بۆ ئەو ناوچانەی زۆربەی دانیشتوانی کوردن لە ڕۆژهەلاتی ڕووباری فورات و باشوری سنوری ئەرمەنییەکان پێشکەش ئەکات، کە لە دواییدا ئەتوانرێت سنور بکێشرێت لە باکوری سنور لە نێوان تورکیاوە سوریا و عێراق ، وەکو لە برگەی ٢٧-١١-٢-٣ دا نیشانەکراوە.

وە ئەگەر لیژنەکە دەربارەی هەرمەسەلەیەك بڕیارێکی بە کۆمەڵی بۆ نەدرا ئەوا هەر ئەندامێك لەم ئەندامانە مەسەلەکە ئەخاتە پێشچاوی حکومەتەکەی خۆی.

پڕۆژەکە پاراستنی ئاشوری و کلدانی و کەمایەتییە نەتەوایەتی و ڕەگەزییەکانی تر دەستەبەر ئەکات.

وە لە پێناوی ئەم مەبەستەدا لیژنەیەك کە نوێنەرایەتی بەریتانیاو فەرەنسا و ئیتاڵیا و ئێران و کورد ئەکات ئەم ناوچەیە ئەگەڕێت، تاکو ئەگەر شتێك هاتە پێشەوە لەسەر سنوری تورکیا بەپێی مەرجەکانی ڕێککەوتننامەی سنوری نێوان تورکیا بەپێی مەرجەکانی ڕێککەوتننامەی سنوری نێوان تورکیا و ئێران پێویستی بە پشکنین و بڕیاردان هەبوو جێبەجێی بکەن.

بەندی ٦٣ - حکومەتی تورکی ئەم بڕیارانەی لە لایەن دوو لیژنە ناوبراوەکەوە لە بەندی ٦٢ لە ماوەی سێ مانگ لە ئاگادارکردنی بڕیارەکانا بە حکومەتە ناوبراوەکان ئەسەلمێنێت و جێبەجێ ئەکات.

بەندی ٦٤ - ئەگەر لە ماوە ساڵێکی سەلماندنی ئەم ڕێککەوتننامەیەدا ئەو کوردانەی لە ناوچەی سنورکراوی بەندی ٦٢ی دراو بە (عصبة الامم) داوایەکیان پێشکەش کرد کە بڵێن ئارەزووی سەربەخۆیی لە تورکیا ئەکەن و لە حاڵێکدا (عصبة الامم) بڕوا بەوە بکات کە ئەم دانیشتوانە شایستەی ژیانێکی سەربەخۆن، ئەوا ئامۆژگاری بۆدانی ئەم سەربەخۆییە دەرئەکات. وە تورکیا پەیمان ئەدات کە ئەم ئامۆژگارییە بسەلمێنێت و دەست لە هەموو مافێك لەم ناوچەیەدا هەڵگرێت. وە دەستهەڵگرتنی تورکیا لەم مافانە ئەبێت بە بابەتی ڕێککەوتننامەیەك لە نێوان هاوپەیمانە گەورەکان و تورکیادا، کە بە دووروودرێژی ڕێگاو شوێنی بۆ دائەنێن. وە

که تورکیا دەستی لەم مافانە هەڵگرت ئیتر هاوپەیمانان دژی ئەوە نابن کوردەکانی ولایەتی موصڵ بە ئارەزووی خۆیان بچنە پاڵ ئەم دەوڵەتە کوردییە".

ئێمە لێرەدا نە باسی هەڵوێستی هاوپەیمانان و نە باسی رەوتی تایبەتی سەرکردەکانی بزوتنەوەی کوردەواری ئەوسای کوردستانی تورکیا و کوردستانی عێراق ئەکەین. بەڵکو تەنیا چاو بەوەدا ئەگێڕینەوە کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمیندا بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد لە لایەکەوە کاکڵە و پاڵاوتە تا ئەم ئاست و ئەندازەیە بوو، کە داوای مافە رەواکەی درای پێکەوەنانی نەتەوە بکات کە دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی نەتەوایەتییە.

لەلایەکی ترەوە گەیشتۆتە هیچ نەبێت ئاستی بزوتنەوەی گەلانی عەرەب و نەتەوەی ئەرمەنی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدار لە ماوەی سەدەیەك دا دەنگ و ڕەنگ و ئاوازی ئازادی و داد پەروەری و یەکسانی شۆڕشی فەرەنسایی و سەرجەم بزوتنەوەی نەتەوایەتی، نەتەوە پێگەیشتووەکانی ئەڵەمان و ئیتاڵیا و ئینگلیز و پۆڵەندەو یۆنان و ... ی پێگەیشتووە.

وەنەبێ ئەم پێگەیشتنەش هەر چاو لێکەری رووت بووبێت و بەس، بەڵکو لەتەك چاو لێکەری و کار تێکراویدا نەتەوەی کورد خۆشی بوو بە خاوەنی هیچ نەبێت پاڵاوتەیەکی مەرجە سەرەکی‌یەکانی پێکەوە نانی نەتەوەوە.

بۆیە وا لە سەر بناخەیەکی ماددی و مەوزوعی و ئینجا بناخەیەکی قایمی هەست و دەروونی نەتەوایەتی، بزوتنەوەیەکی نەتەوایەتی پایە دیاری لە نێو گەلان و دەوڵەتانی دەسەڵاتداری ئەوساو ئێستاشدا هانیوەتە کایەوە.

بەلام گەلە کۆمەکی دەوڵەتە گەورە چاو برسییەکان و سەرداو سەوداکاری لەتەك تورکیا لە پێناوی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان و دەستخستنی بیرە نەوتەکانی کوردستان و بەهەڵەبردنی سەرکردەکانی کورد لە هەندێ کاری سەرکردایەتیدا، هەرگیزاو هەرگیز بوونی نەتەوەی کوردو مافە ڕەواکانی لە دروستکردن و دەستخستنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیدا، کە وەك ئامانجێکی ستراتیژی رەنگی داوەتەوە بەقەدەر سەرە موویەك لە جێگای خۆیاندا لەنگ و لەرزۆك ناکات.

# نەتەوەو دەوڵەت

دەربارەی نەتەوەو دەوڵەت بیرو باوەڕێکی زۆر لەیەکچوو، وە جیاواز کەوتۆتە ناو ناوانی کۆڕە سیاسی و کۆمەڵایەتی و زانایان و پسپۆڕانی ئەم بابەتە باسەوە. ئەو لایەنەی ئێمە بڕوامان پێی هەیە لایان وایە کە نەتەوە لە کاتی گەڵاڵە بوون وپێکهاتنیدا ئامانجی کۆبوونەوەیە لە دەوڵەتێکی سەربەخۆی یەکگرتوودا، واتە ئاواتی نەتەوە،ڕزگاربوونە لە پارچە پارچە بوون سا ئەم پارچە پارچە بوونە دەستکردی ڕژێمی دەرەبەگایەتی‌و سەرکردەکانی ناوخۆی نەتەوە بێت یاخود دەوڵەتێك یا دووان وسێ دەوڵەت وە یا زیاتر ئەو نەتەوەیەیان پارچە پارچەو ژێر دەست کردبێت. بە دوای ئەم ئامانجە گرنگ و بەهادارەدا کە یەکێکیان تەواوکەری ئەویتریانن تەقەللادانە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئازاد و سەربەخۆ کە ڕیزەکانی ئەم نەتەوەیە کۆبکاتەوە و ئامانجە سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی‌و ڕۆشنبیرییەکانی بەرە بەرە جێبەجێ بکات و لە کوڕی ئەم جێبەجێکردنەدا مەرجە نیوە پێگەیشتووەکان بە تەواوەتی پێبگەیەنێت و پەرەیان پێبدات و گەشەیان پێبکات.

هەر لەم کۆڕەدا ئەو ناکۆکی‌و بیروباوەڕە دێتە کایەوە کە ئایا نەتەوەی لە دەوڵەت بێبەش بوو، بە نەوە لە قەڵەم ئەدرێت یان نا؟ ئایا مەرجی قەوم وگەلێك بە نەوە ناسین بوونی دەوڵەتێکی نەتەوایەتی تایبەتی‌یە؟

لە وەڵامی ئەم دوو پرسیارەدا لایەنە زۆرەکەی شارەزایان و پسپۆڕان بەتایبەتی دەستە چەپەکان لەو بڕوایەدان، کە بڕوایەکی ڕاستیشە، دەوڵەت دامەزراندن لەوانەیە دوای نەتەوە پێکەوەنان واتا دوای بەئەنجام گەیشتنی مەرجە سەرەکییەکانی پێکەوەنانی نەتەوە، ئەگەر لەوە پێش دانەمەزرابێت، دابمەزرێت. وە

نەتەوە بووەو هەیشە جارێ بە ئاواتی دامەزراندنی دەوڵەت نەگەیشتووە مارکسی‌یە لینینی‌یەکان وە خودی لینینی پایە بەرز لەم کۆڕەو لە گەڵ کۆڕی سیاسی‌و مەسەلەی رزگاری گەلان و نەتەوەدا زۆر بەڕوونی ئەم مەسەلەیەیان دەرخستووەو کەوتونەتە ململانێ و بەربەرەکانییەکی توندو تیژو رەواو دادپەروەرانە دژی ئەوانەی لایان وابووە، نەتەوە بە دەوڵەتەوە، بە نەتەوە لە قەڵەم ئەدرێت. یاخود دژی ئەوانەی لە ئۆتۆنۆمی پتریان بەنەتەوە ژێردەست و داگیرکراو و بچوکەکان رەوا نەبینیوە.

لێرەدا مەسەلەی مافی چارەی خۆنووسین، مەسەلەیەکی سەرەکی ئەم ناکۆکی‌و دوو بەرەکی‌یەی نێوان ئەم دوو بەرەیەیە کە لەم باسەدا ئاماژەمان بۆ کردوون.

راستی‌یەکەی وەکو لە ئەوروپا لە دەرەبەگایەتی رزگاربوودا، لەنێوان پسپۆران و فەیلەسوف و زانایانی پێشکەوتنخوازو مرۆڤ پەروەراندا مافی ئازادی تاکە کەس(الفرد) و مافی چارەی خۆنووسین، گەلان و قەوم و نەتەوە بەرەو ئاسمانی بێگەرد بەرزبوونەوە، هەروەها زۆر ئاشکراو روون و خاوێن و بێگەرد، مارکس و ئنگلیزو لینین، ئالآی مافی چارەی خۆنووسینیان بۆ گەلان و نەتەوەکانی سەر زەمین هەڵکرد و بەو پەڕی تواناوە بەبیروباوەڕو بەکردەوە کەوتنە خەباتکردن لە پێناوی یاریدەدانی خاوەنانی ئەم مافەو جێبەجێکردنی لە سێبەری هەر رژێم و سیستەمێکدا واتا لە سێبەری رژێمی سەرمایەداری یا سۆشیالیستی عیلمیدا بێ. ئەگەر دەربارەی مافی چارەی خۆنووسین سەرنجێکی وردی ئەم دوو بیروباوەڕو دووبەرەکی‌یە بدەین،گورج ئەو راستی‌یەمان بۆ روون ئەبێتەوە، کە دەوڵەتانی زۆردارو داگیرکەرو تیۆریست و ئایدیۆلۆژیستی ئەم دەوڵەتانە راستەوخۆ یاخود بە فڕوفێڵ دوژمنی ئەم مافە رەوایە بوون و بە بیروباوەڕو بەکردەوە و بەزەبری ئاگرو ئاسن و خوێن رشتن بەگژ خاوەنانی ئەم مافە رەوایەدا چوون و چەندیان بۆ هەڵسوڕا بێت گەلان و نەتەوەی خاوەن ئەم مافەیان لە گەیشتن بەم ئامانجە رەوا مرۆڤانەیە بێبەش کردووە. کە نەتەوەی کورد نموونەی زۆرلێکراوی ولەم مافە بێبەش کراوەیە. لە مێژووی ئەوروپادا نموونەی بەڵگەداری ئەم بەسەرهاتە نا مرۆڤانەیە هەروەکو بەسەر نەتەوەی کورد-یش دا هاتووە زۆرە.

دوکتۆر(ابراهیم انیس) ئەڵێت [٦٩] "بەڕاستی هەڵوێستی دەوڵەتە گەورەکانی ئەوروپا، دەربارەی ئەو قەومانەی لە سەدەی نۆزدەیەمیندا پەیدابوون، جێگای

سەرسوڕمانە. ئیمپراتۆرییەتی نەمساو روسیای قەیسەری لە هەموو دەوڵەتەکانی تر درندانەتر بەربەرەکانی بیروڕای قەومییەتیان ئەکردو ئەچوون بەگژیا. بزوتنەوەی قەومی لە خاکی پان و بەرینی خۆیانا سەرکوت ئەکردو هەر بەوەش دانەئەکەوتن، بەڵکو ناڕەزایی توندی خۆیان دژی ئەو قەومانە دەرئەبڕی کە لە ناوچەکانی تری ئەوروپا لەدەری ولآت و دوور لە دەسەلآتی خۆیان ئەژیا. حکومەتی نەمسا، شاعیری یۆنانی(ریفاس) لەو کاتەی لە ولآتی نەمسا ئەژیاو بە قەومییەتی یۆنانیدا هەڵی ئەداو قەومەکەی خۆی بۆ سەربەخۆیی هان ئەدا، دەست گیرکرد، دایە دەست دەوڵەتی عوسمانیو ئەم دەوڵەتەش لە شاری بولغراد لە سێدارەی دا!!.

وە کە (ابیسبلانتی) نەتەوەی رۆمانی هۆشیار ئەکردەوەو شۆڕشی لە رۆمانیا دژی ئیستعماری دەوڵەتی عوسمانی هەڵگیرسان قەیسەری روسیا ناڕەزا نامەیەکی زۆر توندو تیژی دژی ئەم شۆڕشە بلآوکردەوە.

هەروەها روسیای قەیسەری توندوتیژو درندانە شۆرشی پۆڵەندی ساڵی ١٨٣٠ ی کوژاندەوەو هەروەکو روسیای قەیسەری لە ساڵی ١٨٤١ دا بەپەلە کەوتە فریای ئیمپراتۆرییەتی نەمسا لە پێناوی کوژاندنەوەی شۆڕشی مەجەری‌یەکان دا".

بەراوردکردنێکی ئەم نموونانەی ئەوروپا سێبەری هاوکاری و تەقەللای ناوکۆیی کۆن و نوێی دەوڵەتە دژەکانی نەتەوەی کوردمان دێنێتەوە بەرچاو.

بەستنی پەیمانی سەعد ئابادی حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٧ ی نێوان تورکیاو ئێران و عێراق و ئەفغانستان بەسەرپەرشتی دەوڵەتی بەریتانیا کە راستەوخۆ دژی بزوتنەوەی رزگاری هێنەری نیشتمانی کورد بوو، هەروەها پیلان و رێککەوتننامەکانی پێشووی دوولانەو چەند لانەی دەوڵەتە دژەکانی کورد تا ئەگاتە کۆبوونەوە کۆنەپەرستانەکانی ئەم دواییەی نێوان حکومەتانی تورکیاو ئێران و سوریا دژی یەکێتی فیدراڵی کوردی عێراق، کە خەبات و هۆشیاری سیاسیو دیبلۆماسی سەرکردەکانی کوردو دۆستە جوامێرەکانی دەرەوەی کوردستان ئامانجەکانیان پوچەڵ ئەکاتەوە، ئەمانەی باسمان کرد نموونەی لە یەکچووی کێشەی هەتا ئەم ڕۆژەی کوردو ئەو نەتەوانەی ئەوسای ئەوروپان.

دەربارەی سەرچاوەی باسەکەمان، نەتەوەو دەوڵەت و پێوەندی نێوان ئەم دوولایەنە، لەم رووەوە دوکتۆر ثروت بدوی ئەڵێت[٧٠] "دەوڵەت شێوەی نوێی

کۆمـەڵێکی سیاسـی‌یە، لەسـەر بناخـەی بوونـی کۆمەڵـە کەسێك کـە لـە هـەرێمێکی جوگرافی سنورکراوو ملکەچ بۆ رێکخراوێکی دیاریکراو دامەزراوە"هەروەها ئەڵێت "لـەم پـێ ناسـینە روون ئەبێتـەوە کەلایەنـە سـەرەکی‌یەکانی دەوڵـەت، دانیشـتوان ژمارەیـان هەرچـەندێك بـێ‌و نیشـتمان پانابیەکـەی هــەر چـەندێك بـێ، وە خـاوەنی سـەروەرێتی بـێ، کـە نیازمـان لەوەیـە دەوڵـەت دەسـەڵاتی بەسـەرهەموو کەسـان و رێکخراوانی سەربەخۆیدا هەبێ و ملکەچی کەس نەبێ. دەوڵەت لەناوخۆدا لە هەموان بەرزترە واتا لـە چوار چێوەی ئەو هەرێمـەی دەسـەڵاتی تێدا ئەنوێنێ. هـەروەکو لـە چوارچێوەی پێوەندییە دەوڵەتییەکاندا ملکـەچی هیـچ دەسـەڵاتێکی دەرەوە نـەبێ و لەتەك دەوڵەتە سەربەخۆکانی تردا وەکو یەکتری مامەڵە بکات.

بۆیـە واتـای دەوڵـەت لەتـەك واتـای نەتـەوە یـاخود قـەوارەی هەرکۆمەڵـە ئـادەم زادێك جیاوازە، چونکە دەوڵەت لەپێش هەمووشتێکدا لە نێو کۆمەڵگادا دەسـەڵاتێکی بەرزە، خاوەن سەروەری تەواوە، لە شان ئەوەوە هیچ هێزو دەسەڵات و سـەروەرێکی بـەهێز تـر یـا هاوتـای بێـت یـا ململانـێی لەگـەڵدا بکـات لـە هەرێمەکـەیدا نی‌یـە. ئەگـەر دەوڵـەت سـەروەری دۆڕان، بوونـی خۆشـی لـەکیس ئـەچێ، بـەڵام لەوانەیـە نەتـەوە بـە بێسـەروەریش ببێـت.بۆیـە ئەمـە رێگـا لـەوە نـاگرێت کـە بـڕوا بـە بوونی قەومییەتی بکرێت."

ئەم باری سەرنجەی سەرەوە زۆر راست و بەجێیە چونکە نەتەوەی پۆڵەندی کە ژێر دەستەی سێ دەوڵەت بوو لە نەتەوایەتی خۆی نەکەوت تا یەکێتی‌و سەربەخۆیی خۆی دەستکەوتەوە .

هەروەها لەوانەیە چەند نەتەوەیـەك پێکـەوە لـەچوار چێوەی دەوڵـەتێکدا بژین بێ ئەوەی هیچ لایەکیان مەرجەکانی دروستکەری نەتەوایەتی بدۆڕێنن، وەکو کوردو عەرەب وئەرمەنی لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی‌دا ،یاخود ئەڵەمانی‌و ئیتاڵیایی وفەرەنسایی‌و رۆمانیش کە پێکەوەو بە ئارەزوو لە یەکێتییەکی لە لایەن هەموویانەوە پەسەندکراو، لە یەکێتی سویسرادا ئەژین.

هـەروەکو مـەرجیش نی‌یـە هـەر کۆمەڵـە خـەڵکێك ژیـاو لـە سـێبەری دەوڵـەتێکدا نەتەوەیـەك پێکبـهێنن. ئێسـتا دێینـە سـەر بیروڕای لینـین دەربـارەی، مـافی چـارەی خۆنووسین (حق تقریر المصیر).

ئەم پیاوە تیۆریستە پایە بەرزە خۆی پرسیار ئەکات و ئەڵێت [71] "نەتەوەکان ئازادی چارەی خۆنووسینیان هەبێ چ واتایەك ئەگەیەنێت؟"- پاش پێشەکییەك کە وەڵامی ناحەزانی ئەم پرسیارە ئەداتەوە و ئەڵێت" ئەم پرسیارە بە وردیو روونی بخرێتە روو، بەرامبەر ئەم پرسیارە مارکسییەك ناتوانێت چاوپۆشی لێ بکات دەستبەجێ نۆ لە دەی بەڵگەکانی رۆزا لۆکەمبورگ فڕێ ئەداتە لاوە، وە نەبێ بزوتنەوە قەومییەکان ئەمرۆ بۆ یەکەمجار لە روسیا کەوتبێتە روو، هەروەها وە نەبێ تایبەت بێ بەم وڵاتە، لە هەموو جیهاندا کە سەرمایەداری بەسەر دەرەبەگایەتیدا سەرکەوتووە، بزوتنەوە نەتەوایەتییەکانی لەتەکدا بووە.

بنچینەی ئەوبزوتنەوە ئابووریانە بەندە بەسەرکەوتنی تەواوی بەرهەمی کەلوپەل ئامێر، کە دەسەڵاتدارێتی بۆرژوازی بەسەر بازاری ناوخۆو یەکگرتنی ئەو خاکانەی دانیشتوانی بە زبانێك ئەدوێن لە دەوڵەتێکدا ئەخوازێت. کە ئەمەش پێویستی بەوەیە هیچ چەپەرێك لە رێگای پێشکەوتنی ئەو زبانەو بنج داکوتانی لە ئەدەبدا نەمێنێ، چونکە زبان هۆیەکی گەورەیە، خەڵکی لە ناویەکتریدا پەیوەندییان بە یەکترییەوە هەبێت. هەروەکو یەکێتی زبان و ئازادی پێشکەوتن هەردووکیان لە مەرجە گرنگەکانن کە ئاڵوگۆڕی بازرگانی بەڕاستی ئازادو هەموو لایەك بگرێتەوە کە لەتەك سەرمایەداری نوێدا جووت ئەبن، هەروەها کۆبوونەوەی خەڵکی، کۆبوونەوەیەکی ئازادو فراوان لە نێو هەر چینێك لەچینەکان جێبەجێ ئەکات.

لە کۆتاییدا لە پێناوی پەیوەندییەکی توند لە نێوان بازاڕ و هەر خاوەن کارێکی گەورە یاخود بچوك، لە نێوان بازاڕ و هەموو کڕیار و فرۆشیارێکدا جێبەجێ ئەکات. تێکۆشان لە پێناوی دەوڵەتی قەومیدا داواکانی سەرمایەدارێتی نوێ بەشێوەیەکی تەواو بەجێ ئەهێنێت. ئەمە فرمانێکە بە هەموو جوڵانەوەیەکی قەومییەوە بەستراوە. هۆیە ئابورییە قوڵەکان ئەم شتانە دروست ئەکەن.

لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێت کە خاسییەتی هەڵبژاردەو شتی سروشتکار لە قۆناغی سەرمایەدارێتیدا، هەر دامەزراندنی دەوڵەتی قەومی لە ئەورووپای رۆژئاوا بەڵکو لە هەموو جیهانی خاوەن شارستانێتیدایە. ئەگەر دوای ئەمە بمانەوێت، بەبێ

ئەوەی یاری بەپێناسە یاساییەکان بکەین وە خۆمان بیروڕای رووت دروست بکەین، بەڵکو مەرجەکانی جولانەوە مێژوییە قەومی و ئابورییەکان لێك بدەینەوە، هەر ئەگەینە ئەم ئەنجامەی خوارەوە:

واتای مافی ئازادی نەتەوەکان لە چارەی خۆ نووسین دا بریتی‌یە لە دەوڵەت دروستکردن و جیابوونەوە لە کۆمەڵە قەومییەکانی تر، دیارە بریتی‌یە لەوەی کە دەوڵەتی قەومی سەربەخۆ بۆ خۆیان پێکەوە بنێن."

ئیتر لەم بیروڕایەی لینین روون و ئاشکراتر کە رەنگدانەوەی ئایدیۆلۆژییەتی مارکس-لینینی راستەقینەیە، چیتر هەیە چەپ خوازەکان باسی بکەن و لێی بدوێن.

هەر چەندە لێرەدا هەندێك لە باسەکەمان دوور ئەکەوینەوە، واتا باسی نەتەوەو دەوڵەت، بەڵام هەر پێویستە ئاماژە بۆ چەند خاڵێکی گرنگ و بەهادار بکەین، کە لەم چەند دێڕەی لینینی مەزندا سەرنج رائەکێشن.

پێش هەموو شتێك، بزوتنەوەی قەومی بەندە بە هەرەسهێنانی دەرەبەگی و پەیدابوون و سەرکەوتنی بۆرژوازی و سەرمایەدارییەوە، هەر وەکو پێوەندییەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری بناخەی ئەم جولانەوە ئابورییەن.

واتا جولانەوەی ئابوری و پەیدابوونی سەرمایەدارێتی و بەرهەمهێنانی نوێی کەل و پەل و پساندنی شیرازەی رژێمی دەرەبەگایەتی توندو تۆڵ بەستراون بە پەیدابوونی جولانەوەی قەومییەوە. کە ئەم جولانەوە قەومییە ئاوات و ئامانجی دامەزراندنی دەوڵەتی قەومی‌یە، نەك هەر لە ئەوروپاو ئاسیادا، بەڵکو لە سەرانسەری جیهانی خاوەن شارستانێتیدا.

لینین ئەوەی لە بیرنەکردووە و زۆر بەوردی دامەزراندنی دەوڵەتی قەومی هەر نەتەوەیەکی کردووە بە نیشانەی شارستانێتی.واتا بەلای لینین-ەوە، کە خۆشی هەروایە، ئەوانەی رێگا لەم مافە ئەگرن دوورن لە شارستانێتییەوە.

دوای ئەمە خاڵێکی گرنگی بایەخداری تری دەرخستووە کە ویست و ئامانجی دەوڵەتی قەومی لە قۆناخی سەرمایەداریدا ئەبێ جێبەجێ بکرێت، بە پێچەوانەی ئەوانەی لەنێو سۆشیالیستە دیموکراتی ئاشتی ڕێبازەکان و هەلبازە چەپرەوەکاندا

ئەیانوت مافی چارەی خۆنووسین و دامەزراندنی دەوڵەتی قەومی یاخود یەکێتی فیدراڵی بە ئارەزوو پەسەندکراو ئەبێ بخرێتە کاتی دامەزراندنی رژێمی سۆشیالیستی عیلمی‌یەوە کە چینی پڕولیتاریا جڵەوی کار لە چینە چەوسێنەرەوەکان ئەسێننەوە!!.

ئنجا لینین دامەزراندنی دەوڵەتی قەومی، بۆ یەکێتی خاك و پێشکەوتنی زبان و ئەدەب زۆر بە پێویست ئەزانێت وە هەردووکیان ئەبەستێت بە نەشونماو پێشکەوتنی سەرمایەدارێتی نوێوە.

جگە لەمانە هەموو رێگایەك لە هەموو لە رێگا لادەرو هەلبازو دوژمنانی ئازادی نەتەوەکانی تر ئەبەستێتەوە، بەوەی هیچ هەلومەرجێك ناخاتە رێگای دامەزراندنی دەوڵەتی قەومی سەربەخۆی هیچ نەتەوەیەکەوە.

ساطع الحصری-ش لەم بارەیەوە ئەڵێت "[٧٢] ئێستا لای هەموان سەلمێنراوە کە واتای نەتەوە ئەبێ لە واتای دەوڵەت جیابکرێتەوە، دیارە کە هەموو نەتەوەیەك روو ئەکاتە ئەوەی دەوڵەتێکی تایبەتی بۆ خۆی پێکەوە بنێت، بەڵام قەوارەی نەتەوە بە دەوڵەتەوە نەبەستراوە.

نەتەوە بوونی ئەبێت با هێشتا نەگەیشتبێتە ئەوەی-دەوڵەتی قەومی- بۆ خۆی پێکەوە بنێت کە کاروباری بەڕێوە بەرێت، یاخود ئەو دەوڵەتە تایبەتییەی خۆشی لە کیسی چوو بێت".

لێرەدا ساطع الحصری دیسانەوە لەو بڕوایەدایە کە نەتەوە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی تایبەتی خۆی هەوڵ ئەدات و بە نەبوونی دەوڵەتی خۆی لە نەتەوایەتی ناکەوێت، با ئەو دەوڵەتەی ئەو نەتەوەیەشی کۆکردبێتەوە، هێزێکی زۆرداری دەرەوە لەناوی بردبێت. بۆیە لەتەك پێشکەوتنی بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازو شکستی بیروباوەڕی داگیرکەرانەو کۆنە پەرستانی جیهاندا ئەو بیروباوەڕە لەجیهاندا باوێکی ئەوتۆی نەما کە ئەیوت نەتەوە بێ خاوەنێتی دەوڵەت پێك نایەت، واتا دەوڵەتیان پێش نەتەوە ئەخست و بەهەموو تواناشیانەوە بەزەبری توندو تیژی چەك و کوشتن و بیروباوەڕی درۆو دەلەسە ئامێز هەوڵیان ئەدا رێگا لە نەتەوە ژێر دەستەکان بگرن، دەوڵەتی نەتەوایەتی تایبەتی خۆیان دابمەزرێنن.

تەوژمــی بــە گــەرمی شــەپۆل ئــازادی و دیموکراتییــەت و مــافی چــارەی خۆنووسین-ی گەلان و نەتــەوەکانی ســەرزەمین ســەرەتا ســەردکییەکانی مرۆڤایــەتی چەسپان و ئایدیۆلۆژییەتی ناڕەواو زۆردارانەی دوژمنانی گەلان و نەتــەوەو کۆمــەڵانی خەڵکی جیهانی لە رەگوریشە هەڵکەن وە دەربارەی ئەو تاکوتەرا نەتەوانەی لەملاو لەولا بێ دەوڵەت و قەوارەی نەتەوایەتی ماونەتــەوە ئــەوا دوژمنــەکانیان لــە چــەکی زۆرداری و شەرمەزاری نێو دەوڵەتان و گەلان بەولاوە چەکێکی ئایدیۆلۆژی تەنانەت فریودەریشیان بە دەستەوە نەماوە.

# نەتەوەی کورد و ناکۆکی ناوخۆ

هەروەك هەموو بوونەوەرێکی گەردوون، هەر لە خریلەیەکی یەك گەردەوە تا ئەرز و ڕۆژ، ملکەچی ناکۆکی ناوخۆو دوو بەرەکین. هەروەها کۆمەڵگای کوردیش کە یەکێکە لە بووەکانی ئەرزو گەردوون ملکەچی ئەم یاسایەیە کە هیچ بووەیەکی نەبواردووە. ئەوی ڕاست بێ هەرچەندە ئەم یاسایە شتێکە بەند نییە بە ویستی هیچ بووەیەکەوە کە مرۆڤ و کۆمەڵگای کورد ـ یش دانەوە کۆمەڵی ئەم بووانە (الموجودات)ن وە هیچ بووەیەك بە ئارەزوو هەڵینەبژاردووە، بەڵکو ئەو خۆی سەپاندووە بەسەر هەموو شتێکی ئەم سەر زەمین و گەردوونەدا.

لەتەك ئەم ڕاستییەشدا ئەم یاسایە، مایەی نەمانی کۆن و پەیدا بوونی نوێیەو، مایەی گۆڕانی کۆن لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی نوێی بالاترە، مایەی پێشکەوتنە لە پلەیەکی نزمەوە بۆ پلەیەکی بەرز، وە لە بەرزەوە بۆ بەرزتر.

هەروەها ئەم ناکۆکی و دووبەرەکییە، وەکو دژ بەیەکترین و ڕووبەڕووی یەکتری وەستاون، لە هەمان کاتدا لەنگەری یەکتری ـ شیان گرتووە بۆماوەیەك و بەپێی یاسای پێکەوە بوون و لەیەکتری ترازانی هەر بووەیەك وەکو پارچە موگناتیسێك دوو جەمسەری هەیە، پێکیشەوە لەنگەریان گرتووەو هەر جەمسەرێکیشیان دژی ئەویتریانن.

یاخود گەردێك کە بریتییە لە ئەلکترۆن و پرۆتۆن لەلایەك لەنگەری گەردەکەیان ڕاگرتووە و لەلایەکی ترەوە لە گەوهەردا دژی یەکترین. وە ئەم لەنگەر ڕاگرتنە هەر ڕاوەستاو ئەبێ تا هێزێکی لە وزەی خۆی گەورەتر لە یەکترییان ئەترازێنێت و وزەیەکی نوێی لێئەکەوێتەوە.

ئەبێ ئاماژەی ئەو یاسایەش بکەین کە هەر وەکو ناکۆکی و دوو بەرەکی هەیە هەروا لە کۆڕی پێشکەوتن و گۆڕانی هەموو شتێکا لەسەرەتاوە تا تەواو بوون لە جولانەوەدان وە ئەم جولانەوەیە ئەشێ ئاڕاستە بکرێت لە نێو یاسا سەرەکییەکەدا وە ئەم ئاڕاستەکردنە ئەتوانرێت پەلەی پێبکرێت بە تیژڕەوی جولانەوەکە.

هەروەها لەم کۆڕەدا ئەبێ خوێنەری بەڕێز هۆشیار بکەینەوە کە ناکۆکی لایەنی سوك و بچوکی یاسەکەو دووبەرەکی لایەنی توند و قورسەکەیەتی، (التناقض الثانوي والتناقض الرئیسي).

بۆیە هەردوو زاراوەکەمان، ناکۆکی و دووبەرەکی پێکەوە بەکارهێنا، رەنگە تا رادەیەك ئەم یاسە سەر لە هەندێك خوێنەر کە شارەزاییەکی ئەوتۆی لەم بابەتەدا نەبێت بشێوێنێت. بەڵام لەلایەکەوە زۆر پێویستە لێی بکۆڵینەوەو لە لایەکی ترەوە پاش درێژەدان بە لێدووان لە یاسەکە لامان وایە بە باشی روون ئەبێتەوە. جگە لەوەی ئەم مەسەلەیە سەری لە بەشێکی زۆری جەماوەری کورد لە کۆڕی لێکدانەوەی رۆڵی یەکێکی وەکو صلاح الدین-ی ئەیوبی شێواندووە، لە گۆڕەپانی موسوڵمانەتی و جەنگی سەلیبی و دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی رەنگو ڕوو عەرەبیدا، کە صلاح الدین گوێی نەداوەتە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی. هەروەها شەڕو ناکۆکی میرنشینە کوردەکان لەتەك یەکتری و چوونە پاڵ ئەم دەوڵەتی سەفەوی و ئەو دەوڵەتی عوسمانی وە یا دەوڵەتانی بیانی تری ناوچەکە.

ئەم سەر لێشێوانەو کێشە دژوارە بە لێکدانەوەی یاسای ناکۆکی و دووبەرەکی ناوخۆی هەر بووەیەك کە کوردیش بووەیەکی ناوبووانە نەبێت روون نابێتەوە.

بێ روون بوونەوەی ئەم لایەنە نائومێدییەکی جەرگبڕ لە دڵی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانا بگرە ساردی و سڕی بەرامبەر داب و نەریتی خودی کورد و لایەنی دەروونی دروست ئەکات لە لایەك وە سەر لێشێوان لە تەقەللادان لە پێناوی سازکردنێکی چاك و لە باری ئەم ناکۆکی و دووبەرەکییەو دۆزینەوەی رێبازی راست و دروست لە لایەکی ترەوە.

وە نەبێ هەر نەتەوەی کورد بە تاقی تەنیا دوو چاری کارو کردەوەی ئەم یاسایە بووبێت، بەڵکو هەموو نەتەوەکانی لە کورد چوو بەم قۆناخەدا تێپەڕیون و دووچاری بوون کە گەورەو روونا کترین نموونە نەتەوەی عەرەبە، کە گەلەکانی

گەیشتوونەتە پایەی سەربەخۆیی و سەروەری و دامەزراندنی دەوڵەتی تایبەتی خۆیان. هەروەها بزوتنەوەی گەلانی جیهانی سێیەم و بزوتنەوەی گەلانی ئیسلام و گەلانی ئەمەریکای لاتین و ئەفەریقا و بزوتنەوەی دەوڵەتانی بێلایەن و دەوڵەتانی ئاشتیخواز و دژ بە جەنگ، بەم کێشە نالەبارو یاسایەوە خەریکبوون. لەگەڵ ئەوەش کە کێشەکە لە دەسەڵاتی هەموو لایەنێك بەدەرە بەڵام لە لایەکی ترەوە ئادەم زاد و کۆمەڵانی ئادەم زاد لە نێو خودی یاساکەدا ئەتوانن دەستەوسان نەوەستن بەڵکو ڕۆڵێکی گەورە لە ڕەوتی هەڵسوڕاندنی ئەم ناکۆکی و دووبەرەکییەدا لە سست ڕەوی و تیژڕەوی و لە گەڵ باری تردا بگێڕن، کە بەرەبەرە لێیان ئەدوێین.

ماوتسی تۆنگ لەم بارەیەوە ئەڵێت [٧٣] " ئەگەر لە کاتی لێکۆڵینەوەی کێشەی خاسییەتی ناکۆکی و دوو بەرەکیدا کێشەی دوو بەرەکی و ناکۆکی (التناقظ الرئیسی و التناقظات غیر الرئیسیة) لە هەر کردەوەیەکی دیاریکراوداو کێشەی چەمکی سەرەکی و چەمکی ناسەرەکی دیاریکراودا، واتا ئەگەر لە جیاوازی ئەم دوو لایەنەیان نەکۆڵینەوە بەمە ئێمە لە لێکۆڵینەوەیەکی رووتەوە، تێوە ئەگلێین و لە تێگەیشتنی لایەنەکانی بەشێوەیەکی دیاریکراو دەستەوستان ئەوەستین وە لە ئەنجامدا ڕێگای ڕاستی چارەسەرکردنیمان بۆ نادۆزرێتەوە.

ماوتسی تۆنگ لەسەر باسەکەی ئەڕوات و ئەڵێت - لە کاتی پێشکەوتنا ئەو گۆڕانەی بەسەر چەمکی سەرەکی و چەمکی ناسەرەکیدا دێت بەتەواوەتی هێزی شتە نوێکان بۆ لابردنی شتە کۆنەکان و چوونە جێگایان دەرئەخات.

لێکۆڵینەوەی لایەنەکانی جیاوازی ناکۆکی و دووبەرەکی، لێکۆڵینەوەی لایەنی سەرەکی و نا سەرەکی، لێکۆڵینەوەی چەمکی سەرەکی و چەمکی ناسەرەکی ئەبنە ڕێبازێکی گرنگ کە پارتییەکی سیاسی شۆڕشگێڕی، بەشێوەیەکی تەواو نەخشە ستراتیژی و تەکتیکییەکانی خۆی لە کاروباری سیاسی و عەسکەریدا بڕیاری لەسەر ئەدەن.

ئەمە لێکۆڵینەوەیەکە ئەبێ هەموو کۆمۆنیستەکان بایەخی پێبدەن ".

بەڕاستی ماوتسی تۆنگ بەوردی بۆ مەسەلەیەکی فەلسەفی و سیاسی و کۆمەڵایەتی گرنگ چووە و دەستی خستۆتە سەر خودی چارەکردنێکی ڕاستی کێشەکە. هەر لەسەر باسەکەی ئەڕوات و ئەڵێت - کە سەرخانی (البناء الفوقی) وەکو

سیاسەت و ڕۆشنبیری، ئەبنە کۆسپ لەڕێی پێشکەوتنی بنکەی ئابوریدا، ئەو کاتە هانینە کایەی سیاسەت و ڕۆشنبیرییەکی نوێ ئەبێتە هۆیەکی سەرەکی کاریگەر.

ئایا بەم وتەیەمان لە ماددییەت لا ئەدەین؟

نەخێر لەبەر ئەوەی پێ لەوە ئەنێن کە لە ڕەوتی بەرەو پێش چووی مێژوودا ماددییەت حاڵەتی دەروونی دێنێتە کایەوە.

وە بوونی کۆمەڵایەتی (الوجود الاجتماعي) هۆشیاری کۆمەڵایەتی دێنێتە کایەوە، دیسانەوە پێ لەوە ئەنێن و ئەبێ پێ ـ شی لێبنێن کە لایەنی دەروونییش کار لە ماددی ئەکات و هۆشیاری کۆمەڵایەتی کار لە بوونی کۆمەڵایەتی ئەکات. وە سەرخان کار لە بناخەی ئابوری ئەکات. ئەمە لە ماددییەت هەڵگەڕانەوە نییە، بەڵکو بەتەواوەتی مانای ئەوەیە لە ماددییەتی میکانیکی خۆمان لابدەین و توند دەست بە ماددییەتی دیالێکتیکییەوە بگرین".

بەڕاستی نەشارەزایی هەندێ لە سەرکردەکانی پێشو و هەندێکی هاوچەرخ و نوێ تا ئەم ڕۆژەی ئێستاش -مان، سەبارەت بە دواکەوتویی چەرخی سیاسی و هۆشیاری سیاسی ئەو کاتانە بوو بێت کە ئەو سەرکردە کوردانەی تیا ژیاون یاخود هۆی کاڵو کرچی بیرو هۆشی سیاسی بێت، زیانێکی ئێجگار زۆری بە ڕەوتی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردی بەرەو دامەزراندنی قەوارەیەکی تایبەتی و سەربەخۆ گەیاندووە.

ڤ. اڤاناسییف لەم بارەیەوە ئەڵێت [٧٤] "لینین نووسیویێتی - پێشکەوتن بەگژاچوونی دژەکانە - وە سوربووە لەسەر ئەوەی کە ئەم بەگژیەکدا چوونە، بەگژیەکدا چوونێکی بێسنورە (المطلق) هەروەکو پێشکەوتن و جوڵانەوەش وەکو ئەم وان- دوای ئەوە لەسەر باسەکەی ئەڕوات و ئەڵێت - مێژووی زانست و کۆمەڵگا ساغیان کردۆتەوە کە بەگژاچوونی دژەکان، سەرچاوەی پێشکەوتنە. هەروەکو پێویستە ئەوە بخەینە پێشچاومان کە بەگژیەکا چوون لە کۆڕی جیاوازی جیهانی ماددیدا بە شێوەی جۆراوجۆر دەکەونە ڕوو".

لەمەولا وردە وردە ئەم باسە شیئەکەینەوە و ڕووداوەکانی نەتەوەی کوردی بەش بەش کراوی پێ ئەخەینە تای تەرازووەوە دوای ئەم پێشەکییە کە لایەنی تیۆری تێدا زاڵ بوو بەسەر باسەکەدا، دێینە سەرخودی باسەکە

دەربارەی کورد بە تایبەتی و هەندێ نەتەوەو گەلانی تر بە گشتی وەکو عەرەب و گەلانی بەڵقان.

لە ئەنجامی داگیرکردنی کوردستانا، کراوە بەسێ بەشەوە جگە لەبەشە بچوکەکانی لە سوریا و یەکێتی سۆڤیاتی جاران و کەمایەتی کورد لە لوبنان و ئەردەن و ئەفغانستان و...

لەوەبەریش لە چاخی بوونی دەوڵەتی سەفەوی شیعە ئاینزاو دەوڵەتی عوسمانی سوننی ئاینزا لە نێوان ئەم دوو دەوڵەتەدا ئەم سێ بەشەی ئێستا کرابوو بە دوو بەشەوە.

بەڵام دوو بەشی ئێستای واتا کوردستانی ژووروو کە بە کوردستانی تورکیا ناو ئەبرێت و کوردستانی خواروو کە بە هی عێراق ناو ئەبرێت هەردووکیان بە دەست دەوڵەتی عوسمانییەوە بوون.

ئەبوو پاش تەواو بوونی جەنگی یەکەمی جیهانی و شکستی دەوڵەتی عوسمانی هاوپەیمانی ئەڵەمانیا، یەکیان بگرتایەوەو سەربەخۆیی سیاسی‌یان دەست بکەوتایە. کەچی ئینگلیز و فەرەنسا لەتەك تورکە کەمالی‌یەکانا بەپێی رێککەوتننامەی لۆزان دەستیان لە هەموو بڕیارو بەڵێنێك هەڵگرت و تورکە کەمالییەکان کوردستانی ژووروویان خستە سەرخاکی تورك و کوردستانی خوارووش کە بە ولایەتی موصل بەناوبانگ بوو لەتەك ولایەتی بەغدا و ولایەتی بەسرادا عێراقی ئێستای لێ پێکهێنرا.

ئەم بەسەرهاتە رەش و تاڵە لە ئەنجامی دووبەرەکی و هەوڵی داگیرکاری دەوڵەتە گەورە دەسەڵاتدارەکانی ئەو کاتە هاتۆتە کایەوە، لەلایەك و لە ئەنجامی بێ بایەخی هەندێ سەرکردەی میرنشینەکانی کوردی ئەوسا بەکرێ گیراوان و خۆفرۆشانی ریزەکانی خاوەن موڵك و بازرگانە چاو برسی‌یەکانی کورد لەلایەکی ترەوە.

لەگەڵ ئەمانەشدا هەموو، ئەگەر سەردارانی میرنشینەکانی کورد و پیاو ماقوڵانی کۆمەڵگای ئەوسای کوردەواری بە باشی ناکۆکی و دووبەرەکی نێوان دەوڵەتە دژ بەیەکە دەسەڵاتدارەکانی ئەوسای ناوچەکەیان بنرخانایە، بەهیچ جۆرێك کورد بەم بارەی ئێستا نەئەگەیشت و دووچاری ئەم رۆژە رەشە نەئەبوو.

لەگەڵ ئەوەشدا لێرەدا جارێ باسی ڕۆڵی ئابووری و ڕەنگدانەوەی لە مەیدانی ناکۆکی و دوو بەرەکیدا ئەکەین. کە دەوڵەتێك نەتەوەیەك داگیر ئەکات و بەزۆر ئەیخاتە چوارچێوەی دەوڵەتەکەی خۆیەوە، بێگومان ژیانی ئابووری ئەو نەتەوە ژێر دەستە کە ئەمە جوغزی کێشەکەیە، ئەبێت بە بەشێك لە ژیانی ئابوری سەرجەم دەوڵەتە داگیرکەرەکە. واتا ئەم کۆمەڵگایەی لەم چوارچێوەیەدا ئەژین ئەبن بە خاوەنی ژیانێکی ئابووری.

ئەم بەستنە ئابوورییە بێگومان لەسەرخان و بەڕێوە بردنی سیاسی ئەو نەتەوەیەدا ڕەنگ ئەداتەوە، هەموو لایەنە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و تەنانەت تا ڕادەیەك زبان و ڕەوشت و داب و نەریتی ئەو نەتەوەیە ئەکەونە ژێر چەپۆکی دەسەڵاتی ئەم لایەنەی نەتەوەی دەوڵەتە داگیرکەرەکەوە.

لێرەدا دوو بەرەکی سەرەکی لە نێوان فەرمانڕەوایانی ئەم دەوڵەتە و سەرجەم نەتەوە ژێر دەستەکەدا دێتە کایەوە، جگە لە مشتێ خۆ فرۆش و بەکرێگیراو کە لە باسکردنی وادا ناخرێتە تای تەرازووەوە، چونکە ئەبن بە بەشێك لە هێزی دەوڵەتە داگیرکەرەکە.

ئەم دوو بەرەکییە سەرەکییە یاسای تایبەتی خۆی ئەیبات بەڕێوە، نە لە حاڵەتی ناکۆکی ئەچێت و نە لەوەی نەتەوە ژێر دەستەکە بچێتە دەوری ڕزگاربوون و سەربەخۆییەوە.

لێرەدا ئەم بەشە نەتەوەیەی لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتێکدایە ئەگەر بەشێکی تر لە هەمان نەتەوە یاخود دوو بەش یا زیاتر بە دەوڵەتانی ترەوە بەسترا بن، دووچاری دوو دیاردەی نالەبار ئەبن کە ئەبنە کۆسپ لە ڕێگای یەکگرتنەوەو یەکخستنی خەباتی نەتەوایەتی لە پێناوی ئازادی و ڕزگاری و یەکێتی نەتەوایەتی سەربەخۆییدا.

دیاردەی یەکەم ئەو ژیانە ئابوورییە تایبەتییەی دەوڵەتێك لە بەشێکی نەتەوەکەدا ئەیسەپێنێ قازانجێکی ماددی و گوزەرانێکی جیاواز لەوانی تر دێنێتە کایەوە، هەروەکو جۆرە داب و نەریت و خوو ڕەوشتێکی تایبەتیش دروست ئەکات و تێکەڵ بە داب و نەریت و خوو ڕەوشتی ڕەسەنی نەتەوەکە ئەکات.

دیاردەی دووەم ناکۆکی سەرەکی ئەم بەشە لەتەك دەسەڵاتدارانی ئەم دەوڵەتە داگیرکەرەدا ئەبێت واتا دوو بەرەکی سەرەکی (التناقض الرئیسی).

بێگومان ئەم دوو دیاردە هەڵقوڵاوە لە ئەنجامی بەش بەش کردنی نەتەوەکە ناکۆکییەکی تایبەتی لە نێوان بەشەکانی نەتەوەکەدا پەیدا ئەکات، کە یەکەمیان لەوەدا ڕەنگ ئەداتەوە کە هەر لایە فەرمانڕەوایان و دەسەڵاتدارانی خۆیان بە چەمکی سەرەکی دوو بەرەکی ئەزانن و هەرگیز بە هەمان چاوو بە هەمان کین و ڕقەوە تەماشای داگیرکەری بەشەکانی تری نەتەوەکەی خۆیانی ناکەن.

جا سەرکردەی هۆشیاری ئەم بەشە نەتەوانە ئەوانەن کە ناکۆکی لاوەکی (الثانوي) ناکەن بە دووبەرەکی توند و تیژ (التناقض الرئیسي الحاد) لە نێو خۆیان و بەشەکانی تردا. وە لەنگەرێکی ڕێکوپێکی بۆ ئەگرن، کە لە سوکترین حاڵەتی ناکۆکی نەچێتە دەرەوە.

بەڵام سەرکردەی گەوج و نەزان یاخود هەڵخەڵەتاو بەدەستی داگیرکەرەکەی خۆی یاخود داگیرکەری بەشێکی تری نەتەوەکەیەوە گورج و گۆڵ ئەم ناکۆکییە ئەکات بە دوو بەرەکییەکی توند و تیژ کە نەتەوەکەی خۆی سەرجەم سەرگەردان ئەبێت و دوژمنانی نەتەوەکەی پێ سەرکەوتوو دەسەڵاتدارتر ئەبن. هەر لەم گۆڕەپانەدا ئەگەر جوڵانەوەی لایەك کەوتە ئاست و ئەندازەی چەك هەڵگرتن دژی داگیرکەرەکەی، هەرگیز سەرکردەکانی ئەو لایە چاوەڕوانی بیروڕای پەسەندکەری لا یاخود لاکانی تر ناکەن با ئەم چەك هەڵگرتن و شۆڕش کردنەش تا ڕادەیەك زیان بەوان بگەیەنێت. یاخود هەرگیز هیچ لایەکیان خۆڕاناگرن تا هەموو لاکان بەسەریەکەوە و لە کاتێکدا دەست بدەنە چەك و شۆڕش لە پێناوی رزگاری هەموو لایەکاناو دامەزراندنی دەوڵەتێکی رزگاربووی سەربەخۆ. مەگەر هەلومەرجی لەبار و وەك یەك بۆ هەموو لایەنەکان پێکەوەو لە کاتێکدا بڕەخسێت، کە هەلی وا بە دەگمەن ئەڕەخسێت.

هەر لەم گۆڕەپانەدا ڕێك ئەکەوێت زۆریش روویداوە، لایەکی داگیرکەر بەشێکی نەتەوەکە لە کلاوڕۆژنەی قازانج و دەستکەوتێکی تایبەتییەوەو لە ئەنجامی دووبەرەکییەکی نێوان خۆی و دەوڵەتی داگیرکەری بەشێکی تری هەمان نەتەوە دەستی یارمەتی ماددی و دەروونی و عەسکەری بۆ بەشەکەی تر درێژ بکات، کە ئەمە

هەندێجار بە ناهەق ئەبێت بە مایەی هیچ نەبێت ساردو سڕی لە نێوان دوو بەشی نەتەوەکەدا، ئەگەر نەشبێت بەمایەی ناکۆکییەکی توندو تیژ، کە ڕاستییەکەی ئەبێ بەشە نەتەوەکەی ژێر دەستی دەوڵەتە داگیرکەرە یاریدەدەرەکە ژیرانەو لەسەرخۆ سەیری ئەم یاسا ئاساییە بکات کە بەرامبەر خۆی و نەتەوە هاوشێوەی خۆی لە جیهاندا زۆر ڕوویداوەو لەوانەشە لە دوا ڕۆژیشدا هەر ڕووبداتەوە.

با لەم بارەیەوە چەند نموونەیەك بهێنینەوە، نەتەوەی عەرەبی لەمەو پێش پارچە بوو، ژێر دەستەی ئینگلیز و فەرەنسا بوون، دوای هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانی زۆر جار ئەملاو ئەولای بەشەکانی ئەم نەتەوەیە دەستیان داوەتە شۆڕش و چوون بەگژ داگیرکەرەکەی خۆیاندا، بێ ئەوەی پرسی بەشەکانی تر بکەن و یاخود دەستدانە چەك و شۆڕش ببەستن بە ڕەزامەندی و دەستگیری بەشێك یا بەشەکانی تری نەتەوەی عەرەبەوە. وە ڕوویداوە داگیرکەری لایەك ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ یارمەتی بەشە چەك هەڵگرەکەی داوە لە کاتێکدا خۆی بەوپەڕی دڵڕەقییەوە مامەڵەی لەتەك بەشە ژێر دەستەکەی خۆیدا کردووە. بەمە ئەو لایەنە یاریدە وەرگرەکە نە سوك ئەبێت و نە شۆڕشەکەشی لەکەدار ئەبێت.

مەلیك حسەینی شەریفی مەککەی ناوداری ئایینی ئیسلام و نەوەی (محمد) درودی خوای لێبێت، لە خەلیفەی موسوڵمانان، خەلیفەی دەوڵەتی عوسمانی هەڵگەڕایەوەو پاڵیدایە پاڵ ئینگلیز و بە پارەو نەخشەیەکی ناوکۆیی لەتەك ئنگلیزدا شۆڕشی لە پێناوی ڕزگاری و سەربەخۆیی عەرەب، دژی عوسمانییەکان هەڵگیرسان.

گەلی جەزائر کە شۆڕشی دژی فەرەنساییەکان هەڵگیرسان نە پرسی بە هیچ لایەنێکی تری عەرەبی کردو نە شۆڕشەکەی بەست بە بەڵێنی دەستگرتنەوە لەلایەن گەلانی عەرەبەوەو نە چاوەڕوانی ئەوەشی کرد هەموو گەلانی عەرەب بەیەکجار دژی داگیرکەرە فەرەنساییەکان هەڵسنە سەرپێ.

هەروەها ناکۆکی نێوان دەوڵەتانی عەرەب لەسەر سنورەکانی نێوانیان هەر ئەکەوێتە چوارچێوەی ئەم باس و یاسایەوە کە هەندێجار لە ناکۆکییەوە ئەچێتە ئاستی سەختترین دووبەرەکی وەکو جەنگی ساڵی ١٩٩٠ی عێراق و کوێت، وە هەندێك لەمە خاوتر وەکو پێکاهەڵپژانی پاسەوانانی سنوری سعودی و (قطر) وە کێشەی (حلايب) لە نێوان میسر و سوداندا.

ئەگەر لە ژێر ڕۆشنایی ئەم یاسایەدا سەیری بارودۆخی ئەم نزیکانەی بەشەکانی نەتەوەی کورد بکەین، چەند بەسەرهاتێکی لەم چەشنەمان بیر ئەکەوێتەوە، کە بەسەرهاتێکیان هێشتا لە ئارادایە. سێ بەشە سەرەکییەکەی نەتەوەی کورد لە عێراق و ئێران و تورکیادا هەر یەکەیان لە نێو خەباتێکدان لەتەک دەسەڵاتدارانی ئەم سێ وڵاتەدا کە ئەچێتە خانەی بەربەرەکانییەوە. لە هەمان کاتدا لەتەک یەکتریدا دووچاری ناکۆکی هەڵوێستی لە یەکتری جیاواز ئەبن بەپێی قازانج و دەسکەوتی تایبەتی و ڕەوتی خەباتی هەر لایەنێکی ئەم نەتەوەیە، کە پێویستە هەرگیز ئەم ناکۆکییە ئاساییە نەچێتە خانەی دوو بەرەکییەوە. وەکو داخی گران لەم دواییەدا پارتی کرێکارانی کوردستانی تورکیا پەڕاندییە ئەم خانەیەوەو بوو بەهۆی پێکاهەڵپژانی هێزە چەکدارەکانی کوردستانی عێراق لەتەک هێزەکانی ئەم پارتییە توندڕەوەدا، کە ئەوسا هیچ سەنگێکی بۆ ئەم یاسایە نەخستبووە تای تەرازووەوە.
لێرەدا پێویستە بە چاوی ڕێزەوە سەیری هەڵوێستە دووربینە ڕاستەکانی سەرکردەی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران، خوا لێخۆش بوو دوکتۆر عبد الرحمن قاسملو بکەین، کە زۆر شارەزایانە و سەربەرزانە لەم یاسایە تێگەیشتبوو وە زیرەکانە تێدا هەڵئەسوڕا. هەر چەندە داخی گران هەموو بەشەکانی جەماوەری خەڵکی کوردستانی عێراق لەم هەڵوێستە ڕاستە قایل نە ئەبوون. خوا لێخۆشبوو قاسملو لە چەند چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەگەریدا ئەیوت دوژمنی سەرەکی ئێمە ڕژێمی ئێرانی بەناو ئیسلامییە و ئێمە پەیوەندی دۆستانەمان لەتەک حکومەتی عێراقدا هەیە، بەڵام بە حکومەتی عێراقمان ڕاگەیاندووە کە دۆستایەتی ئێوە نابێت بەهۆی دوژمنایەتی نێوان ئێمە و بزوتنەوەی کوردی عێراق. ئەوان دەستی یارمەتی بۆ ئێمە درێژ ئەکەن و ئێمەش هەروەها یارمەتی ئەوان ئەدەین.

لە ژێر پەردەی نهێنی چۆتە دەرەوە کە ئەم سێ دەوڵەتە هەرچەندە لەم دواییەدا ئێران و تورکیا لەتەک سوریادا کۆبوونەوەیەکی ناحەزانەیان دژی دەسکەوتەکان و بەرژەوەندی کوردی عێراق کرد، بەڵام هەریەکە لەم چوار دەوڵەتە بە عێراق – یشەوە یارمەتی چەك و تفاق و ئازووقە و پەنادانی بەشێك یاخود دوو بەشی تری نەتەوەی کوردی بەش بەش کراویانداوە، کە نەئەکرێت و نەکاری ئەقڵیشە دەست بەم یارمەتییانەوە بنرێت.

ئەم دەوڵەتانە لە نێو دووبەرەکی و ناکۆکی خۆیاندا وەکو هەریەکەیان چەمکی دوو بەرەکییەکی سەرەکی نێوان خۆیان و بەشێکی نەتەوەی کوردن، ناوبەناو دەستی یارمەتی ماددی و دەروونی بۆ لایەکی تری نەتەوەی کورد لە بەشەکانی تری کوردستاندا بەتەمای ناچارکردنی دەوڵەتی ئەو بەشەی کوردستان و هانینە سەربار درێژ ئەکات.

هەروەکو هەندێجاریش ڕێککەتننامەی نهێنی و ئاشکرا پێکەوە ڕێکئەخەن دژی بزوتنەوەکانی بەشەکانی نەتەوەی کورد. بەلام کار و فرمانی سەرکردە هۆشیارە لێهاتووەکانی ئەم بەشانەی نەتەوەی کورد لەوەدایە وەکو شارەزایانە خوا لێخۆشبوو قاسملو جێبەجێی ئەکرد و لەم دواییەشدا عبدالله ئوج ئالان کەوتۆتە سەربارەکەی، باش لەم یاسایە تێبگەن و ناکۆکییەکانی سەپێنراو بەسەردا چارەی کوتوپڕی بۆ بدۆزنەوە و لە ئاستی خۆیدا سنورێکی پۆلایی بە دەوردا بکێشن، کە نەبنە دوو بەرەکی و پێکاهەڵپژان و لاواز کردنی سەرجەم بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد و دەسکەوتی دوژمنەکانی وەکو لە ڕابووردووی مێژووی نێوان میرنشینە کوردەکان لەم بەش و لەو بەشی کوردستاندا ڕوویئەدا.

وە نەبێ ئەم حاڵەتە هەر بەسەر کوردا تێپەڕ بووبێ، بەڵکو یەخەی گەلێ دەوڵەت و نەتەوە هاو شێوەی لە بەشەکانی تری جیهاندا گرتۆتەوە. ئەوەتا دوکتۆر ابراهیم انیس ئەڵێت [٧٥] "بەلام ئەم دەوڵەتە گەورانە لە ئەوروپادا هەڵوێستێکی دیاریکراویان بەرامبەر قەومە تازە پێگەیشتووەکان نەبووە. روسیای قەیسەری دەستی یارمەتی بۆ شۆڕشی یۆنان درێژ کردو کەچی فەرەنسا کەوتە کۆڕی خەباتێکی درێژخایەنەوە دژی یەکێتی ئەڵەمانی یا قەومییەتی ئەڵەمانی.

بەلام ئنگلتەرە بە پێی پێویستی دەسکەوتە تایبەتییەکانی خۆی سیاسەتێکی بێبارانەی بەرامبەر قەومە تازە پێگەیشتووەکان پەیرەو ئەکرد.

نە بەڕوونی و ئاشکرایی پێی لەسەرەتاکانی مافی قەومەکان ئەناو نە دیارو ئاشکراش ناحەزی ئەکردن.

هەروەها فەرەنسایییەکان وەکو جولانێ لە نێوان پشتیوانی و ناحەزی کردنا ئەهاتن و ئەچوون. پشتیوانی جولانەوە قەومییەکانی یۆنان و بەلجیکایان کردو و

کەچی هەڵویستێکی دوولانە و ناجوامێرانەیان بەرامبەر جولانەوەکانی یەکێتی ئیتاڵیا گرتەبەر.

ئەمە سەرەرای سەرەتاکانی شۆرشی فەرەنسایی و بانگەوازی هەندێ خاوەن بیری فەرەنسایی وەکو رینان کە ئەیوت –هەر قەومییەتێك دێتە جیهانەوە و پێئەگات پێویستە لە لایەن فەرەنساوە یارمەتی و هاندانی دەستکەوێت وە وتەی "لامارتین" وەزیری دەرەوەی ساڵی ١٨٤٨ کە ئاماژەی بۆ جولانەوەکانی یەکێتی ئیتاڵیا و یەکێتی ئەڵەمانیا ئەکرد– فەرەنسا بەربەرەکانی ئەم جولانەوانە ناکات و رێگا بە دەوڵەتانی تریش نادات بەربەرەکانی بکەن _".

لەم باسانەی سەرەوەدا ئەوەمان دەربارەی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد لە هەموو پارچەکانیا دێتە پێشچاو کە کاری سەرکردەی راستەقینەو رۆشنبیرو لێهاتوو لەوەدایە کە بە وردی دوو لایەنی دووبەرەکی و ناکۆکی بە پێوەرێکی زێرکێش بپێوێت.

پێوانەکەش بە کورتی بریتییە لەوەی لەو راستییە بگەن کە هەر بەشە دووبەرەکی تایبەتی خۆی هەیە لەتەك دەسەلاتدارانی ئەو ولاتەی تێیدا ئەژین.

ئەم دوو بەرەکییە توندە تەنیا لە نێوان ئەو بەشەی گەلی کورد و فەرمانرەوایانی ولاتی ئەو بەشەدا هەیە و لە سنورێکی زۆر جیاواز و خاوتردا بەشەکانی تری نەتەوەی کورد ئەگرێتەوە، کە لە ولاتەکانی تردا ئەژین.

بۆیە نابێ هیچ لایەك کێشەی خۆی بکات بە پێوانە بۆ ئەوانی تر. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە پێویستە هەربەشە بە وردی پێوانەی ئەو ناکۆکییانە بکات کە ئەکەوێتە نێوان خۆی و بەشەکانی ترەوە و ژیرانە و لەسەرخۆ و لەبەر رۆشنایی قازانج و دەستکەوتە ستراتیژییەکانی دوا رۆژی نەتەوەی کورد رێگا چارەی بۆ دابنێ و لەو راستییە بگات کە ئەمە حاڵەتێکی کاتییەو لە لایەن دوژمنەوە سەپێنراوەو بە کۆبوونەوەی نەتەوەی کورد ئەم ناکۆکییە لە کایەدا نامێنێت.

# کورد و مەرجی پێکەوەنانی نەتەوە

کە دێینە سەر ئەم باسە هەر لە دەستپێکردنەوە نیازمان لەوە بووە بەم ئەنجامە بگەین، کە لەلایەکەوە بەندە بە خەباتێکی دوور و درێژی ئایدیۆلۆژی بە لای هیچ نەبێ کورد پەروەرە دەستە چەپەکانی کوردستانی عێراق کە زۆر دەمێکە گەیشتبونە ئەو بڕوایەی کە کوردیش وەکو نەتەوەکانی ئەورووپا و ئاسیا لە قۆناخی نا نەتەوەییەوە گەیشتونەتە قۆناخی پێکەوەنانی نەتەوە، وە خاوەنی هەموو مەرجەکانین، یا هەندێ مەرجی _ یشی بە پایەی تەواو نەگەیشتبێ. کاکڵە نەبوونی هەندێ مەرجی پێکەوەنانی نەتەوە هەرخۆی بەندە بە ڕەوتی پێکەوەنانی نەتەوەوە. وەکو هەموو دیاردەیەکی _ گیاندارو ماددی _ ڕەنگدانەوەی ئەم دووانە کە لە خریلەیەکەوە وردە وردە ئەبن بە ساواو ئینجا بە کۆرپەو ئینجا لەوە گەورەترو هەتا هەرزەکاری و لاوێتی و قۆناخی پیاوێتی واتا بەرەبەرە تا قۆناخی کامڵ بوون. ئەمە جگە لەوەی کە هەموو نەتەوەیەك تا قەوارەو دەوڵەتی نەتەوایەتیی یاخود لە دەوڵەتی نەتەوایەتی راستەقینە بچێت وەکو یەکێتی فیدراڵی، دانەمەزرێنێت. هەر هەندێ مەرجی پێکەوەنانی بە فەریکیو ناکامڵی ئەمێنێتەوە، ئەوسا لەژێر سێبەری بە ئامانج گەیشتووی ئەم قەوارەیەدا وردە وردە ناتەواوییەکانی خۆی پڕ ئەکاتەوە.

هەندێجار تا ئەوڕادەیە ئەڕوات کە ئیتر مەسەلەی نەتەوایەتی و قەومی لەوە دەرئەچێت کە بیرو هۆشی کۆمەڵانی خەڵکی بەخۆیەوە خەریك بکات.

سا لەبەرئەوە بێت کە هەموو ئامانجەکانی خۆی جێبەجێ کردووە یاخود سەبارەت بەوە بێت کە هیچ مەترسی تێکچوون و تێکدانی ناوخۆ یاخود دەرەوە لە دڵی ڕۆڵەکانی ئەو نەتەوەدا نەمابێت.

لەلایەکی ترەوە پاڵاوتە بوونی مەرجەکانی نەتەوە، نەك كامڵ بوونی، نەتەوەکە ئەخاتە سەر رێبازی خەباتێکی توندوتیژی لێنەبوردراوی نەتەوایەتی لە پێناوی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوایەتی یاخود هەر هیچ نەبێت یەکێتییەکی فیدراڵی بە دڵی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان، کە لە ئەنجامی بەرژەوەندییەکی راستەقینەی نەتەوەی کوردەوە پەسەندکرا بێت و بە ئارەزوویەکی تەواو و بێ زۆرە ملی هەڵبژێررا بێت.

هەر چەندە نابێ بە رواڵەت چاو لەو راستییە بپۆشین کە ئامانجی نەتەوەی کورد سەبارەت بەوەی خاکەکەی و نەتەوەکە خۆشی بەسەرسێ وڵاتی دراوسێیدا دابەشکراوە، لە دوا رۆژدا، واتا وەکو ئامانجێکی ستراتیژی کە جارێ وا دێتە بەرچاو هەندێك دوور خایەن بێت، هەر یەکێتی هەموو پارچەکانی کوردستانە و کۆبوونەوەیەتی لە دەوڵەتێکی سەروەری سەربەخۆدا.

لەبەر ئەوەی کورد خاوەنی مێژوویەکی دوورو درێژ و زبانێکی رەسەن و خاکێکی تایبەتی مێژوییینی خۆی هەیە، بە پێچەوانەی هەندی نەتەوەی تر کە لە پەرەکانی پێشوودا باسی هەندێکیمان کردووە، ئەوانەی لە زمان و مێژوو بەولاوە شتێکی تریان نەبووەو بەزۆر لە ژێر سێبەری هەندێ هەلومەرجی لاوەکیدا مەرجەکانی تری پێکەوەنانی نەتەوایەتییان کۆکردۆتەوە. لەبەرئەوە، وە تاکو هیچ دوو دڵییەك لە دڵی هیچ رۆڵەیەکی کوردا دەربارەی پوختە بوونی مەرجەکانی پێکەوەنەری نەتەوە نەمێنێتەوە و هیچ دوژمن و ناحەزێکیش لە دەرەوە و ناوەوەی کوردستان هەلی تانە لێدانیان بەدەستەوە نەمێنێت، لە فراوانترین و پڕترین و بە ژمارە زۆرترین مەرجەکانی نەتەوەو نەتەوایەتی کوردەوە دێینە مەیدانی باسکردن و لێکدانەوە کە پێناسی مارکسییەکان یاخود راستر پێناسە بەناوبانگەکەی ستالین – ە کە ئەڵێت[٧٦] "کۆمەڵە خەڵکێکی نیشتەجێ بووە، پێکهاتنیان مێژووکردە، زبانێکی ناوکۆییان هەیە، یەك خاك، ژیانێکی ئابووری ناوکۆیی، حاڵەتێکی دەروونی دروستبووی ناوکۆیی کە لە رۆشنبیرییەکی ناوکۆییدا خۆی ئەنوێنێ". هەروەها ئیلینا مودر جنسکایا

ئـــەڵێت[٧٧] " کۆمەڵــە خـــەڵکێکی نیشــــتەجێ بـــوون، بــــە درێژایــــی مێـــژوو پێکـــەوە نـــراون، لەســـەر بناخـــەی یـــەکێتی زبـــان و خـــاك و ژیـــانی ئـــابووری وە شـێوەی دەروونــی کــە لــە هێڵــە تایبەتییــەکانی ڕۆشــنبیری قەومایــەتیدا خــۆی ئەنوێنێ دەرکەوتوون".

ڕاســتییەکەی هــەردوو پێناســەکە هەریــەکن مەگــەر لــە دارشــتنی ڕســـتەکانا جیاوازییان هـەبێت لەگـەڵ ئەوەشـدا هــەر پێناسـەکەی سـتالین ئەکـەین بـە بنچینـەی باس و لێکدانەوەکەمان.

## کۆمەڵە خەڵکێکی نیشتەجێ بووە

بەڵگە هێنانــەوەی نـاوێت کــە هــەموو نەتەوەیــەك لــە ســەرەتادا لــە کۆمەڵــە خــەڵکێکی بچــوك بچــوك لــە قۆنـاخی کۆمۆنیســتی ســەرەتاییدا پێکــهاتوون و هەموویان پێکەوە چەندیان پێکرا بێت پێکەوە پێویستییە هەرە سەرەتاییەکانی ژیانیان بە رەنجی شـان و ئـارەقی ناوچـەوان پـەیدا کـردووەو هـەوڵیانداوە خۆیـان لــە کۆمەڵــەکانی ئــادەم زادی تــرو ئــاژەڵی کێــوی درنــدە و دەستوەشــاندنی سروشتکاری نالەبار بپارێزن.

دیارە لەو کاتانەدا هیچ کۆمەڵێك تا سەدەکانی ناوەڕاست و ئنجا ڕزینی ڕژێمی دەرەبەگایەتی و پـەیدابوونی سـەرەتاکانی رژێمـی بـۆرژوازی یـاخود ســەرمایەداری نەتەوەیان پێك نەهانیوە.

ئــەم کۆمــەڵ کۆمەڵانــە لــە پێشــکەوتنی قۆنـاخی کۆمۆنیسـتی ســەرەتایی و پەیدابوونی قۆناخی کۆیلەیی و پێشکەوتنی ئـامرازی بەرهەمـهێنان و دابەشـکردنی کـارو هاتنەکایــەی پێوەندییــەکانی بەرهەمــهێنان و پــەیدابوونی چینــەوە، چینــی بەرهەمهێنەرو چینـی بەرهــەم خـۆر، لەتـەك ئـەم پێشـکەوتنەدا لـە دوای ئـەم کۆمـەڵ کۆمەڵە چەند خێزانێك پێکهاتووەو بە دوای ئەماندا هۆزو عەشیرەت هاتۆتە کایەوە، کە زۆربـەیان یـاخود رەنگـە هـەموویان دوو هـۆ کـۆی کردبێتنـەوە، یـەکێکیان هـۆی یـەکێتی خوێـن و خزمایـەتی، دووەمیـان بـەرژەوەندی ئـابووری کـە بتوانـن لـە ژێـر سێبەری هەلومەرجی سەختی ئەوسادا کە باری ژیـان ئێجگـار گـران بـووە. ژیـان و گوزەرانێکی سادە دەستەبەر بکەن.

ئەمانە هەر ئەبوو جگە لە خزمایەتی زبان، خاکێکی ناوکۆییشیان هەبێت، لە خاکەکەدا بەسەربەستی هەڵسوڕێن و ژیانی خۆیانی لەسەر مسۆگەر بکەن.

فەردریك ئنجلس لەم بارەیەوە ئەڵێت "کۆبوونەوەی قەبیلەکان کە خزمایەتی کۆیان ئەکاتەوە، لە هەموو جێگایەکدا فرمانێکی پێویستە، دوای ئەمە یەکگرتنیان، وە لە هەمان کاتدا توانەوەی خەڵکی ئەم قەبیلە بڵاوبووانە لە موڵکییەتێکی بە کۆمەڵی گەلدا".

ڕاستییەکەی لە دوا دوایی چاخی کۆمۆنیستی سەرەتاییدا، (مرحلە المشاعیە البدائیە) قەبیلە لە هەموو شوێنێك هەروەها لە کوردستان -یشدا پەیدابووە، وە لە یەکگرتنی چەندان قەبیلەی بڵاو بڵاودا لە قۆناخی کۆیلەییدا گەل پەیدابووە وەکو مارکسییەکان ئەڵێن گەل کردەی مێژووە، لەو خەڵکانەی زبان و خاکێکیان هەیە و هەندێ رووی ڕۆشنبیری ناوکۆیی و پێوەندی سەرەتایی ئابووری، بەڵام پارچە پارچەیی دەرەبەگایەتی ڕێگای یەکێتییەکی ئابوری توند و دامەزراندنی بنچینە ماددییەکانی نەتەوەی لێگرتوون.

هەرچۆنێك بێ، وەکو لە لاپەڕەکانی پێشوی ئەم باس و لێکۆڵینەوەیەدا وتوومانە، کوردستان هیچ نەبێ هەر لە بوونی مرۆڤی نیاندەرتاڵەوە تا مرۆڤی ژیر (العاقل) و دوای ئەمان خێزان و هۆز و عەشیرەت و قەوم، خەڵکی تێدا ژیاوەو پێش زۆر قەومیتری سەرزەمین کە ئێستا خاوەنی نیوە شارستانێتیو شارستانێتی تەواو و دەوڵەتی خۆیانن، کۆمەڵە خەڵکی کوردستان بە هۆی کشتوکاڵ کردن و ئاژەڵدارییەوە نیشتەجێ بوون، وە شارو شارستانێتییان دامەزراندووەو قەوم و گەلانی دراوسێ چاویان لێکردوون و کەڵکیان لێوەرگرتوون، تەنانەت خێڵەکێتی کورد لە سنورێکی زۆر تەنگەبەردا بووە. چونکە گەلانی تر هەر بوون بە دوو بەشەوە، نیشتەجێکان و خێڵەکییەکان، کە ئەم خێڵەکییانە بە درێژایی ساڵ لە دەشت و بیابانا بەو جۆرە ژیانیان بردۆتە سەر.

بەڵام زۆربەی خێڵەکییەکانی کورد سەبارەت بە هەڵکەوتی خاکی کورد کە کوردستانە بەشی زۆری وەرزەکانی ساڵ، پایز و زستان و بەهار، دێهات نشین بوون، تەنیا لە وەرزی هاویندا هەواری خۆیان بۆ شوێنە کوێستانەکان بۆ حەسانەوەی خۆیان و بەدوای لەوەڕگای نوێدا گواستۆتەوە.

دوو خاڵی زۆر گرنگ و بایەخدار لەم کۆڕەدا کورد لە زۆر نەتەوەی تر جیا ئەکاتەوە، یەکەم زۆر دەمێکە نیشتەجێ بووەو دەستی داوەتە چەمکی شارستانێتی و

لە قۆناخی خێڵەکێتی رزگاری بووە، کە گەلانی وا هەن وەکو مەغۆلییەکان تا دروستبوونی یەکێتی سۆڤیاتی بەسەرکەوتنی شۆڕشی مەزنی ئۆکتۆبەر هەر سەرجەم کۆمەڵگایەکی خێڵەکی بوون.

ئەو بەشە کەمە خێڵەکێتییە کوردەی هەبووە، هەر خێڵە لە ناوچەکەی خۆیدا لە گەرمەسێرەوە چوونەتە ساردەسیر کە لە هەندێ شوێندا وەکو هۆرین و شێخانی سەر بە پارێزگای سلەیمانی، نێوانی هەوارگەی هاوینیان لەتەك هی زستاندا لە نۆ تا دە کیلۆمەترەیەك لە یەکترییەوە دوورە.

خاڵی دووەم زۆربەیان بە کۆمەڵە خەڵکێکی سەربەیەك لایەنە ڕەگەز پێکهاتوون، نەك لە کۆمەڵە خەڵکێکی هەرەمە وەکو عەرەب و ئیتاڵیایی، کە بۆ ڕۆڵەی کوردستان هەیە شانازی بە خۆی و نەتەوەکەیەوە بکات.

# بەدرێژایی مێژوو پێکهاتووە

یەکێتی مێـژوو واتـا قـەومێك مێژوویـەکی نـاوکۆیی هـەبێت تـا لـە ئـەنجامی پێشکەوتن و کۆبوونەوەی مەرجەکانی تردا نەتەوە پێکبهێنێت.

نەتـەوەی کـورد لـە بوونـی ئـەم مەرجـەدا لـە نەتـەوە پێشـکەوتووەکانی جیـهان ئەژمێردرێت، چونکە خاوەنی مێژوویەکی زۆر کۆنە کە تەمەنی هەزاران ساڵە و تونـد و تۆڵ لەتەك باڵای خۆیدا هاتۆتە خوارەوە. هـەر لـەو کاتـەوە کـە لـە کۆمەڵـە هـۆزو عەشـیرەتێك کۆمـەڵانی خـەڵکی ئەوسـای کوردسـتان پێکـهاتوون تـا ئـەو شـەپۆلە مێژووییە ئارییانـەی کە لـە ژوورەوە سەرەوخوار روویـان کردۆتـە هـەموو ناوچـەکانی کوردستان و تێکەڵ بە دانیشتووە کۆنەکانی ناوچەکە بوون کـە لەمـەوپێش بـەدوورو درێـژی باسـی هـەردوو شـەپۆلەکەمان کـردووەو ئـەو خـەبات و هەڵپژانانـەی کـە لەتـەك گەلـە دراوسـێکانی - شـدا روویـداوە بـە تایبـەتی لەسـەرەتاوە لەتـەك ئیمپراتۆرییەتە گەورەکانی فارس و عوسمـانی و ڕووسی قەیسـەری و ئنگلیز و ئنجا دەوڵەتانی تورك و ئێران و عێراقدا.

لە مێژووی قەومی کوردا پێش ئەوەی بگاتە پلەی نەتەوە، ئیمپراتۆرییەتی مادد ڕۆڵێکی ئەوتۆی گێڕاوە کە نیشانەی دیارو کاریگەر و بایەخداری نەك هەر لە مێژووی نەتەوەکەمانا بەڵکو لە مەرجەکانی تری پێکەوەنانی نەتەوەی کوردا بەجێهێشتووە.

بەتایبەتی لە زبان و ژیانی ڕۆشنبیری و بگرە تا ڕادەیەك لە سنووری کوردستان -یشدا. ئاینی زەردەشتی و کتێبی پیرۆزی ئاوێستا کە ئاینێکی خودا نـاس بـووەو لـە ئیمپراتۆرییـەتی مـاددا ئـاینێکی بـڵاوو پـیرۆز بـووە، لـە ڕووی خوورەوشـت و داب و نـەریت و ژیـانی ڕەوانـی (الروحـی) و لـە ئـەنجامدا ڕۆشـنبیری ئەوسـا بـە درێژایـی مێژووی کوردا جێگایـەکی دیارو بەکـەڵکی بـۆ خـۆی کردۆتـەوە، تـا ئـاینی پـیرۆزی

ئیسلام دوای جەنگی ئیسلامە عەرەبەکان و کیسرا (یەزد جورد) لە ڕۆژهەلاتی دیجلەدا روویداو عەرەب تێیدا بەسەر عەجەمدا سەرکەوتوو لە ئەنجامی ئەم سەرکەوتنە ئەم جەنگە بەرەو کوردستان - یش هەڵکشاو بە زۆرو بەخوایشت قەومی کوردیش ئاینی ئیسلامی پەسەند کردوو ئەم پەسەندکردن و ئاین گۆڕینە خۆشی بوو بە بەشێك بە خۆشی و ناخۆشییەکانییەوە لە مێژووی نەتەوەی کوردا.

هەروەها سەرکەوتنی ئیمپراتۆرییەتی ماددەکان لە ساڵی ٦١٢ی پێش زایینی بەسەر ئاشوورییەکانداو لەناوبردنی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوری قەومی کوردی بۆماوەیەکی زۆر لە چەپاوەڵ و داگیرکردن و کوشت و کوشتاری ئاشوورییە درندە تالانکەرەکان رزگار کردووەو تا ڕادەیەك خاکی کوردستان -یش لە داگیرکردن و پارچە لێ دزین و جیاکردنەوە رزگارکردووە.

ئەم بەسەرهاتانەی لێرەدا ئەتوانین باسی هێڵ و سیمای گشتییان بکەین، هەر وەکو گەلێ لاپەڕەی نەخشین و پڕ شانازییان تێدایە، هەروەها لاپەڕەی تاڵ و نالەبارو ناخۆش -یشیان گرتۆتە خۆیان.

ئەمە وەنەبێت هەر بەند بێت بەنەتەوەی کوردەوە، بەڵکو بەسەرهاتێکە ڕوو ئەکاتە هەموو نەتەوەیەکی جیهان لە کۆڕی مێژووی نەتەوایەتی کوردا سەبارەت بەوەی خاکی کوردستان هەڵکەوتێکی جیۆپۆلیتیکی ستراتیژی بەهاداری تایبەتی هەیە، هەمیشە دەوڵەتە دراوسێ و دوورەکانی کورد، چاویان تێبڕیوەو ڕوویان تێکردووەو کردویانە بەگۆڕەپانی جەنگ. سا بۆ داگیرکردنی خودی کوردستان خۆی بێت یاخود بۆ بەسەرا تێپەڕین و هێرش بردنە سەر وڵاتێکی تر ڕووی دابێت وەکو جەنگەکانی نێوان فارس و یۆنانییەکان وە گەڕانەوەی دە هەزار یۆنانییە شکاوەکان بەناو کوردستانا کە لاپەڕەکانی مێژوو جەنگاوەری کورد ئەگێڕنەوە.

ئەم بەسەرهاتانە هەمووی تەنانەت خەباتی چینایەتی کوردیش لە سێبەری ڕژێمی کۆیلەیی و دەرەبەگیدا بوون بە دیاردەیەکی مێژوویی لە ژیانی تازە پێگەیشتووی نەتەوەی کوردا.

بەسەرهاتەکانی هاوچەرخ کە لە کات و دوای جەنگی یەکەمی جیهانی بەسەر نەتەوەی کوردا هاتووە و کوردی بەم بارە تاڵەی ئێستا بردووە، سەرجەم مێژووی

کورد هەر لە پەیدابوونی هۆزو عەشیرەتەوە تا ئەمڕۆمان لەبەر ڕۆشنایی زانستی کۆمەڵایەتی سیاسیدا ئەبێ بە وردی لێی بکۆڵرێتەوەو تەتەڵە بکرێت.

بەشێوەیەك لا چاکەکانی لەتەك لا ناپەسەندەکانی جیا بکرێنەوەو پیلان و نەخشەکانی داگیرکەران و دوژمنانی کوردستان هەموویان بخرێنە بەر باس و لێکۆڵینەوە، تاکو لەلایە چاکەکانی کەڵك وەربگرین و لاناپەسەند و خراپەکانیشی لە چاڵێکی تاریکی قووڵدا خەفە بکرێن.

داخی گران جگە لەوەی تا ئەم دواییە سەرکردایەتییەکی شارەزاو لێهاتو و دیپلۆماتزان جڵەوی بەڕێوەبردنی بزوتنەوەی نەتەوەی کوردی نەگرتبوە دەست، هەروەکو ئەو هەل و مەرجانەی گەمارۆی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردو هەموو نەتەوەی کوردیان دابوو، تا ڕادەیەکی زۆر دەست و پێی ئەو سەرکردانەشی بەستبووەوە. بەڵام لەگەڵ ئەم بارە نالەبارانەشدا ئەمڕۆ هەلومەرجێکی نوێ و لەبار و پێوەندییەکی نێو دەوڵەتانی نوێ کەوتوونەتە سەر شانۆی سیاسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە.

نەتەوەی کورد لەم بارە نوێیەدا لە هەموو بەشەکانی کوردستانا هەلومەرجێکی زۆر ساز و ڕەوانی بۆ هەڵکەوتووە کە نابێ وەکو پێشوو مۆڵەت بدرێت لەدەست بچێ.

کورد و بزوتنەوەی نەتەوەی کورد ئەمڕۆ ناوبانگێکی گەورەیان لە نێو دەوڵەتان و گەلانی خاوەن بڕیاری سیاسی جیهاندا پەیداکردووە وە بوون بە قورساییەکی سیاسی بایەخدار لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پشتگوێ ناخرێن و فەرامۆش ناکرێن.

هەروەها پشتیوانی کردنی بزوتنەوەی نەتەوەی کوردو جێبەجێ کردنی مافە نەتەوایەتییە ڕەواکانی بوون بە فرمانێکی گەورەو ڕێز لێنراو لە نێو گەلانی ئەمەریکاو ئەورووپای ڕۆژئاواو تەنانەت لە نێو هەندێ گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست -یشدا وەکو گەلی تورك لە وڵاتی تورکیادا.

ئنجا پێویستە لەسەر نەتەوەی کوردو جوڵانەوە و سەرکردەکانی لەم جیهانە نوێیەدا، کە لەمەوپێش کورد زروفی لەباری وای بەخۆیەوە نەدیبو، کەڵك لەم حاڵەتە دڵخۆشکەرە بایەخدارە ببینن و نەیەڵن بە فیڕۆ بڕوات و جارێکی تر دوژمنانی کوردو ئامانجە ڕەواکانی لە هەورازی ئاسۆی ڕۆشنەوە بمانخلیسکێننەوە دامێنی تاریکی و نائومێدییەوە.

# زبان و كورد

زبان لە مەرجە هەرە گرنگەكانی پێكهێنەری نەتەوەیە. هەندێ پسپۆڕانی ئەم بابەتە هەر ئەیكەن بە تاكە مەرجی پێویست و هەندێكی تر مێژووشی ئەخەنە پاڵ و هەن مەرجی ڕۆشنبیری – شیان لەتەكدا كۆئەكەنەوە و بە هۆیەكانی پێكهێنانی نەتەوەیان لە قەڵەم ئەدەن.

ڕاستییەكەشی هەرچەندە زبان بە تاقی تەنیا نەتەوە پێكناهێنێت وە لەوانەیە وەكو لە پێشەوە باسمان كردووە، دوو نەتەوە یاخود زیاتر بە زمانێك بدوێن وەكو نەتەوەی فارس لە ئێران و نەتەوەی تاجیكی لە تاجیكستانەوە نەتەوە توركی زبانەكان لە توركیا و ئازربایجان و ئۆزبەكستان و ویغوری و...

هەرچەندە بە تاقی تەنیا نەتەوە پێك ناهێنێ بەلام زبان سەرمەشقی هەموو مەرجەكانی ترە، بەبێ ئەم مەرجە هیچ گەل و كۆمەڵە خەڵكێك، دەوڵەتیان هەبێت یا نەبێت نەتەوەیان لێ پێك نایەت، ئەویش سەبارەت بەوەیە كە زبان هۆیەكی گەورەی بەیەكەوە بەستنی ئەو كۆمەڵە خەڵكەیەو بەو زمانە لە یەكتری ئەگەن و بیرو باوەڕی پێ ئەگۆڕنەوە و كاروباری سیاسیو ئابووریو كۆمەلأیەتیو ڕۆشنبیری خۆیانی پێ ڕێكئەخەن و پێش ئەخەن.

هەروەك لەتەك بیر (الفكر)دا پێوەندییەكی توند و تۆڵیان بەیەكترییەوە هەیە، جگە لەوەی هەموو ڕەنجێكی ماددی و دەروونی بە هەموو واتای ئەم دوو وشەیەوە بە زبان لە نەوەیەكەوە ئەگوێزرێتەوە بۆ نەوەیەكی تری گەل و نەتەوەكە لە فەوتان و نەمان –یان رزگار ئەكات.

بۆیە زبان پێوەندییەكی توندیشی جگە لە لایەنە ڕۆشنبیرییەكە بە مێژووی كۆمەڵگا و گەل و نەتەوەشەوە هەیە.

لەبەر ئەوەی لە لاپەڕەکانی پێشوودا باسی زبان بە گشتی و پەیدابوونی زبانی کوردی بە تایبەتی-مان کردووە وە نەتەوەی کورد ئێستا زبانێکی ڕێکوپێك و پێشکەوتو و پاراوی لە سەرانسەری کوردستانا هەیە. وە لە زمانە هەرە ڕەسەنەکانی گەلان و نەتەوەکانی ئەم سەرزەمینەیە، لەبەر ئەوە لێرەدا تیشك ئەخەینە سەر زبانێکی یەکگرتوو لە نێو زاراوەکانی زبانی کوردیدا.

وەکو ئاشکرایە نەتەوەی کورد لە خۆیەوە هەڵنەقولاوە، بەڵکو لە ئەنجامی بڕینی چەند قۆناخێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و چینایەتی پێکهاتووە و لە ئەنجامی یەکگرتنی کۆمەڵە هۆز و عەشیرەت و ناوچەی دوورو نزیك لە یەکتری و بە تێکەڵ بوونی چەند میرنشینێك پێکهاتووەو هەر هەندێ نەتەوە هەن لە تێکەڵ بوونی چەند قەوم و گەلێکی جیاوازیش پێکهاتوون یاخود گەلێکی کەم ژمارە خۆی و زبانەکەی بەسەر گەلێکی تر یاخود چەند گەلێکی تردا سەپاندووە، هەموویان لەناویانا تواونەتەوەو زبانە کۆنەکەی خۆشیان بیرچۆتەوە.

لەبەرئەم هۆیانە هیچ نەتەوەیەك نییە، هەر لە سەرەتاوە یەك زبان و یەك زاراوە (لهجە)ی هەبوو بێت. بەڵکو هەموو نەتەوەکانی سەر زەمین زبانەکەیان لە چەند زاراوەیەك پێکهاتووە، کە ڕاستییەکەی ئەم زاراوانە لە سەرەتاوە بوون بە کۆسپی سەختی ڕێگای زبانێکی یەکگرتوو. چونکە هەر کۆمەڵە خەڵك و قەوم و گەلێك ئەگەر نەبنە خاوەنی زبانێکی یەکگرتووی ناوکۆیی هەموویان، ئەمانە پێیان خۆش بێت یا ناخۆش لە ئەنجامدا ئەبنە چەند نەتەوەیەك.

مایەی شانازی و بەختیارییە کە زبانی کوردی سەدان بگرە هەزاران ساڵە مێژوو کردانە لەتەك عەشیرەت و هۆزەکانی کوردو ئنجا قەومی کوردو ئێستا نەتەوەی کوردا هاتۆتە خوارەوە، وەکو کورد وردە وردە نەشونمای کردووەو پەرەی سەندووە، هەروەها زبانەکەشی گەشەی کردووە تا گەیشتۆتە ئەم تەمەنەی ئێستای کە زبانێکی ڕەسەنی بەهاداری ئاواز و مۆسیقا خۆشی بۆ ڕەخساوەو لە ڕێڕەودایە لەتەك زبانە پێشکەوتووەکانی جیهان.

زبانی کوردی لەو زبانانە نییە کە زبانێکی بیانی خۆی بەسەردا سەپانبێت و ئەو زبانە لە بیر خەڵکی چوو بێتەوە و ئێستا نەتەوەی کورد بە زبانی گەلێکی تر

بدوێت وەکو بەسەر زبانەکانی فینیقی و فیرعەونی و بەربەری و ئارامیدا بە دەست زبانی عەرەبییەوە هاتووە، یاخود بەسەر زبانی جارانی دوورگەی بەریتانیادا.

بەلام کوردیش وەکو هەموو نەتەوەکانی تری سەر زەمین، وە کە ئەبێ هەرواش بێ، خاوەنی چەند زاراوەیەکە، کە ئەبێ لە ئەنجامدا، با هەر ناوچەیەك بە زاراوەی خۆیان بدوێن، زبانێکی یەکگرتووی ناوکۆیی (یاخود راست تر زاراوەیەکی) بۆ ببێت بە زبانی نووسین و شیعر و ئەدەب و ئیستگە و تەلەفزیۆن و شانۆو زانکۆ و ئامۆژگا و زانست و مامەڵە پێکردنی دایەرە دەوڵەتییەکانی نێو نەتەوەی کورد.

دیارەبوونی قەوارەیەکی تایبەتی، یا دەزگایەکی لە قەوارە چوو، وەکو یەکێتییەکی فیدرالی راستەقینە مەرجی جێبەجێکردنی ئەم ئامانجە پیرۆزەیە. لەگەڵ ئەمەشدا، نابێ ئەوە تا ئەو کاتە دەستەوسان رامانوەستێنێت و بەو تەمایە پشتی لێ بکەینەوە.

بەڵکو زۆر پێویستە بە تایبەتی لەسەر کەسانی خەمخۆری ئەم لایەنە و زانایان و پسپۆران و شاعیر و ئەدیب و هونەرمەند و هەموو رۆشنبیرانیکورد وە هەموو عیلاقەداران بە دەزگاکانی راگەیاندنەوە ئەرکی زمانێکی ناوکۆیی بگرنە ئەستۆ و جێبەجێ کردنی بە فرمانێکی پیرۆزی نەتەوایەتی کورد بزانن.

ئەگەرهەر لە دوژمنان و ناحەزانی کوردەوە مەشق وەربگرین و فێر بین، ئەروانین چۆن بە پەرۆشەوە و بە هەموو توانایانەوە هانە هانەی پەیدابوونی چەند زبانێکی کوردی لە زاراوە کوردییەکان ئەدەن.

سەرکردەکانی شۆرشی تەموزی فەرەنسای سالی ١٧٨٩ زۆر زوو پەیان بەم کەلێنە گەورەیە برد. بۆیە ساطع الحصری بایەخی بەم لایەنە داوە و ئەڵێت [٧٩] "وەکو زانراوە ولایەتە جۆراو جۆرەکانی فەرەنسا، تا دەوروبەری شۆرشە مەزنەکە.. دەسەلاتێکی زۆر و هەمە رەنگیان هەبوو.. پیاوانی شۆرش لە پێناوی یەکێتی ولاتدا لایان وابوو کە پێویستە ئەم دەسەلاتانە لەناوببرێت وە دەست هەڵگرتن لە هەموو ماف و دەسەلاتێکی پاشماوەی رژێمی دەرەبەگی لەناوچوویان بلاوکردەوە، وە پیاوانی شۆرش پەیکەری بەرێوەبردنی کۆنیان لە بنەرەتەوە گۆری و لەسەر بنچینەیەکی تەواوی نوێ رێکیان خستەوە، تاکو دیاردەکانی دەرەبەگایەتی کۆن لە نەخشەی ولاتدا لەناوبەرن.

زاراوەکان (اللهجات) بە بەرچاوی پیاوانی شۆڕشەوە بەشێك بوون لە پاشماوەکانی دەرەبەگایەتی کە پێویست بوو وەکو هەمووی لە ناوببرێت. بەڵام زاراوەکان بە بەیاننامەو بڕیاری حکومەت و ئەنجومەنانی نوێنەرایەتی (المجالس التمثیلیە) بە تاکە پەلاماردانێك لە ناونابرێن وەکو لابردنی دەسەڵاتە ناوخۆیی و گۆڕینی دابەشکردنی بەڕێوەبردن، بەڵکو لە نێو هەڵگرتنی زاراوەکان کارێکی درێژخایەنی چەند نەوەیەکی ئەوێت. بۆیە ئەنجومەنی شۆڕش هەموو خەڵکی بانگەواز کرد کە بایەخ بەم فرمانە بدەن. ئەویش بەپێی بەیاننامەیەك کە لە ١٥-ی مانگی (بریریال)ی ساڵی دووەمی ڕۆژنامەی شۆڕش بڵاویکردەوە.

لە بەیاننامە ناوبراوەکەدا ئەڵێت "ئەی هاوولاتیان با هەر یەکێکتان لە پێناوی لەناوبردنی زاراوەکان لە هەموو هەرێمەکانیفەرەنسادا بچنە کۆڕی پێشکەوتنێکی پیرۆزەوە" "ئەو زاراوانەی کە پاشماوەی دەوروبەری دەرەبەگایەتی و بەندە گێتێن".

ئەوی ڕاست بێ پەیدابوونی زبانی فەرەنسایی لە زاراوەیەك لە زاراوە زۆرەکانی لەوەپێشی زبانی فەرەنسایی مێژوویەکی دووروودرێژی هەیە کە بەندە بە چۆنێتی پێکهاتنی نەتەوەی فەرەنسایی لە میرنشین و دەوڵەت و دەوڵەتۆکەکانی فەرەنساوە، کە هەندێکیان بە زۆر و بە جەنگ و هەندێکیان بە ڕێککەوتن و هەندێکیان لە ئەنجامی ژن و ژنخوازی نێوان میرەکانی ئەم میرنشین و ئەو میرنشین هاتۆتە کایەوە. بەڵام لێرەدا هەر ئاماژە بۆ ئەوە ئەکەین کە زبانی ئێستای فەرەنسایی لە کاتی خۆیدا لە زاراوەیەك کەوتۆتەوە کە زاراوەی ناوچەیەك بووە، شاری پاریسی ئێستا کەوتۆتە نێوانییەوە کە ئەوسا بە دورگەی فەرەنسا ناسراوە.

دیارە ئیتر دوای ئەوەی زاراوەی ئەم ناوچەیە بوو بە بنکە بۆ زبانی فەرەنسایی وەکو هەموو دیاردەیەکی تری ئەم جیهانە وردە وردە گەشەی کردووەو پەرەی سەندووەو دەوڵەمەند بووە، تا بووە بەم زبانە پاراوە شیرینەی ئێستا.

ساطع الحصری وە هەموو خەمخۆرانی زبانی عەرەبی لەم ڕووەوە هاواریان لە دەست فرە زاراوەی عەرەب لێ هەڵساوە و مەترسی ئەوەیان لێ پەیدا بووە کە نەوەکا هەر زاراوەی وڵاتێکی عەرەبی ببێت بە زبانێکی تایبەتی، زاراوەی میسری بە زبانی میسری و مۆریتانی بە زبانی مۆریتانی و عومانی بە زبانی عومانی.. وە بەم پێیە دانیشتوانی هەر وڵاتێکیش لەم وڵاتانە ببن بەنەتەوەیەکی سەربەخۆ.

دوكتۆر ابراهيم انيس لە بارەی زاراوە و پێ دوانییەوە ئەڵێت "[٨٠]ئەو ئاستە بەرزەی ئەم زبانە لەنووسیندا هەیەتی لەتەك پێدووان و گفتوگۆكردندا بەراورد ناكرێت، چونكە وەكو پێی ئەدوێین فرە بەرەوخوارترە لەوەی پێی ئەنووسین...

دەربارەی زاراوەكانی پێ دووان (لهجات الخطاب) حاڵەتەكە زۆر بێكەڵك ترە، داخ و تاڵاومان ئەكات بەدڵدا. میسرییەك بچێت بۆ بازاڕێكی عێراقی یاخود مەغربی، ئەبینێت كە ناتوانن لە یەكتری بگەن، یاخود لەیەكتری گەیشتن وەكو شێوە نەتوانین وایە، زۆر بەزەحمەت نەبێت ناتوانێت بە فرمانی كڕین و فرۆشتن هەڵسێت. وتە جوون و پێكەوەنان و دەنگ دەربڕین هەموو جیاوازن، وە ئەگەر دەست بداتە زبانی ناوكۆیی (فەصیح) (اللغة المشتركة الفصيحة) قسەكەر و گوێگر توشی سەرەخولێ و ماندوو بوون ئەبن. داخی گران ئەنجامەكەی ئەگەنە ئەوەی بە زبانێكی بیانی كە هەردوو لایان لێی شارەزابن لەتەك یەكتریدا بدوێن.

(الكمثرى) لە میسر (العرموط)ە لە بەغدا، (البرقوق) لە میسر (الخوخ)ە لە ئەردەن، (الخوخ) لە میسر (الاجاص)ە لە شام. وە وشەی (البوظه) لە میسر واتایەكی بێ كەڵكی هەیە كەچی لە لوبنان و ئەردەن نیشانەی باشییە، لە ئاووهەوای گەرمدا ساردەمەنییەكی ئارەزوومەندانەیە، ئیتر لەوە پتر ماوەی ئەوە نییە نموونەی تری پێكەنین ئاوەر هەندێجار و داخ ئاوەر هەندێجاری تر بهێنینەوە... لەوە ئەچێت كە قەومییەتە عەرەبییەكەمان كە لەبنچینەدا لەسەر یەكێتی زبان ڕاوەستاوە، لە پێناوی پەیوەندییەكی توندتر و یەكگرتنێكی قایمتری نێوان ڕۆڵەكانیدا پشتیوانییەكی بەهێزتر ئەخوازێت".

سەرەڕای ئەوەی هەر لە هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز بۆ پێغەمبەری ئیسلام (محمد) درودی خوای لێ بێت بە زاراوەی قورەیش وە بوونی ئەم زاراوەیە بە زبانی یەكگرتووی عەرەب، هەموو عەرەب لە نووسیندا لە بەڕێوەبەرایەتییە دەوڵەتییەكان و دەزگاكانی ڕاگەیاندن و قوتابخانە و ئامۆژگا و زانكۆكان و.. پشتیان بەم زاراوەیە وەكو زبانێكی یەكگرتوو بەستووە.

سەرەڕای ئەمەش (ساطع الحصری) و (دوكتۆر ابراهيم انيس) و سەدان نووسەرو ئەدیب و شاعیرو هونەرمەندی عەرەب و عەرەبایەتی پەروەر بە هەموو توانایانەوە هەوڵیان داوەو هەر لە هەوڵدانان كە زبانی قورئانی پیرۆز دەست بەسەر

هەموو وڵاتانی عەرەب و زاراوەکانی عەرەب و زمانی وتووێژو و دواندا بگرێت و ورده ورده جێگای زاراوەکان لە سەرانسەری وڵاتانی عەرەبدا، سەرەڕای هەموو کۆسپ و گیروگرفتێکی ئەم ڕێگایە، بگرێتەوە. وە نەبێ ئەم دیاردەیە هەر گیروگرفت و تەقەللای ڕۆشنبیرانی عەرەب بێ، بەڵکو قۆناخێکی مێژوویيە کە هیچ نەتەوەیەك لە دەستی دەرباز نەبووە.

ئەگەر هەندێ نەتەوە بە خەباتێکی سەختی درێژخایەن و هەندێ جار خوێناویش توانیبێتیان زاراوەیەك بکەن بە بنکەی سەرەکی زبانێکی یەکگرتووی خۆیان، هەندێ نەتەوەی تر زبانە ڕەسەنە کۆنەکەی خۆیان پێ لە بیر بردونەتەوە و زبانێکی نوێیان بەسەردا سەپاندوون و ئەو زبانە نوێیە بووە بە زبانی نەتەوەکەو دوای ئەوە نەتەوەکە زاراوەیەکی ئەو زبانە نوێیەی کردووە بە زبانی نووسین و ئەدەب و شیعر و هونەر.. دوکتۆر ابراهیم انیس لەم بارەیەوە ئەڵێت[81] "کورتەی مێژووی زبانەوانی دورگەکانی بەریتانیا بەم جۆرەیە، کە لە سەدەکانی سەرەتای مەسیحییەتا، زبانی کەلتی زبانی ئەم دوورگانە بووەو بریتی بووە لە سێ لکی لەیەکتری جیاواز، یەکەمیان لە ئوسکوتلەندەو دووەمیان لە وێلز و سێیەمیان لە ئێرلەندە. وە تا ئێستا ئەمانە وەکو دووەمین زبان لەم ناوچانەدا باون.

وە لە کۆتایی سەدەی پێنجەم و سەرەتای سەدەی شەشەمی زایینیدا چەند کۆمەڵێك لە ڕەگەزی جەرمانی کە ئنگلۆ سەکسۆنیان پێ ئەوترێت ئەم دورگانەیان داگیر کرد. لە ڕۆژئاوای ئەوروپاوە هاتن، لە ڕۆژهەڵات و باکوری دورگەکانی بەریتانیادا دەوڵەتی خۆیان دامەزران. ئیتر دووبەرەکانییەکی زبانەوانی کەوتە نێوان زبانی ئەم داگیرکەرە جەرمانیە و زبانی کەلتییەوە کە ئەوسا زبانی خەڵکی بوو. زبانە داگیرکەرەکە سەرکەوت و زبانی کەلتی لەبەردەمیا پاشەکشێی کرد و پەنای بردە بەر باکوری ئوسکوتلەندەو وێلز، لەوپەڕی ڕۆژئاواو ئێرلەندە کە تا ئێستا پاشماوەی ماوە".

لە پاش ئەم کورتە باسەی دوکتۆر ابراهیم انیس ئەبێ بە شانازییەوە باسی کورد و زبانەکەی بکەین، کە سەرەڕای مێژووی درێژی تفت و تاڵی داگیرکەریی لە کوردستاناو سەرەڕای پەسەندکردنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە سەرانسەری کوردستانا لە هەندی لای بە ئاینزای شیعەشەوە، کورد و زبانەکەی وەکو زۆر گەلانی

تر و زبانەکانیان لە جیهاندا پاشەکشێیان لە ژێر باری زۆرداری یا لە ژێر باری ئارەزوودا بۆ هیچ قەومێکی تر نەکردووە، کورد و زبانەکەی سەربەرزانە لەو تاقیکردنەوە سەختە خوێناوییە درێژخایەنە نائاساییە و هاوتا لەنگییە لە کۆڕی بەربەرەکانی قەومی و زبانەوانییدا بەسەرکەوتویی گرەوی جوامێرێتی و ڕەسەنی و نەبەزایەتیان بردۆتەوە.

نەعوسمانییەکان لە ژێر پەردەی خەلافەتی ئیسلام و نە کەمالییە فاشستییەکان بە زەبری کوشت و کوشتار و کۆچ پێکردن و لەناوبردن و نە فارسەکان بە زۆر و بە ناوی یەکێتی ڕەگەز و ڕەسەنەوە و نە عەرەبیش بە داگیرکردن و بە ناوی ئاینەوە، توانیان کورد لە قەومییەتی خۆی بخەن و زبانەکەشی لە بیر ببەنەوە. بەڵکو بە پێچەوانەوە بە درێژایی ئەم شێوە مێژووە تاڵە نالەبارە، کورد، زبانەکەی کردووە بە چەپەرێکی پۆلایین و خۆی پێ لە توانەوە و فەوتان پاراستووە.

دوکتۆر (ابراهیم أنیس) جگە لەو نموونەیەی سەرەوەی بەزینی زبانی کەلتی لە دورگەکانی بەریتانیا، نموونەیەکی تر ئەهێنێتەوە و ئەڵێت [٨٢]"زبانی عەرەبی دیسانەوە لە میسریشدا بلاوبووەوە و قبطی لەناوبرد، لەوانەیە بە بەرەو پیرچوونی زبانی عەرەب لە لایەن میسریەکانەوە لە بەرەو پیرچوونی ئاینی عەرەب خێراتر بوو بێت. جێگای سەرسوڕمان نییە کە زبانی عەرەبی هەموو وڵاتی میسری گرتبێتەوە، یا هەندێ لە خەڵکەکەشی دەستیان بە مەسیحییەتیشەوە گرتبێت.

زبانەوانێکی ئەم سەردەمە کە بە دووی شوێنەوارێکی قبطی لە وتەی میسریدا ئەگەرێت بەسەرسامییەوە ئەگاتە ئەوەی شتێکی ئەوتۆی بۆ نادۆزرێتەوە".

دەربارەی زاراوە بیانییەکان باسەکە بەوە تەواو ئەکەین کە هەر دوکتۆر ابراهیم انیس لەسەری نووسیوە[٨٣] "زمانی ئیتاڵیایی زمانی ئیتاڵیا و هەندێ ناوچەیە لە باشوری سویسرا، کە کۆنترین رستەی پێمان گەیشتووە، ئەگاتە ناوەڕاستی سەدەی دەیەمی زایینی، بەڵام ئەم زمانە ئیتاڵیایەی کە ئێستا بەکار ئەهێنرێت ئەمە زاراوەی پارچەی (تسکانیا)یە کە دانتی لە سەرەتای سەدەی چواردەیەمیندا پێی نووسیوە"

لامان وایە ئەم پێشەکییانەی سەرەوە بەس بن بۆ ئەوەی هەموو ڕۆشنبیرێکی کورد، شاعیر و ئەدیب و هونەرمەند و پسپۆڕانی زمانەوانی کوردی و پیاوانی ئایینی جوامێر و سەربەرزی کورد، سیاسەتمەداران و هەموو ئەوانەی بە کاروباری

کۆمەڵایەتی کوردەوە خەریکن لە جاران پتر چاکی تێکۆشانی لێ بکەن بەلادا، لە پێناوی گەشەکردن و پەرەسەندنی زمانی کوردی و گەیاندنی بەر ئاستەی کە لەتەك رەوتی مێژوویی و پەرەسەندنی لایەنە ماددییەکان، پیشەسازی و کشتوکاڵ و زانست و تەکنۆلۆژیادا بڕوات بەرێوەو بتوانێت هاوتایەتی ئەم رەوتە بکات و کەلێنی تێنەکەوێت. بەڵکو هەمیشە وەکو ئەڵێن داشی سوار بێت بەسەر هەموو لایەنەکانی تری ژیاندا.

ئەمە لە لایەك، لەلایەکی ترەوە لە ئێستاوە تا هەموو کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستانا بە مافی چارەی خۆنووسین شاد ئەبن. بێ وچان خەریکی ئەوەبن کە زبانێکی یەکگرتوو لە زاراوەیەکی هەڵبژاردەی شایستەو بەهادارو پشتبەستوو بە زاراوەکانی‌تر لە کۆڕی فراوانکردن و گەشەکردن و کەلێن پڕکردنەوەدا بهێننە کایەوە. وەکو گەلانی عەرەب و ئیتاڵیا و ئنگلیز و هەموو گەلە خاوەن شارستانێتی‌یەکانی تری جیهان، کە زبانێکی یەکگرتووی نووسین و بەڕێوەبەرایەتی و نێو زانکۆو دەزگاکانی ڕاگەیاندنیان هەیە. وە نەبێ ئەم هاندانەمان لە ئارەزوویەکی سەرپێییەوە هەڵقوڵابێ، بەڵکو پسپۆڕانی زمانەوانی بەیەك دەنگ بانگەوازی گەل و نەتەوەکانیان کردووە کە ئاگاداری فرە زاراوەی زبانەکانیان بن، تاکو هەر زاراوەیەك نەبێت بە زبانێك، وە ئەم زبانانەش قەومێك بکەن بە چەند قەومێکەوە یا نەتەوەیەکەوە.

ئەوەتا دوکتۆر نایف خورما ئەڵێت [٨٤]"دەربارەی زبانی لاتینی پێنج زاراوەی لێ بووەوە کە لە دواییدا بوون بە زبانەکانی ئیتاڵی و فەرەنسایی و ئیسپانی و پورتوگالی و ڕۆمانی. وە لە دایکە زبانی جەرمانی حەوت زاراوە کەوتنەوە کە ئێستا بوون بە زبانەکانی هۆڵەندی و ئینگلیزی و ئەڵەمانی و دانیمارکی و نەرویجی و سویدی و ئایسلەندی.

وە لەم نموونانە زاراوە عەرەبییەکانی سەردەم کە هەندێکیان ئەگەنە ئەو ئاستەی کەسانی نەتەوەی عەرەبی لێیان تێنەگەن، کە ئەگەر زبانی قورئانی پیرۆز، کە یەکگرێکی زۆر بەهێزە، لە کایەدا نەبوایە هەریەکە لەمانە وەکو نموونەکانی پێشو ئەبون بە زبانێکی سەربەخۆ. کە ئێستا هەوڵ ئەدەین بە هۆی بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیرێتی و خوێندەواری و بەهۆی هۆیەکانی بەیەکگەیشتنی جەماوەرو ڕێگای ترەوە لە یەکترییان نزیك بخەینەوە".

# خاك يا نيشتمان

کورد لەوەدا زۆر بەختیارە کە هەر لەو کاتەوە خەڵکی سەرزەمین بەشێوەی سەرەتایی ژیاون، کورد خاکی تایبەتی خۆی هەیە کە زۆر لە مێژە بە کوردستان ناسراوە، واتا خاکی کورد یاخود جێگا نشینی کورد.

کورد لەم ڕووەوە لەتەك هەندێ نەتەوەی گەورەی ئەم سەر زەمینەدا ئەم جیاوازییەی هەیە کە نەچۆتە سەر خاکی هیچ کۆمەڵ و گەلێك و خاکی هیچ لایەکی نەکردووە بە نیشتمانی خۆی وەکو عەرەب و ئەمەریکایی کە هەردووکیان خاکی گەلانی تریان کردووە بە نیشتمانی تازەی خۆیان.

هەروەها جۆرە یەکێتییەکی تۆپۆگرافی و ئاووهەوا لە نێوان سەرانسەری خاکی کوردستانا هەیە، تەنانەت خاکی گەرمیانی کوردستانیش هەر درێژە و کشانی سروشتکاری خاکی کوێستانی کوردستانە. بە پێچەوانەی هەندێ وڵاتی هەندێ نەتەوەی ترەوە کە فرە ئاووهەوای زۆر لە یەکتری جیاواز و بیابان و دەریاچە و ڕووباری گەورە گەورەو چیای سەخت و بڵند و گەلێ هۆی سروشتکاری تر، نیشتمانەکەیانی لەیەکتری جیاکردۆتەوە و لە ئەنجامی ئەم جیابوونەوەیە، بە تایبەتی پێش ئەوەی بە ئەندازەی ئێستا هۆیەکانی هاتوچۆکردن و پێوەندی لەتەك یەکتری کردنا، بەهۆی پێشکەوتنی تەکنیکی ئەم دوولایەنەوە، وەکو ئێستا ئاسان ببێت. لە ئەنجامی ئەم جیابوونەوەیەدا ژیانی ڕۆشنبیری جوێ جوێ و تەنانەت بەرژەوەندی ئابوری جوێ جوێش هاتونەتە کایەوە کە شیرازەی پێکەوە بەستنی کۆمەڵ لاواز ئەکەن وە لە ئەنجامدا شیرازەی نەتەوایەتی پێ لاواز ئەبێ.

هەروەها زانایانی کۆمەڵایەتی ئاماژەیان بۆ ئەم لایەنە کێشاوە.

دەربارەی خاك، بیروباوەڕی جیاواز لە لایەن پسپۆڕان و خەمخۆرانی كێشەی قەوم و نەتەوەوە كەوتۆتە بەرباس و لێكۆڵینەوە و هەندێك هەر ئەوەندە بایەخیان بە خاك نەداوە. وە ئەڵێن زۆر خاكی لە یەكتری چوو هەیە و بە پاڵیەكەوە نەبوون بە هۆی پێكەوەنانی نەتەوەیەك وەكو نەتەوەی ئەڵەمان و فەڕەنسا و دراوسێكانیان.

هەروەها خاكی ئاوو هەوا جیاوازیش چەند نەتەوەیەكی دروست نەكردووە وەكو ئەمەریكاو خاكی گەلانی عەرەب، بەڵام ئەوی ڕاست بێ ئەمانە لە لێكدانەوەی دوو خاڵدا بە هەڵەچوون، یەكەمیان بە تاقی تەنیا بێ فەراهەم بوونی مەرجەكانی تر نەتەوە دروست ناكات یاخود پێك ناهێنێت. دووەم، واتای قەومییەت و نەتەوەیان لێ تێكچووە، چونكە هەندێ كۆمەڵ هەن قەومیان لێ پێكهاتووە یاخود هیچ نەبێت هەستێكی قەومایەتی ناوكۆییان هەیە، بەڵام نەتەوە نین وەكو هەموو ئەو كەمایەتییە نەتەوایەتییانەی لەسەر خاكی گەلان و نەتەوەی تر ئەژین.

كە جولەكە پێش ئەوەی بەشێك لە خاكی فەڵەستین-یان بەهۆی بڕیاری نەتەوە یەككگرتووەكانەوە لە ساڵی ١٩٤٧ دا دەست بكەوێت نموونەی ئەم باسەن. لەگەڵ ئەمانەش هەموودا هەر كۆمەڵە خەڵكێك قەوم بن یا نەتەوە یاكەمایەتی قەومی و ئاینی هەر ئەبێ لەسەر پارچە خاكێك بژین بەڵام جوغزی باسەكە ئەوەیە ئەو پارچە خاكە موڵكی باوو باپیرو مێژووكردی یاخود جۆرێكی تر؟!! خۆشبەختانە واتای قەوم و نەتەوە، بگرە نیشتمان پەروەریش هەرسێكیان لە لای كورد یەكیان گرتۆتەودو ئامێتەی یەكتری بوون.

دیارە كە قەومییەت ئەو پەیوەندییەیە كە كۆمەڵە خەڵكێك پێش كۆبوونەوەی هەموو مەرجەكانی نەتەوە، بەیەكەوە ئەبەستێت كە بەم پێوەرە هەزاران ساڵە كورد قەومە و شێرازەكانی ئەم دیاردەیە بە یەكییەوە بەستوون. هەروەها لەتەك بوونی قەومی كوردا خاكی تایبەتی خۆی هەبووە، كە گیانی نیشتمان پەروەری لە نێو كۆمەڵانی خەڵكی ئەم خاكەدا چاندووە و پەروەردە كردووەو گەشە پێ كردووە.

كورد وەكو قەومەكەی خۆی خۆشئەوێت واتا تاكە كوردێك (الفرد الكردي) یاخود هەموو كورد بە تاك و بە كۆمەڵ، هەروەها خاكەكەی خۆشی كە كوردستانی پیرۆزو ڕەنگینە خۆشئەوێت و بەسەد لكی قایمی دڵ و دەروونەوە بە یاد و بیرەوەری

کۆن و نوێوه به شیرازه پیرۆزه مێژووییەکانەوه خۆیان به خاکی پڕشانازی کوردستانەوه بەستووه.

هەموو کوردێك ئەو ڕاستییە ئەزانێت کە وشەی کوردستان بووه بە ئاواز و مۆسیقایەکی ناسك و دڵگیر لە هەست و هۆش و ناخی دەروونی هەموو قەوم و نەتەوە پەروەرێکی کورد بە تاك و بە کۆمەڵ، تەنانەت ئەم واتایە گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە دەنگدانەوەی وشەی کوردستان لە گوێی خەڵکی کوردستانا پارێزگاری نەتەوەی کوردو خاکی کوردستان و جێبەجێ کردنی مافی چارەی خۆنووسین و سەرکەوتنی ئامانجە تاکتیکی و ستراتیژییەکان ئەگەیەنێت.

شیعر و پەخشان و سرودی قوتابخانەکانی دەیان ساڵ لەمەوپێشی کۆمەڵگای کورد و کوردستان ڕەنگدانەوەی ئەم ڕاستییەن.

نیشتمانی کوردستان وە نەبێ هەر لە ڕووی دەروونی و خۆشەویستی خاکەوە لەوەپێش قەومی کورد و ئێستا نەتەوەی کوردی بزواندبێ و ڕۆڵەکانی بۆ تێکۆشان جۆشدابێ، بەڵکو خاك و ئاوو هەواو ڕووبارو زێکان و کانیاوو دەریاچەکانی و دارستان و جەنگەڵ و کێوو دەشتەکانی و کانزاو و پیتوبەرەکەتی کشتوکاڵی و هەموو بەرهەمەکانی تری ئەم خاکە جگە لە لایەنە ئابوورییە گرنگ و بەهادارەکەی، ئەمانە هەمووی داب و نەریتێکی تایبەتی بە پێی جۆری کەڵك وەرگرتن لێیان خەڵکی کوردستانیان بە شێوە هەڵسوکەوتێکەوە دەق پێوەگرتوون کە لە نەتەوەی گەلانیتری دوورو نزیکی جیاکردونەتەوە.

هەر لە جل و بەرگی ژنان و پیاوانی کوردەوە تا سەیران و ئاهەنگ گێڕان و خووڕەوشتی کۆمەڵایەتی و هەرەوەزکاری و بەدەنگی یەکترییەوە چوون و پارێزگاریکردنی بەکۆمەڵ لە نێو دانیشتوانی کوردستاندا بوون بە خێوەتێك بەسەر خاکی کوردەوە.

بە کورتی خاك لە هەموو ڕوویەکەوە پەل ئەهاوێژێت بۆ بەشە بەستراوەکانی تر بە نەتەوەوە، واتا بۆ هەموو مەرجەکانی تری پێکەوەنانی نەتەوەوە.

بۆیە خۆشەویستی و پاراستنی خاکی کوردستان و دەست خستنەوەی ئەو بەشە خاکانەی بە زۆر داگیرکراون و بوونەتە دروشمی پیرۆزی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان و هێزە نەتەوەو نیشتمانپەروەرەکانی.

# ژیانی ئابووری

ژیانێکی ئابووری ئاوکۆیی‌و بەیەکەوە بەستراو بۆ پەیدابوونی نەتەوە هەرچەندە پایەی لە ئاستی هەندێ پایەیتری پێکەوەنانی نەتەوەی کورد و هەر نەتەوەیەکی تردا وەکو زبان نییە، بەلاّم ئەم مەرجەش هەریەکێکە لە مەرجە پێویستەکان، چونکە ژیانی ئابووری هەر خۆی، گەلێك یاخود قەومێك بەهۆی بازاڕێکی یەکگرتووەوە بەیەکترییەوە ئەبەستێت. هەروەکو ئاست و پلەی ئەو ژیانە ئابوورییە خۆی ئەبێتە هاندەرو پالّپێوەنەری گیانی نەتەوایەتی بەرەوپێشەوە. چونکە ئەو کۆمەڵە خەلّکە هاونیشتمان و هاوزمان و هاومێژوو لە قۆناخی پێگەیشتنی ڕژێمی بۆرژوازیدا لە پارچە پارچەیەتی ڕزگاردەکات. وە بازاڕێکی فراوان و بێ سنوور بێکۆسپ و گیروگرفت دێنێتە کایەوە. وەکو لە لاپەڕەکانی پێشوودا باسمان کردووە، نەتەوە لەتەك تێکچوونی شێوازەی ڕژێمی دەرەبەگایەتی و ڕستنی شێوازەی ڕژێمی بۆرژوازیدا وردە وردە دادەمەزرێت.

بۆیە لە ئەورووپا و ئاسیادا کە کورد یەکێکە لە نەتەوە ڕەسەنەکانی ئەم دووقاڕەیە، نەتەوە بە پالاّوتەیی و دوای ئەوە بەکاکلّەیی لە سەدەکانی ١٩، ٢٠ دا یەك بەدواییەکدا و هەندێکیان پێکەوە سەبارەت بە لەیەکچوونی هەل و مەرجی ژیانیان دامەزراون.

لە ئەنجامی یەکێتی بازاڕو بلاّوبوونەوەی خاسییەتەکانی ڕژێمی بۆرژوازی نەك هەر ئەم لایەنە بەلّکو مەرجەکانیتری پێکەوەنانی نەتەوە سەرجەم ئەبوژێنەوەو پەرە ئەسێنن و گەشە دەکەن.

دەربارەی نەتەوەی کورد کە جوغزی باسەکەمانە، سەدان ساڵ بە قولاّیی مێژوودا بچینە خوارەوە، ئالّوگۆڕکردنی بازرگانێتی لە نێوان

هەموو بەشەکانی کوردستانا هەر هەبووە، وە بازرگانانی کوردستان هەرگیز ملیان بۆ داگیرکەران و پارچە پارچەکەرانی خاکی کوردستان و قەومی کورد شۆڕ نەکردووەو بە خۆشی و بەناخۆشی بەکاروان- کە کاروانچیو کاروان سەرایان دیاردەیەکی باوو پێویستبووە لە کورستانا- هەر ئالوگۆڕکردنی بازرگانێتی خۆیان درێژە پێداوە. با لەم ڕێگایەشدا دووچاری ناخۆشی و تەنگوچەڵەمە هاتبن.

پان و بەرینی خاکی کوردستان و دراوسێتی هەر سنورو پارچەیەکی لە تەك دەوڵەتێکی دراوسێیدا، هەروەها ساوایەتی پیشەسازی و کشتوکاڵ و ساوایەتی هۆیەکانی بەرهەمهێنانیان بوون بەهۆی ئەوەی هەرلایەکی کوردستان بە تاقی تەنیا نەتوانێت هەموو پێویستییەکانی خۆی دەستەبەربکات. بۆیە بە ناچاری هەر لایەکی کوردستان بۆ پڕکردنەوەی ئەم لایەنە پێویستە گرنگە ڕوویکردۆتە لاکانیتری کوردستان و بەم شێوەیە هەر لایە یاخود چەند لایەکی ولأتەکەمان ناتەواوی لاکانی تریان پڕکردۆتەوە.

تاکو نزیکەی نیوە سەدەیەك-یش لەمەوپێش لە شارو شارۆچکەکانی کوردستانا، کۆمەڵێك خەڵك هەبوون کە بە کاروانکارییەوە خەریك بوون، نەك هەر لە نێوان میرنشینەکانی کورستانا یا بەشە پارچە پارچە کراوەکانی کوردستانا سەرگەرمی بازرگانێتی و هاتوچۆکردن بوون، بەڵکو ڕوویانکردۆتە شارە گەورەکانی ولأتە دراوسێکانی کورستان وەکو تەورێز و تاران و هەندێ شارەکانی ئاسیای ناوەڕاست کە بەشێك بوون لە خاکی ڕووسیای قەیسەری و هەروەها ئەستەمووڵ و شارە تورك نشینەکانی دەوڵەتی عوسمانی...

بوونی شاڵی عەجەم و فەرش و سەماوەرو هەمەڕەنگە کوتاڵی نایاب و میوەی وشککراوەو گەڵێ کەل و پەلی تری ئێران و تورکیای عوسمانی و هەشتەرخان (استراخان)ی ڕووسیای قەیسەری لە شارەکانی کوردستانی خوارووی بەڵگەی بێگەردی ئەم ژیانە ئابوورییە تایبەتییەی کوردستان بووە.

ئەمە لە لایەك، لەلایەکی ترەوە، بەشبوونی کوردستان بەدوو پارچەی گەورەوە، بەدەست ئیمپراتۆرییەتی ئێران و دەوڵەتی عوسمانییەوە، وە پێوەندی بازرگانێتی دەوڵەتانی ئەورووپاو ڕووسیای قەیسەری لەتەك ئەم دوو دەوڵەتەدا، بازاڕی نەتەوەی

کورد-یشی کردبوو بە دوو بازاڕی سەرەکییەوە. ئەوسا کوردستانی باکورو باشور یەك پارچە بوون و لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا و بەشەکەی تری لەژێر فەرمانڕەوایی دەوڵەتی سەفەوی ئێراندابوو.

بەڵام سەبارەت بەوەی میرنشینە کوردەکان، هەر لە سنورێکی تەنگەبەردا بەم دوو دەوڵەتەوە لکابوون، وە ئەم دوو دەوڵەتە خۆشیان لە کۆڕی دووبەرەکی نێوان یەکتریدا هەریەکە هەندێجار یارمەتی بەشە کوردەکەی ژێر دەستی دەوڵەتەکەی تریان ئەدا، سنووری نێوان بەشەکانی کوردستان بوو بوون بە هێڵی کێشراوی سەرلمی بیابان کە بە گەردەلولێك ئەسڕایەوە.

وەکو پەندی پێشینان دەڵێت مشتێك نموونەی خەروارێکە تا ئەم ساڵانەی دوایی بەتایبەتی پێش جەنگی دوورگەی یەکەم لە شارەکانی سلەیمانی و هەولێر و دهۆك و قەزاکانیان هاتوچۆکردنی بێ بەڵگەنامەی ڕەسمی نێوان ئەم شارانەو شارۆچکە نزیکەکانی کورد لە ئێران و تورکیا بووبوو بە دیاردەیەکی ئاسایی لە نێوان هەموو پارچەکانی کوردستانا.

زۆرجار لە شارەکانی کوردستانی عێراقدا، کوردی بەشەکانی ژێر دەستی ئێران یاخود تورکیا ئەگیران و ڕەوانەی شارەکانی ئەودیو سنووری کوردستانی عێراق ئەکرانەوە، وا ڕێکئەکەوت کوردە دوورخراوەکان پێش پۆلیسە دوورخەرەوەکانیان ئەگەڕانەوە ئەو شارانەی لێی دوورخرابوونەوە.

تەنانەت گەڕۆك و ڕۆژهەڵات ناسەکان و مێژوونووسان و هاتوچۆکەرانی کوردستان، ئەو ڕاستییەیان بۆ دەرکەوتووەو لە بیرەوەری و نووسینەکانی خۆیانا تۆماریان کردووە، کە خەڵکی کوردستان هەرگیزاو هەرگیز بڕوایان بە سنووری دەسکردی ئێستای کوردستان نەکردووە، وە لە هاتوچۆکردن و بازرگانێتی نێوان هەموو پارچەکانی کوردستان نەکەوتوون. ڕاستە پارچەپارچەکردنی کوردستان و گەلێجار توندو تیژی بەکارهێنان دژی ئارەزووی لەیەکتری دانەبڕینی کورد گەلێك زیانی بەیەکێتی ژیانی ئابووری کوردستان گەیاندووەو بە لاوازی پەروەردەی کردووەو تاڕادەیەکیش سوکە ناکۆکییەکی بەرژەوەندی تایبەتی نێوان ئەم پارچانەی دروستکردووە.

بەڵام بەرامبەر ئەم دیاردە نالەبارە تاڵە هەندێ ڕاستیتر هەن کە توند ڕووبەڕووی ئەم حاڵەتە ڕاست دەبنەوە:

یەکەم ئەم پارچە پارچە کردنە زۆرکارییە دیاردەیەکی دەستکردو کاتییە، هەرکاتێك نەتەوەی کورد، لە ئەنجامی خەباتی بێوچانی خۆیدا بە مافی چارەی خۆنووسین گەیشت ئەم دیاردە دەستکردە دەبێت بە بڵقی سەر ئاو.

دووەم گیانی سیاسی و ئابووری ئەم چەرخەو ڕژێمی پەلهاوێژو خێوەت هەڵدەری سەرمایەداریێتی جیهانی بە سەر سەرانسەری سەر زەمیندا، کە پارچەکانی کوردستان-یش بەشێکن لەم سەر زەمینە، ئەم پارچە پارچەکردنەی لەمەڕ ژیانی ئابوورییەوە لاوازو بێ هێزکردووە.

واتا سەرمایەداریێتی کە بووە بە ڕژێمێکی جیهانی وەکو هەموو لایەکی ئەم سەرزەمینەی گرتۆتەوە، پارچەکانی کوردستان-یشی لەلایەکەوە بەیەکەوە بەستووەو لە لایەکی ترەوە کردوویەتی بە بەشێك لە بازاڕی یەکگرتووی جیهانی ئەمڕۆمان.

هەروەها پێش پەیدابوونی قەوارەی نەتەوە، کە دەوڵەتە، نەك هەر نەتەوەی کورد بەڵکو هەموو نەتەوەیەکی تری لە کوردچوو، هەندێ مەرجی دروستکەری نەتەوایەتی بە لاوازیو کەم هێزی ئەمێنێتەوە، تا دەوڵەتی نەتەوایەتی سەربەخۆی خۆی دائەمەزرێنێت، ئەوسا دەوڵەتەکە ئەم لایانانە چارەسەر ئەکات، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە هەموو نەتەوەیەك دامەزراندنی دەوڵەت و مافی چارەی خۆ نووسین ئەکەن بە جوغزی پیرۆزی ئامانجەکانیان. ئەوی ڕاستبێ جگە لە شارەزایانی ئەم باسەی دەستە چەپ و تاکوتەرای لەملاو لەولا هەموو پسپۆڕان و شارەزایانی مەسەلەی قەومی و نەتەوە، ئەوانیتر لایەنی ئابوورییان فەرامۆش کردووەو بایەخێکی ئەوتۆیان پێنەداوە کە بیکەن بە مەرجێکی پێکەوەنانی نەتەوە.

چونکە هەندێکیان ئەم مەرجە بۆ گەل و قەومەکانیان ساز نەبووە، وە هەندێکی تریان لەسەر ئایدیۆلۆژی ئایدیالیزم (المثالیە) ئەڕۆن بەڕێوە، کە تەنیا پشت بە لایەنی هۆش و دەروون ئەبەستن و لایەنە ماددییەکانی گەل و قەوم بە هیچ ئەزانن و ئەیانخەنە لاوە.

بەڵام ڕەوتی کۆمەڵانی خەڵك بە درێژایی مێژوو ئەوڕاستییەی خستۆتە بەرچاو کە لایەنە مادییەکانی هەر کۆمەڵێك کە ژیانی ئابووری پایەیەکی سەرەکی ئەم

لایەنەیە، ژێرخانی لایەنە ئایدیۆلۆژی و دەروونییەکانن و ئەمانەی دوایی ڕەنگدانەوەی ئەوانەی پێشەوەن.

بۆیە هەر بە پێویستمان زانی کە لێی بدوێین وە خوێنەری لێ شارەزا بکەین تاکو هەموو لایەك بایەخی پێبدەن و لایەنە چاکەکانی بەرەو پێش ببەن و لایەنە لاوازەکانی بەپێی دەسەڵات چارەسەر بکەن. وە ئەبێ لەم کۆڕەدا ئەو ڕاستییەش بخەینە بەرچاو کە چاوپۆشین لە بووەیەکی ناو کۆمەڵگای نەتەوەیەك یا کۆمەڵگای هەموو ئادەم زاد ئەوبووە (الوجود او الموجود)-یە نەئەکوژێنێتەوەو نە لە ناوناوانیشدا هەڵی ئەگرێت. بەڵکو بە پێچەوانەوە فەرامۆشکردنی ئەو بووەیە و دەست لێنەدانی ئەنجامی پێچەوانەو ژیان بەخشی لێدەکەوێتەوە. دوای ئەمە دێینەوە سەر جوغزی باسەکەمان کە سنوری دەستکردو ژیانی ئابووری یەکگرتووی کوردە.

دەربارەی ئەم باسە دوکتۆر خاڵفین دەڵێت [٨٥]"سنوور دانەنانی نێوان ئێران و ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی کە بە کوردستانا تێپەڕ ئەبێ، کاریکردە سەر کاروباری سیاسی ئەم ناوچەیە، تاکو تەنیا لە نیوەی دووەمی سەدەی پێشوودا سنوری بۆ کێشرا، ئەویش بە شێوەیەکی سەرپێیی. سەرەڕای ئەم سنووردانانە قەبیلە کۆچکەرەکان گوێیان بەم سنورانە نەدەدا، هەر بەردەوام بوون لە تێپەڕبوون بەسەریانا و تەنیا بڕواشیان بەو دەسەڵاتانە نەئەکرد کە لەو کاتانەدا مامەڵەی باشیان لەتەکدا ئەکردن.

تایلۆر قونسوڵی ئینگلیزی لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا لەم ڕووەوە نووسیوێتی:

هاووڵاتێتی دوولانەو نەبوونی سیستەمێك لەسەر سنورەکان، ناکۆکیو گیروگرفتێکی بێ سەروبنیان لە نێوان هەردوو حکومەتی ئێران و تورکیادا دروستکردووە. وە کوردەکان هەست بەوە ئەکەن کە لە هەردوو وڵاتا وەکو لە نیشتمانی خۆیانا بن وان، هەر کاتێك بەرژەوەندی خۆیان بخوازێت بەسەر سنورەکانا تێئەپەڕن – ئابووری قەبیلە کوردەکان لەوکاتەی بەندە بە باسەکەمانەوە، ئابوورییەکی سەرەتایی بوو، هەرچەندە هەندێ ناوچە هەبوو بەرهەمێکی بازرگانی ئامێزیان هەبوو بەتایبەتی فەرش و کەلوپەلی تری لە خوری دروستکراو. وە هەندێ سنعەتکاری کورد لە هەندێ پیشەسازی کانزاو گەوهەرسازیدا دەست ڕەنگین بوون.

ئنجا هەر کوردێك بڕوانێتە ئەم ڕاستییەی دوکتۆر خالفین لە باسی کوردی سەدەی نۆزدەیەمیندا دەریبڕیوە و ئەڵێت کوردەکان لە هەر لایەکی کوردستانا بووبن بە نیشتمانی خۆیانیان زانیوە و هەر بڕواشیان بەو دەسەڵاتە کردووە کە مامەڵەی باشی لەگەڵدا کردوون. خێرا ئەگاتە ئەو ئەنجامەی کە کوردستان یەك خاك و ئابوورییەکی بە یەکەوە بەستراوو هەستێکی کوردایەتی دیارو گەشەداری هەبووە.

هەروەها دوکتۆر خالفین ئەلێت [86] "ئەو سیاسەتەی حکومەتانی سوڵتان و شا بە هێزی چەك لە پێناوی جێگیرکردنی دەسەڵاتی ناوەندێتیدا گرتبوویانە بەر کە لە دەیەکانی سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمیندا چالاکانە لە پێناویدا کاریان ئەکرد، زۆر بە توندی کوردەکان لە پێناوی سەربەخۆیی خۆیاندا بەگژیا ئەچوونەوە" دوکتۆر خالفین لەسەر باسەکەی ئەڕوات و ئامازە بۆ ئەو ڕێککەوتننامانەی نێوان سوڵتانی عوسمانیو شای ئێران دژی کورد ئەکات بە تایبەتی [87]"هەردوو پەیمانی ئەرز ڕووم_ی ١٨٢٣-١٨٤٧ کە بە یەکجار داواکاری و پێداویستییەکانی قەبیلە کوردەکانی نیشتەجێ بووە سەرەکییەکانی ناوچەکانی سنوری نێوان تورکیا و ئێرانیان فەرامۆش کردبوو، کە ئەم فەرامۆشکردنە کوردەکانی هانداوە کە لەم کۆتە هەڵگەڕێنەوەو هەندێجار لە پێناوی ئازادی خۆیانا دەست بدەنە چەك".

دیسانەوە دوکتۆر خالفین درێژە بە باسەکەی ئەدات و ئەڵێت [88]"لەو کۆبوونەوە تایبەتییەی دەربارەی ئەتنوگرافیا لە کۆمەڵەی جوگرافیای ڕووسیدا گیرا (فینوکۆف) زۆر بە ڕوونی لە نیسانی ساڵی ١٨٧٧ دا باری سەرنجی خۆی دەربارەی بایەخی مەسەلەی کورد لە ڕووی پەیوەندییە دەوڵەتییەکانەوە دەربڕی و وتی _ تاکو ئنگلیزەکان فارس بە پارێزراوێکی روسی (محمیە روسیە) بزانن هەوڵی ئەوە ئەدەن دەسەڵاتی فارسی لە فورات و دیجلە دوور بخەنەوە - نیشتمانی کورد بەم شێوەیە پارچە پارچە کردن بۆ ئەو ئامانجەیە کە دەست بەسەراگرتنی دەسەڵاتی فارسی ڕەسمی لە کەنارەکانی دیجلە دوور بخەنەوە.

ئەمەیە ئامانجەکانی سیاسەتی بەریتانیا، ئەم کاروبارە دیارە بایەخێکی گەورە بە مەسەلەی کورد ئەدات و ئەیکات بە بەشێك لە مەسەلە گشتییە مەزنەکە - ئەویش کە مەسەلەی ڕۆژهەلاتییە".

بەو جۆرە لە چارەکەی سێیەمی سەدەی نۆزدەیەمیندا، مەسەلەی کورد و یەکێتی کوردستان و هاتنە کایەی ئابوورییەکی یەکگرتوو لە کوردستان بووە بە مەسەلەیەکی (مەزن). ئاخۆ ئێستا لە کۆتایی سەدەی بیستەم و تێکەڵبوونی سیاسەت و ئابووری سەرجەم کۆمەلانی خەلکی سەرزەمین، ئەبێ چۆن سەیری نەتەوەی کورد و ئەو پایانە کە ژیانی ئابووری یەکێکیانە و نەتەوەی کوردی لەسەر وەستاوە چۆن سەیری بکرێت؟

وەلامەکەی لەبەر ڕۆشنایی پێشکەوتنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردو ، بەهاو نرخی کورد و بزوتنەوەکەی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و جیهاندا و یەکێتی ئابوری کوردستان و تێکەڵبوونی بە ئابوری ولاتی ئێران و عێراق و تورکیاوەو هەمووشیان بە ئابوری جیهان بە تایبەتی ئەمەریکا و ئەوروپای ڕۆژئاواوە، سەبارەت بە ڕژێمی سەرمایەدارێتی جیهانییەوە. ئەڵێین وەلامەکەی لەبەر ڕۆشنایی ئەمانەدا هەر ئەوەیە کە ئابووری یەکگرتووی کوردستان تا دێت پتەوو بەهێز تر ئەبێت و ئامانجەکانی نەتەوەی کوردیش بە ئابوورییەکەشییەوە بەرەو جێبەجێ کردن ئەڕۆن.

# یەکێتی ڕۆشنبیری یاخود ڕۆشنبیری ناوکۆیی

یەکێتی دەروونی کە لە یەکێتی ڕۆشنبیریدا خۆی ئەنوێنێ، مەرجێکە لە مەرجە پێویستەکانی پێکەوەنانی نەتەوە، دەربارەی ئەم مەرجە نەتەوەی کورد پێش ئەوەی وەکو نەتەوە بێتە کایەوە، واتا هەر کە وەکو قەومێك پێکهاتووە، بوو بە خاوەنی ئەم مەرجە. چونکە ۳۵۰۰ ساڵ پترە ئایینی زەردەشتی بە هەموو لایەنە تاك ناسی (التوحید) و ڕۆشنبیری و ئامۆژگارییە کۆمەڵایەتی و کشتوکاڵییەکانییەوە لە ناوکۆمەڵگای کوردا بڵاوبۆتەوەو ئەم کۆمەڵگایەی لە بت پەرستی و گومڕایی پاراستووەو یەکێتییەکی دەروونی لە نێودا دروست کردووەو کە بە دوای ئایینی زەردەشتیدا، ئایینی ئیسلام وە تاڕادەیەکیش ئایینی مەسیحی کەوتونەتە ناو ئەم کۆمەڵگایەمانەوە کە ئەمانیش هەر پێشکەوتنن لە ڕەوتی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریدا لە چاو هەندێ گەلانی تردا کە سەرگەردانی ئاینی تاریك و بێ سەروشوێن بوون.

هەروەها کۆمەڵگای کوردەواری زۆر لە مێژە، وەکو لە پێشەوە باسمان کردووە لە ڕەوەکی رزگاری بووەو نیشتەجێ بووە، کە نیشتەجێ بوونی هەر کۆمەڵێك نیشانەی شارستانێتییەو شارستانێتیش لەتەك ژیانی ڕۆشنبیری هەردووکیان بەپێی قۆناخی مێژوویی خۆیان لەیەکتری جیاناکرێنەوە.

سەبارەت بەوەی نەتەوەی کورد زۆر دەمێکە خاوەنی خاك و زبان و مێژوویەکی دێرینە لەتەك ئەم سێ مەرجە گرنگە بایەخدارەدا حاڵەتێکی نەفسی یەکگرتوو کە خۆی لە یەکە یەکەی پایەکانی ڕۆشنبیریدا نواندووە و ئەنوێنێ، بووە بە هاوتای یاخود هاومەرجی ئەمانەی باسمان کردوون.

بێگومان ئەمانە هەموویان پێکەوە کار لە یەکتری ئەکەن و گەشە بەیەکتری ئەکەن و ستونەکانی یەکتری پتەوو قایمتر ئەکەن.

ئەم لایەنە هەر لە کۆتایی یاخود نزیك کۆتایی کۆمۆنیستی سەرەتاییەوە دەست پێ ئەکات و تادێت وەکو هەموو بووەیەکی ماددی و دەروونی ئەم سەر زەمینە وردە وردە پەروەردە ئەبێت و نەشونما ئەکات و گەشە ئەکات تا ئەگاتە ئەو ئاستەی وەك پەیکەرێکی تەواو بە قەوارەو گیاندارێکی کامڵ بە کردەوە دێتە کۆڕی خۆنواندن و بەفرمانی کاکڵە بوو بە پێویستییەکانی خۆی هەڵئەستێ.

هەر لە ئەفسانە هەرە کۆنە هەزاران ساڵ تەمەن تا رۆمانە سەرەتاییەکان و چیرۆکە میللی‌یەکان و پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و شیعرو گۆرانی و فۆلکلۆر و جل و بەرگ و هەموو پۆشاکی ژن و پیاوی کوردی و کەلوپەلی بەرهەمهێنانی پیشەسازی و کشتوکاڵی دێرینی کۆمەڵگای کورد و هەموو بەشەکانی هونەرە جوانەکانی کۆمەڵەکەمان بە وێنەکێشان و پەیکەرکاری و گۆرانی و مۆسیقاو کەلەپورو هەموو بابەتێکی ئەم گۆڕەپانە، ئەچنە خانەی حاڵەتێکی یەکگرتووی دەروونییەوە و کوردیان لە نەتەوەکانی دراوسێ و گەلانی دوور جیاکردۆتەوە.

ڕاستە ئەم حاڵەتە لە ژوورێکی پۆلاییندا کوتوپڕ دانەمەزراوە، بەڵکو کاری دەیان و سەدان ساڵە و زیاتریش، لە ئەنجامی هاتوچۆکردنی بازرگانی و شەڕوشۆڕ و داگیر کردن و داگیرکراوی و تێپەڕبوونی لەشکری بیانی بە خاکی کوردستانا تاڕادەیەك تێکەڵ بە هەندێ لایەنی ڕۆشنبیری قەوم و گەلانی تر بووە. هەر وەکو هی ئەوانیش تێکەڵ بەم لایەنەی قەومی کورد بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هێڵە سەرەکییەکان و کەرەسە بنچینەییەکاندا هەر زۆربەی زۆری هەڵقوڵاوی کۆمەڵگای کوردستانن. وە لایەنە ڕەسەنەکانی تەنیا بەهی بیانی سامانتر بوون و بەس!.

وە ئەم بەسەرهاتەش، نە هەریەخەی قەومی کورد ئەگرێتەوەو نە ئەم مەرجەش لەکەدار ئەکات. بەڵکو ئەوە نیشانەی دڵ و دەروون فراوانی و خۆ لە گۆشەگیری و پەناگرتن دوور خستنەوەیە، کە بۆتە مایەی پێشکەوتنی ژیانی ڕۆشنبیرێتی کورد و شانازی خۆ بە بەشێك لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە قەڵەمدان.

بەبێ خۆ هەڵکێشان، کە خۆ هەڵکێشان و شانازی پێوە کردنێکی بێهاوتاش هەڵنەگرێت، کورد لەلای نەتەوە دراوسێکانی وەکو عەرەب و فارس و تورك و لەلای هەموو مێژووناسانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ڕۆژهەلات ناسانی ئەوروپایی بە مرۆڤی ئازاو چالاك و ڕاستگۆو جوامێرو داوێن پاك و دەست پاك و دۆست پەروەر ناسراوە.

هەر لە ناوسوپاکانی ئەم نەتەوانەدا سەرکردەکانیان بۆ پاراستنی خۆیان و تێکەڵ کردن بە خێزانەکانیان متمانەیان بەسەربازی کورد لەهی تر پتر کردووە. وە ئەفسەرە کوردەکان لەم ڕوانگەیەوە ڕێگاو شوێنی زۆر گرنگ و ناسکیان پێسپێرراوە. واباوە لە ناو گەلە دراوسێکانی کوردا، کە کورد بەڵێنی دۆستایەتی بدا، بەڵێنی خۆی ناشکێنێ و کە وتی ـشی (نا) ئیتر دووبارە نابێتەوە. ئەوی ڕاست بێ ئەم خاسییەتانەی بە گشتی نەتەوەی کورد ئەگرێتەوە، لەوەوە پەیدابوون کە بنکە ماددییەکانی ناو کوردستان، تۆپۆگرافی و جوگرافی و سروشتکارو پیشەسازی و کشتوکاڵ و ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و هێزە بەرهەمهێنەرەکان و پێوەندییەکانی بەرهەمهێنان واتا پێوەندییەکانی نێو چینەکانی کوردستان، هەریەکەیان لە قۆناخەکانی خۆیاندا ئەگەر لەیەکتری نەچن زۆر لە یەکترییەوە نزیکن. بەپێچەوانەی زۆر نەتەوەی ترەوە، کە کۆمەڵگاکانیان تەنانەت لە قۆناخی پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا زۆر لە یەکترییەوە جیاوازن لەلایەك گەیشتۆتە قۆناخی سەرمایەداریتی و لەلایەك لە دەرەبەگییەوە نزیکەو لە لایەکی ترەوە هێشتا بە لەوەڕکارییەوە خەریکە و لە ژیانی خێڵەکێتیدایە.

هەروەها وڵاتی فرە ئاوو هەواو، لایەك کوێستان و لایەك بیابان. ژیانی ماددی و لە ئەنجامدا ژیانی دەروونی و ڕەوانی جۆراوجۆر دێنێتە کایەوە، کە خاکی کوردستان و کۆمەڵگای کوردستان هەردووکیان بە گشتی جۆرە لەیەك چوونێکیان بە خۆیانەوە گرتووە. بۆیە ئێستا و لەمەولاش، وە لە ڕۆژانی گەیشتنیشدا بە مافی چارەی خۆنووسین، ئەرکی دەزگاکانی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی کورد لە هی ئەو قەوم و نەتەوانە ئاسانتر ئەبێت.

وە بە هەوڵ و تەقەللایەکی کەمتر لە چاو ئەو گەل و قەومانەدا، نەتەوەی کورد ئەتوانێت ئەم لایەنە بە پەلە پێش بخات و گەشەی پێ بکات و کەلێن و ناتەواوییەکانی پڕ بکاتەوە. پێویستە لێرەدا سەرنجی خوێنەری کورد بۆ ئەو ڕاستییە ڕابکێشین کە ژیانی ڕۆشنبیری هەر نەتەوەیەك هەندێ خاسییەتی تایبەتی بەخۆیەوە گرتووە کە لەو ئاست و ئەندازەیەدا لە نەتەوەیەکی تردا بەدی ناکرێت.

نەتەوەیەك هونەرمەندەو نەتەوەیەك ئازاو شەڕەنگێزە و یەکێکی تر لە پیشەسازیدا دەست ڕۆیشتوو یاخود لە کشتوکاڵ و لە گەشتوگەڕو دەریاوانی و

لایەنە ماددییەکانی تری ژیاندا کە ئەمانە ڕەنگ ئەدەنەوە سەر خاسییەتە دەروونی و ڕەوانییەکانی ئەو نەتەوانە. هەروەها دوور بینی و دڵ فراوانی و ڕێزگرتن لە خەڵکی و ئارەزووی فێربوون لە گەلان و نەتەوەی ترەوە، دیسانەوە ئەچنە خانەی ڕۆشنبیری نەتەوەوە.

جێگای شانازی وخۆهەڵکێشانە کە کورد لە بەشی کوردستانی خوارووەوە بەپێی ئەم تاقیکردنەوانەی ئەم دواییە لە کۆڕی دڵ فراوانی و ملکەچ کردن بۆ سەرەتا سەرەکییەکانی سیستەمی دیموکراتیدا سەری خۆیان و سەرجەم نەتەوەی کوردیان لەسەرانسەری کوردستانا بەرزکردەوە، هەروەکو دۆستانی نەتەوەی کوردی دڵخۆش و دوژمنانی دڵتەنگ کردو شوێنەوارێکی بەهادارو بایەخداری لە نێو نەتەوەو گەلە خاوەن شارستانییەکانا بۆ خۆی داگیرکردووە، کە ئەمەش نیشانەی ئەو پایە بەرزە ژیانە ڕۆشنبیرییەیە کە بەدرێژایی مێژووی پڕ سەربەرزی دەقیگرتووە.

پێش ئەوەی دەربارەی لایەنە جۆربەجۆرەکانی نەتەوەی کورد بچینە سەر وتە و لێدووانی هەندێ لێکۆڵەرەوانی بیانی ئەم سەرنجە بەنرخەی مامۆستا دوکتۆر کەمال مەزهەر کە لە دوای خوێندنەوەی دەستنووسی ئەم باسەدا تۆماری کردبوو ئەخەینە بەرچاو: "بایەخی ئەم خاڵە بۆ باسەکەمان زۆر گرنگە، هەڵبەت زەردەشتایەتی لە ماوەی سەدان ساڵدا تۆوی جۆرە هاوهەستییەکی لەناخی دەروونی کوردەواریدا چاندووەو ئیسلامەتیش هێندەی تر گۆشی کردووە.

ئەو تێکەڵ بوونە بۆتە دیاردەیەکی دەروونی و ڕۆحی تایبەتی کە کوردی لە زۆربەی گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست جیاکردۆتەوەو یاریدەی پاراستنیداوە.

بێگومان ڕەگ و ڕیشەی لایەنە دەروونییە تایبەتییەکانی نەوەی کوردی ئیمڕۆ کە کەم و زۆر دەگەڕێتەوە ئەو ڕۆژگارە زووە کە هێشتا چرۆی گەلێك نەتەوەی ناسراوی ئێستەی ناوچەکەی تێیدا دروست نەبوو بوو.

با هەر لێرەشدا ئەو سەرنجە گرنگە تۆمار بکەم کە لە خۆڕایی نییە لە موسوڵمانەتیدا کورد لە ڕیزی هەرە پێشەوەی گەلانی جیهانی ئیسلامن.

زۆر دیاردەی موسوڵمانەتی ئەوان تایبەتن بە خۆیان، ئەوان بەر لە هاتنی ئیسلام خواناس بوون، پێغەمبەری خۆیان هەبووە، ئەم ڕاستییەش بێگومان پشتاو پشت لە دەروونیدا جێگیر بووە و جۆرە پێناسینێکی تایبەتی لە ناو کوردا دروست

کردووه. تەنانەت مزگەوت و منارەکانی کوردستانیش تا ڕادەیەك شێوازی تایبەتی خۆیانیان هەیە و دیسان هیچ لە خۆڕایی نییە زۆربەی پیاوە ئاینییە ناسراوەکانی کورد هەمان کات شاعیر و نووسەری هەستیار بوون و بەشێکیشیان بە ئاشکراو بێ پێچ و پەنا کورد پەروەرو نەتەوە پەرست بوون هی وایان تێدا بووە بونەتە سەرکردەی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد وەك شێخ عوبەیدوڵڵای شەمزینان و شێخ مەحمودی گەورەی بەردە قارەمان و قازی محەمەدی پێشەوامان.

هەروەها لە بارەی ڕۆشنبیرییەوە دوکتۆر (ابراهیم انیس) ئەڵێت [89]"ئایا ئێستا ڕۆشنبیری بە دیراسەتێکی وردی هونەر و ئەدەب و یاسای گەلێك لە گەلان بپێوین؟

ڕاستییەکەی تا ڕادەیەکی زۆر ڕەگی خۆی لەمانەی پێشەوە باسمان لێ کردوون ئەبینرێت، لەگەڵ ئەمەشدا بەڕوونی ڕەنگدانەوەی ئاستی خۆ بەرەڵڵا کردن و ئاسۆ فراوانی و لێبوردنی نێو خەڵك لە ژیانی گشتی خۆیاندا، هەروەها نیشانەی ئەوەیە کە تا چ ڕادەیەك ئارەزووی ئەوە ئەکەن کە ڕێگا بەلایەنی تر بدەن ئازادانە بیروڕای خۆیان دەربڕن.

ئەگەر تەماشای زەمینەیەك بکەین ببینین لە ئاسۆیەکی فراواندا خەڵکەکەی ئەژین، بەڕوونی بۆمان دەرئەکەوێت کە ئاستی ڕۆشنبیری لەم کۆمەڵگایەدا ئاستێکی بەرز و پلەیەکی شکۆدارە".

بە بەراوردکردنێکی ئەم بیروڕایەی دوکتۆر ابراهیم انیس و هەڵسوکەوت و کاروکردەوەی ئێستای کوردستانی خواروو هەر ئەبێ بگەینە ئەو بیروڕایەی کە بڵێین کورد خاوەنی ژیانێکی ڕۆشنبیری پایە بەرزەو ئەم ژیانەش ڕەنگدانەوەی مێژووی شارستانێتی مرۆڤ پەروەرانەی کوردە کە هەرگیز ئارەزووی ئازاردانی گەلان و خوێن ڕشتن بە ناهەق و داگیرکاری نەکردووە، بەڵکو هەر ڕێگای خەباتی شۆڕشگێڕانە و ئاشتی خوازانەی لە پێناوی پاراستنی خۆی و خاکەکەی و دەسخستنی مافی ڕەوای خۆیدا گرتۆتە بەر.

دەربارەی ڕەوشت و نەریتی کورد کە بەشێکی حاڵەتی دەروونی هەندێ بیروڕای گەڕۆك و ڕۆژهەڵاتە بیانییەکان بە نموونە ئەهێنینەوە.

لەم بارەیەوە هاملتون لە کاتی بە مۆڵەت ڕۆیشتنەوەی سەرگوردی ئەندازیار (الرائد المهندس) (پیری) و لە جێدانانی ئەم تا گەڕانەوەی پیری کە دوای جەنگی

یەکەمی جیهانی لـە ناوچـەی ڕەوانـدزدا سـەرگەرمی دروسـتکردنی ڕێگایـەکی تـازە بوون، ئەڵێت ئەم ئامۆژگارییانەی کردم : [٩٠] " هەرگیز بیرت نەچێ کە بەڵێن و قسـەی خۆت نەگۆڕیت، بەڵێنێك نەدەیت جێبەجێی نەکەیت، پیاوێکی دادپەروەر بە لە نێوان فەرمانبەران و کرێکارەکانتا، وە ئەو کوردانەی لەناویانا کار ئەکەین ئەبێ ئەمە بزانن. دەستم دامێنت بێ پەنا نەبەیتە بەر فرۆفێڵ لەگـەڵیانا، ئەوسا ئـەزانیت کە بڕوات پـێ ئەکەن و ناتخەڵەتێنن.

ئـەو فەرمانبـەرە ئیدارییانـە کـە ئـەبێ لەکەسـانی تـر ئـەم ڕاسـتییە باشـتر بزانـن هەندێجار ئەوە فـەرامۆش ئەکـەن. گـەلی کـورد لەتـەك گـەلانی تـردا جیاوازییـەکی نییـە، ئەگەر مرۆڤ دڵسۆز بێ بۆیان پەیمانیان لەگەڵدا بەرێتە سەر کارێکی گران نییە خۆی بکات بە جێگای بڕوایان ".

هـاملتون لـــە جێگایـــەکی تـــردا ئـــەڵێت [٩١] "بـــەڵام کوردێـــك ســـەبارەت بـەوەی شـاخ نشـینە - کـەمێك جیـاوازی هەیـە، زۆرتـر گۆشـە گـیرە، لـەم لایەنـەوە لـە نـەریتی سـکوتلەندییەوە نزیکـترە، وە لـە عـەرەب کـەمتر ئـارەزووی رابـواردن و خۆشـی ژیـــان ئـــەکات، بـــەڵام حـــەز لـــە گاڵتـــە و گـــەپ ئـــەکات، هەرمەیەکـــە لـــە سـۆفیایەتی و فەیلەسـوفێتی و قەدرییـەت (القدریـة). ئەگـەر توانیـت دۆسـتایەتی لەگـەڵدا بگریـت دڵسـۆزیت نیشـان ئـەدات تـا ئـەو ڕادەیـەی بـاوی هـەبێت بەسـەر دڵسـۆزی عـەرەبێکدا گـەوج نییـە و بەئاسـانی شـتی پـێ ناسـەلمێنرێت، بـەڵکو بــە دوو چــاوی تیــژی زرنگانـــەوە بـــەدووی ئـــەحواڵی جیـــهاندا ئەگـــەڕێت و سـەرنج ئەداتـە ئـەو گۆڕانانـــەی لـە کـۆڕی زانسـت و پیشەسـازیدا پـەیدا ئـەبن، بـــێ ئـــەوەی دواکەوتـــەیی و پێـــش نەکەوتـــەیی وڵاتەکـــەی ببنـــە کۆســـپی ئەم سەرنجدانە."

هاملتون کە فەرمانبـەرێکی ئنگلیزی بووە و لـەو کاتـەی عـێراق دوای جـەنگی یەکەمی جیهانی لە ژێر چاوەدێری بەریتانیادا بووە بە فرمانی دەوڵـەتی ئـەو کاتـەی عێراق نێردراوە بۆ ناوچەی ڕەواندز بۆ ڕێگا دروستکردن و کوژاندنـەوەی شۆڕشـی کورد، کەچی وەکو خۆی نووسیوێتی ئەڵێت [٩٢] "لە پێناوی جێگیر کردنـی دەسـەڵاتی حکومـەت و ژێر دەستە کردنی قەبیلە کوردییـەکانا پێویستییەکی فەرامۆشـنەکەری ئەیخوازی کە ڕێگا بە بێ دواکـەوتن دروسـت بکـەین. بۆیـە منیـان هـەڵبژارد کـە لـە

دروستکردنی ئەو ڕێگایەدا بەشدار ببم کە لە شاخەکانی سنوری باکوری ڕۆژهەڵاتدا بوو، ناویان نا (ڕێگای ڕەواندن).

لەناوجەرگەی عێراقەوە دەستی پێئەکرد و لە بەرزاییەکانی باکوری ئێران و دەریای قەزویندا کە بەناوی وڵاتێکی شاخاوی سەختدا تێپەڕ ئەبوو، ئەم ڕێگایە کۆتایی ئەهات. هاتوچۆ لەو ناوەدا نەئەکرا، بەوە ناوبانگی دەرکردبوو کە پەنای شۆڕشگێڕان و لە یاسا دەرچووانە، ئەوانەی هەمیشە سەرچاوەی ناڕەحەتی دەسەڵاتداران بوون".

ئەم پیاوەی کە نوێنەری ئیستعماری بەریتانیای دوژمن بە بزوتنەوەی نەتەوایەتی و شۆڕشەکانی کوردی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی بووە، کە تێکەڵی خەڵکی کوردستان بووە، داب و نەریت و خاسییەتە نەتەوایەتییەکانی نەتەوەی کورد، ناچاری کردووە کە لەو دێڕانەی لەسەرەوەدا تۆمارمان کردوون و لە جێگایانی تری کتێبەکەیدا باسی جوانی کوردستان و جوامێری نەتەوەی کورد بکات، لەگەڵ ئەوەی هەژاری و کوێرەوەری و سەرگەردانی دوای قاتوقڕی جەنگی یەکەمی جیهانی باڵی ڕەشی بەسەر نەتەوەی کوردا کێشا بوو، کە ئەم دیاردە نالەبارانە تا ڕادەیەکی زۆر خاسییەتە بەرزەکانی هەر نەتەوەیەك ئەشڵەقێنن. ئەمە جگە لەوەی بەدەست جەندرمەو لەشکری دڕندەی دەوڵەتی عوسمانی و دوای ئەوان لەشکری پێکەوە کارکردەی عێراق و ئنگلیز ناڵاندویەتی.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەو ڕاستییەمان بۆ ڕوون ئەبێتەوە.. کە حاڵەتی دەروونی مێژوو کردەی نەتەوەی کورد ئەوەندە ڕەسەن و ڕەگوڕیشە داکوتاوە کە ئەو زروفە سەختە نالەبارانەش نەیانتوانیوە لە جێگای خۆیاندا بیترازێنن، و هەر لەبەر ئەم هۆیە ڕەسەنەو هۆیە ڕەسەنەکانی تری پێکەوەنانی قەوم و دوای ئەو نەتەوەی کورد کە چەرخی زەمانەو دڕندەیەتی بێ هاوتای دوژمنانی کوردستان نەیانتوانیوە وەکو هەندێ قەومی تر بیتوێننەوەو لەناوییبەرن.

هەر لەم بارەیەوە پێش ئەوەی کۆتایی بە باسەکەمان بهێنین، ئەم لێکدانەوە بەهادارەی مامۆستا (محمد امین زکی بەگ) ئەخەینە بەرچاو [٩٣] "پوختەی قسە ئەوەیە هەر کەسێك لە زانایان و گەردش کەرانی زیرەك، ماوەیەك کوردی بینیبێ و لەگەڵیانا

ژیا بێ ڕێزێکی گەورە لە صفات و ڕەوشت و هەڵسوکەوتیانی ناوەو لە نێو ئەمانەدا – دائرة المعارف الانجليزية الكبرى– بەم دەقەی خوارەوە باس دەکات:

"کاروباری ناو ماڵ و ئەحواڵی خێزانێتی لە نێو گەلی کوردا لە پێشکەوتن و بەرزێتیدا بە پایەیەکی گەورە گەیشتووە. کورد ڕووخۆش و دڵساف و زۆر بەغیرەتە. ڕێزی میوان ئەگرێت. ژنی کورد لە ژنی فارس و تورك پتر خاوەنی ئازادییەکی داوێن پاکانەیەو عەباو پەچەش ناگرێتەوە.

بەگشتی کورد هەندێ دەوڵەمەندیان نەبێت، حەز بە لەیەکێك پتر ژن هێنان ناکەن، حەز لە مۆسیقاو هەڵپەڕکێ زۆر ئەکەن."

لەم چەند نموونە باسەی زانایان و گەردشکارانی بیانی، دەربارەی خوو ڕەوشت و خاسییەتەکانی کورد، بۆمان دەرئەکەوێت کە لەم لایەنەشەوە نەتەوەی کورد خاوەنی ئەم مەرجەیە تەنانەت لەتەك نەتەوە دراوسێکانیشیدا جیاوازی ئەوتۆی هەیە کە بەڕوونی بەرچاوی ئەو لێکۆڵەرەوانە کەوتووە. وە ئەمە سەرنجی هەموو کەسێك بۆ دوو خاڵی گرنگی سەرەکی ڕائەکێشێ:–

یەکەمیان: کورد بە هەموو مەرجە کاکڵە بووە فراوانەکانیەوە، تەنانەت لە قەوم و گەلە ئارییە نزیکەکانی خۆشی جیابۆتەوەو کەوتۆتە چوارچێوەیەکی تایبەتی خۆیەوە کە هیچ هێزێك نییە ئەم چوارچێوەیە هەڵبوەشێنێتەوە، یاخود شیرازەکانی بپسێنێ، یا بناخەکانی هەڵبتەکێنێ.

دووەمیان: نەتەوەی کورد کە هێشتا بە مافی چارەی خۆی نەگەیشتووە، وە لەم هەلومەرجەدا، بەپێی هەموو پێوەرو تەرازوویەکی پێکەوەنانی نەتەوەوە، نەتەوەیەکی جیاواز و ڕەوت و ڕێبازێکی تایبەتی بۆ هاتۆتە کایەوەو لەم جیهانە نوێیەی خاسییەتی بەیەکەوە لکان و تیژڕەوێتی و هەرەوەز کاری لە کۆڕی پاراستنی مافی مرۆڤ دژی دەوڵەتە پێشێلکەرەکانی ئەم مافەی بەخۆیەوە گرتووە.

ئا لەم هەلومەرجە لە بارانەدا هەر ئەبێ بەم زووانە کورد بە مافی تەواوی نەتەوایەتی خۆی شادبێت و بچێتە ڕیزی نەتەوە ئازاد و خاوەن شارستانێتی ئەم چەرخە ڕووناکەوەو هەموو خەباتکەرانی ئەم ڕێگایەش ڕوو سوری بەرجەماوەری خەڵك و خاکی کوردستان بن.

# دانتی - ١٢٦٥ - ١٣٢١ - ی زایینی*[1]

چالاکی دانتی له ئیتاڵیادا کەوتۆتە نێوان نیوەی دووەمی سەدەی سیازدەیەم و سەرەتای سەدەی چواردەیەمەوە. کە ئیتاڵیا ئەو کاتە بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابووری دژی پارچە پارچە بوون و دەسەڵاتی دەرەبەگ و زۆرداریێتی کەنیسەی تێدا بەدی ئەکرا.

له دەوروبەری ژیانی دانتی دا، ئیتاڵیا سێ پارچەی سەرەکی بووە، ناوچەی دەوڵەتۆکەکانی شار له (لومبارديا) و (توسكانيا) له باكور، وە دەوڵەتی پاپایەتی لە هەموو ڕوویەکەوە دواکەوتوو لە ناوەڕاستدا وە مەملەکەتی هەردوو (صقلیە) کە لە لایەن دەرەبەگە فەرەنساییەکانەوە ئەبران بەڕێوە لە باشور.

دانتی لە ئایاری ساڵی ١٢٦٥ هاتۆتە دنیاوە، خوێندنی لە کەنیسەوە دەست پێکردووە و لە دوو زانکۆ بە ناوبانگەکانی (پادوا) و (پۆلۆنیا) خوێندویەتی. یاساو ئاینی خوێندووەو خویداوەتە مێژوو و سیاسەت و فەلسەفە و حەزی لە کیمیا و فەلەك و نوشداری کردووە و لە هونەرە جوانەکانیشەوە وەکو مۆسیقا و وێنەگرتن و پەیکەر تاشی نزیك بووەو زمانی لاتینی و فەرەنسایی باش زانیوە.

لە کۆڕی سیاسەتیشدا ئەندامی بەشی ڕادیکالی گولفی *Guelfi* سپی بووە، لە فلۆرەنسا دژی پاپاو ئیمپراتۆر و پێڕەوکەرەکەیان بووە. کە لە کاتێکدا بە ئەرکی دیبلۆماسی لە دەرەوە بوو، سەبارەت بەم هەڵوێستەی بەرامبەر پاپاو ئیمپراتۆر فەرمانی مەرگیان لە پاشمله بۆ دەرکردووە.

بۆیە ماوەیەکی زۆر دەربەدەری فلۆرەنسا بووە، وە بەدەرکراوی لە ١٤ی ئەیلولی ساڵی ١٣٢١ لە شاری (راڤنا) سەری نایەوە، بەڵام لە یادی ٦٠٠ ساڵەی هاتنە دنیایەوە بە ئاهەنگێکی گەورە تەرمەکەیان بردەوەو لە گۆڕەکەیان نووسی (ئارەزوو، ئەوەکا فلۆرەنسا، دەربەدەریکرد).

دانتی یەکێك لە هەرە ڕۆشنبیرەکانی چاخی خۆی بوو. هەندێ نووسەر سورن لەسەر ئەوەی دیراسەت کردنی دانتی و وەرگێڕانی (کۆمیدیای ئیلاهی) بۆ پسپۆڕە ئەورووپاییەکان کە زەمینەیەکی زانستیانەی لەباریان لەبەردەمدایە، لە ١٥ تا ٢٥ساڵ ئەخایەنێت.

وەکو ڕۆشنبیرێکی پایە بەرز و هەست کردویەکی وردبین لای وابوو کە زبانی قەومی ئەتوانێت، بخرێتە کار لە پێناوی گۆڕپاندا بۆیە زۆر بە توندی دژی فرە زاراوە بوو لە زبانی ئیتاڵیاییدا. وە بە پەرۆشەوە هەوڵی ئەدا زبانی ئیتاڵیایی یەکگرتوو جێگای زبانی لاتینی بگرێتەوە.

ئەم بانگەوازە بەنرخەی دانتی لە نێو ڕۆشنبیرانی گەلەکەیدا، دەنگی دایەوەو نووسینەکانی دانتی یان بەشیرین شێواز ناو ئەبرد.

دانتی – ش ئەم زبانە نوێیە ئیتاڵیایەی بە نانی جۆ ناو ئەهانی، چونکە نانی جۆ، نانی زۆربەی زۆری ئەو کاتەی خەڵکەکە بوو. زبانی لاتینی وەکو نانی ئاردی سپی دەست هەموو کەسێك نەئەکەوت. وەهەر ئەم بزوتنەوە زبانەوانییەی دانتی ڕابەرایەتی ئەکرد، زبانی وێژەو ئەدەبی لە چنگ مشتێکەوە خستە ناو هەموانەوەو کردی بە ئامرازی نووسین و خەڵکی بزواندن و پێشخستن. دانتی شاکارە نووسینەکەی (کۆمیدیای ئیلاهی) بە زاراوەکانی ئیتاڵیایی پشتبەستوو بە زاراوەی (تۆسکانی) نووسی. کە ئێستا بووە بە بنکەیەکی ڕێز لێگیراوی زبانی ئەدەبی ئیتاڵیایی. وە نەبێ ئەم شاکارەش هەر لە ڕووی زبانەوە بایەخ و نرخی دەنگی دابێتەوە، بەڵکو چیرۆکێکە کە ناوەڕۆکێکی نەتەوایەتی گەلی ئیتاڵیا تێدا ڕەنگ ئەداتەوە. چونکە خاوەنی ئەم چیرۆکە خەونی بە یەکێتی ئیتاڵیا و لەناوبردنی شەڕو شۆڕی ناوخۆو لەناوبردنی دەسەڵاتی دنیایی و پاپاوە ئەبینی.

لەبەر ئەم هۆیە بایەخدارانەیە کە ئەم شاکارە سەدان جار بە ئیتاڵیایی و زبانەکانی تری ئەورووپا چاپ کراوەتەوە. هەروەکو لە زانکۆکانی ئەورووپادا بە تایبەتی خراوەتە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

ئەمە جگە لەوەی هونەرمەندانی هەمەجۆرە بەهەوای ئەم شاکارە بەنرخەی دانتی، تەلی ئاوازی مۆسیقا و خامەی وێنەکێشان و ئامرازی پەیکەر تاشی خۆیان خستۆتە کارەوە.

## ساطع الحصری

ساطع الحصری نەتەوە پەرستێکی عەرەبی توند ڕەوی بەناوبانگە ساڵی ١٨٧٩ی زایینی لە شاری سەنعای یەمەن هاتۆتە دنیاوە. هەندێك ئەڵێن بەڕەسەن حیجازییەو هەندێکیش ئەڵێن سوریاییەو لە ڕەچەڵەکا لە ناوچەی قەوقاسەوە هاتۆتە سوریا. لە دەزگای بەڕێوەبەرایەتی عوسمانی لە بەڵقاندا فەرمانبەر بووەو لەوانەیە کێشەو بەرەی ئاڵۆزی نەتەوایەتی باڵقان هەستی نەتەوایەتی تێدا بزواندبێت.

دوای جەنگی جیهانی یەکەم لە سوریە لەتەك شا فەیسەڵی یەکەمدا کاری کردووەو بووە بە وەزیری پەروەردە. دوای دەرچوونی شا فەیسەڵ لە سوریەو بوونی بە شای عێراق لە کاروباری پەروەردەو ڕۆشنبیری لە عێراقدا کاری پێدراوە.

لە ساڵی ١٩٤١ دا سەبارەت بەوەی لەتەك ئەفسەرە نەتەوە پەروەرە عەرەبەکانی عێراق دژی بەریتانیا بووە، پێناسنامە (الجنسیە)ی عێراقێتی لێسەندراوەتەوە، بەلام لە ئەنجامدا گەڕاوەتەوە عێراق و لە ساڵی ١٩٦٨دا کۆچی دوایی کردووە.

ساطع الحصری تا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی خاوەنی بیروباوەڕی عوسمانێتی بووە، بڕوای بە پێشکەوتنی سەڵتەنەتی عوسمانی کردووە، بە هەموو ئاین و زبان و گەلەکانییەوە.

هەردوای لەناوچوونی ئەم سەڵتەنەتە خولیای عەرەبایەتی توندی کەوتۆتە سەر، لە ئەنجامدا بووە بە یەکێك لە رابەرە بەناوبانگەکانی قەومایەتی عەرەبی و یەکێتی عەرەبی کردووە بە ئامانج و عەرەبایەتی کردووە بە دروشمی خۆی.

لە کۆڕی ئەم بیرو باوەڕەدا زۆر ئەچێتەوە سەر ئەڵەمانییە نەتەوە پەروەرەکان، لە بڵاوکراوەکانیدا زبان و مێژو و یەکێتی دەروونی بە مەرجی پەیدا بوونی یەکێتی عەرەبی ئەزانێت.

بێگومـان راپـەڕینی نەتەوایـەتی و بزوتنـی هۆشـی نەتـەوەیی نێوگـەلانی سـەڵتەنەتی عوسمانی وەکو تورك و کورد و عـەرەب و ئەرمـەنی و بیروباوەڕی پێـش چل ساڵە تەمـەنی ساطع الحصری هەڵتـەکاندووەو خستویەتییە سەر بیروبـاوەڕێکی نوێـی جیاواز و دووی عەرەبایـەتی کـەوتووە. وە نـەبێ ئـەم بیروبـاوەڕەش ڕەوتێکـی ئاسایی لـەلا هـەبوو بێت بەڵکو زۆر توند و تیژانە یەخەی گرتووە تـا ئـەو ڕادەیـەی بەرچاوی بەرامبەر نەتەوە دراوسێکانی عەرەب بە تاریك کردووە.

لای وابووە هەر کەسێك ڕۆڵەی هەر نەتـەوەو ئاینێك بێت، بـە عـەرەبی بدوێت و هەستـی عەرەبایـەتی هـەبێت بـە عـەرەب لەقەڵـەم ئـەدرێت! بۆیـە سـاطع الحصـری پـەروەردەی دەسـتی عوسمـانی نزیکـەی نیـو سـەدە خـۆی بـە هـەوڵ و تەقـەللای عەرەبایەتی رووتەو قووتەوە خەریك کرد.

لە کتێبی (حول القومیة العربیة)دا ئەڵێت "سەرەتای عەرەبایەتی (مبدء العروبة) بـە دەربڕینێکـی وردتـر (سـەرەتای عەرەبایـەتی پێـش هـەموو شـتێکی تـر) وە ئاشـکراترین نموونـەی ئەمـە ئەوەیـە. بـڕوا بـوون بـەم سـەرەتایە ئـەم فرمانـەمان ئەخاتە ئەستۆ.

یەکەم خۆ ڕزگـار کـردن لـە هـەموو ڕاو هەستێك دژی ئەم سـەرەتایە بێـت. ئنجـا کاروبار بە پێوانەیەکی نوێ بپێوین کە (ئاستە نرخێکی) نوێمان لـە لا دروست بکـات، جیاواز بێت لەوانەی لەوە پێش پێی ڕاهاتوین.

واتا سـاطع الحصـری هـەموو مەرجـە سیاسـی و ئـابووری و کۆمەڵایەتییـەکان ئەخاتە لاوەو بەپێی ئەم سەرەتایەی بۆ خۆی هەڵبژاردووە داوای پەیڕەوی لێ کردن لە عەرەب ئەکات.

ئەم توند ڕەوییە کوێرانەیە دەربارەی عـەرەب و عەرەبایـەتی، خستویەتییە سـەر ڕێبازی دژ بە نەتـەوەو کەمایەتییـە قەومییەکانی بە ڕەسمـی لـەچوار چێوەی وڵاتـانی عەرەبدا ئەژین. بۆیە دژی نەتەوەی کورد و بزوتنەوە نەتەوایەتی و ئامانجەکانی بووە.

بـەپێی لێکدانەوەیـەکی ئاسـایی ئەبوایـە ئـەم جـۆرە پیاوانـە چـۆن ئەڕواننـە نەتـەوەکانی خۆیان، بە هـەمان کێش و تـەرازوو نەتـەوە و کەمایەتییـە قەومییـەکانی دەوروپشتی خۆیان بنرخاندایە. کـەچی داخـی گـران ڕێگایـەکی تـەواو پێچەوانـەیان گرتۆتە بەر!!.

# پەراوێزەکان

١-العراق فى التأريخ ص ٥١.
٢-العراق فى التأريخ ص ١٨١.
٣-مقدمة فى تأريخ الحضارات القديمة -تأليف طه باقر ص ١٧٨-١٨١.
٤-مقدمة فى تأريخ الحضارات القديمة -تأليف طه باقر ص ٢١١-٢٢١.
٥-مقدمة فى تأريخ الحضارات القديمة -تأليف طه باقر ص ١٥١-١٥٣.
*-العراق فى التأريخ ص ٢٧٠-٢٧١.
٦-حماسة سراى در ايران- تأليف دكتر ذبيح الله صفا ص ٢٢-٢٣.
٧-ايران قديم -تأليف حسن پيرنيا- (مشير دوله سابق) ص١٠-١٢.
٨-مێژووی سۆڤیاتی بەزبانی ڕووسی، بەرگی یەکەم-مۆسکۆ ص٧٢٦.
ئەم چەند دێرە دوکتۆر کەمال مەزهەر وەریگێڕاوە
٩-الجغرافية السياسية- الدكتورة دولت احمد صادق ص٤٥٨-٤٦١.
١٠-حماسة سراى در ايران -تأليف دكتر ذبيح الله صفا ص٢٣-٢٤.
١١-خلاصة تاريخ الكرد و كردستان- محمد امين زكى بگ ترجمة محمد على عونى ص٦٣-٧٣.
١٢-مقدمة فى تأريخ الحضارات القديمة -تأليف طه باقر ص٧٨-٧٩.
١٢-مقدمة فى تأريخ الحضارات القديمة -تأليف طه باقر ص١١-١٢.
١٣-مفصل العرب و اليهود فى التأريخ- الدكتور المهندس احمد سوسه ص ٢١٣-٢١٤.
١٤_ ايران القديم _ تاليف حسن پيرنيا (مشير الدولة سابق) ص ٣٢-٣٣.
١٥-العراق فى التأريخ- بەشی دوکتۆر فاضل عبدالوهاب على ص٧٨.
١٥-مقدمة فى تأريخ الحضارات القديمة -تأليف طه باقر ص ١١-١٢.
١٦-كتاب مابين النهرين -تأليف ليواو پنهايم- ترجمه سعدى فيض عبدالرزاق ص ٤٢٩-٤٣٠.
١٧-ايران قديم- تأليف حسن پيرنيا (مشير الدوله سابق) ص٤٨.

١٨-ایران قدیم- تألیف حسن پیرنیا (مشیر الدوله سابق) ص٥٦-٥٧.
١٩-خلاصه تاریخ الکرد و کردستان -محمد امین زکی بگ ترجمه محمد علی عونی ص ٥٩.
١٩-مێژووی نەژادو پەی وەستەگی کورد- رشید یاسمی
بەرچڤەی بەدەست کارییەوە قانعی هونەرو کەریم زەند ص٨٧-٨٨.
٢٠-لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری -د. جمال رشید احمد ص٤٤٦.
٢١-سنتان فی کردستان ١٩١٨-١٩٢٠ تألیف دبلیو ار.هن ترجمه فؤاد جمیل ص ٥٣.
٢٢-کردستان و الاکراد- الدکتور عبدالرحمن قاسملو ص ٢٩.
٢٢-کرد و ترك و عرب -تألیف سی. جی . ادموندز ترجمه جرجیس فتح الله ص ١٢.
٢٢-خلاصه تأریخ الکرد و کردستان -محمد امین زکی بگ ترجمه محمد علی عونی ص٣٢٤.
٢٣-ایران قدیم -تألیف حسن پیرینا (مشیر الدوله سابق) ص٥٧.
٢٤-خلاصه تأریخ الکرد و کردستان - محمد امین زکی بگ ترجمه محمد علی عونی ص٣٢٣-٣٢٤.
٢٤-خلاصه تأریخ الکرد و کردستان - محمد امین زکی بگ ترجمه محمد علی عونی ص٣٢٧.
٢٥-خلاصه تأریخ الکرد و کردستان - محمد امین زکی بگ ترجمه محمد علی عونی ص ٣٢٧.
٢٥-خلاصه تأریخ الکرد و کردستان - محمد امین زکی بگ ترجمه محمد علی عونی ص ٣٢٨.
٢٦-حماسه سرای در ایران -تألیف دکتر ذبیح الله صفا ص٢٣.
٢٧-ایران قدیم -حسن پیرنیا (مشیر الدوله سابق) ص٤٤.
٢٨-لسان الکرد مسعود محمد ص٢٩-٣٢-٣٣-٦٥.
٢٩-لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری . د. جمال رشید احمد ص٤٠.
٢٩-لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری . د. جمال رشید احمد ص٢٨٣-٢٨٤.
٢٩-لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری . د. جمال رشید احمد ص٢٩٢-٢٩٣.

٣٠-لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری . د. جمال رشید احمد ص٣٠٤.

٣١-لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری . د. جمال رشید احمد ص٤٣٧.

٣٢-لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری . د. جمال رشید احمد ص٤٣٩-٤٤٠.

٣٢-مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئێستا نووسینی صالح قەفتان ص٩٧.

٣٣-اراء و احاديث فى اللغة و الادب - ساطع الحصرى ص٢٤٩-٢٥٠.

٣٤-القانون الدولى الخاص وفق القانون العراقى و المقارن تأليف الدكتور ممدوح عبدالكريم حافظ ص٣٣.

٣٥-القانون الدولى الخاص وفق القانون العراقى و المقارن تأليف الدكتور ممدوح عبدالكريم حافظ ص٥٥.

٣٦-ابحاث مختارة فى القومية العربية- ابو خلدون ساطع الحصرى ص١١٢-١١٣.

٣٧-تطور معنى القومية الدكتور منيف الرزاز ص ٢١-٢٢-٢٣.

٣٨-محاظرات في نشوء الفكرة القومية - ساطع الحصرى ص ٨٢-٨٣-٨٥.

٣٩-کتێبە بێ ناوەکە (الوطن العربى) ص ٥٨.

٤٠-حول الماركسية في العلم اللغة - ستالين ص ٢٩.

٤١-اللغة بين القومية و العالمية - تأليف ابراهيم انيس ص ١٣٢-١٣٣.

٤٢-اللغة بين القومية و العالمية - تأليف ابراهيم انيس ص ١٠٦.

٤٣-اللغة بين القومية و العالمية - تأليف ابراهيم انيس ص ١٠٧.

٤٤-اللغة بين القومية و العالمية - تأليف ابراهيم انيس ص ٢١٣

٤٥-اللغة بين القومية و العالمية - تأليف ابراهيم انيس ص ١٧١

٤٦-کتێبە بێ ناوەکە (الوطن العربى) ص ٤١.

٤٧-کتێبە بێ ناوەکە (الوطن العربى) ص ٤٢.

٤٨-اللغه بين القوميه و العالميه - تأليف الدكتور ابراهيم انيس ص ١٠٦.

٤٨-ابحاث مختارة فى القومية العربية - ابو خلدون ساطع الحصرى ص ١٧٩.

٤٩-ابحاث مختارة فى القومية العربية - ابو خلدون ساطع الحصرى ص ٤٥.

٥٠-ابحاث مختارة فى القومية العربية - ابو خلدون ساطع الحصرى ص ٣٦.

٥١-کتێبە بێ ناوەکە (الوطن العربى) ص ٤٥.

٥٢-الامم و المسأله القوميه - ايلينا مودر جنسكايا ص ١٧.

٥٣-الامم و المسأله القوميه - ايلينا مودر جنسكايا ص ١٩.

٥٤- اللغه بين القوميه و العالميه تأليف الدكتور ابراهيم أنيس ص ٩٨.

٥٥-الفلسفه الماركسيه ف. افاناسييف ترجمة عزيز سباهى منشورات جريدة النور ص ٢٦٨.

٥٦-كتێبه بىٚ ناوەكه (الوطن العربى) ص ٥٢.

٥٧-كتێبه بىٚ ناوەكه (الوطن العربى) ص ٥٢-٥٣.

٥٨- اللغه بين القوميه و العالميه تأليف الدكتور ابراهيم انيس ص ٨٩.

٥٩-اللغه بين القوميه و العالميه تأليف الدكتور ابراهيم أنيس ص ٨٩-٩٠.

٦٠-النهضة، د كمال مظهر احمد، ص ١٧،٢٢.

٦١-اللغه بين القوميه و العالميه تأليف الدكتور ابراهيم انيس ص ٤٥-٤٦.

٦٢-ابحاث مختارة في القومية العربية - ابو خلدون ساطع الحصرى ص ١٩٩.

٦٣-الوطن العربى - الدكتور جورج حنا معنى القوميه العربيه في "الكتاب المصدر" ص١٤

٦٤-اللغه بين القوميه و العالميه - تأليف الدكتور ابراهيم أنيس ص ٤٩-٥٠.

٦٥-استيقاظ اسيا - لينين ص ٢٨،٢٩،٣٠.

٦٦-كردستان و الاكراد - دراسه سياسيه و اقتصاديه - الدكتور عبدالرحمن قاسملو ص ٩٨ ، ٩٩.

٦٧-كردستان و الحركة القومية الكردية - جلال الطالباني ص ١٣٤.

٦٨-كردستان و الاكراد - دراسه سياسيه اقتصاديه - الدكتور عبد الرحمن قاسملو ص ٥٨-٥٩-٦٠.

٦٩-اللغه بين القوميه و العالميه تأليف الدكتور ابراهيم انيس ص ٤٧.

٧٠-الوطن العربي ص ٩٢.

٧١-مسائل السياسة القومية و الاممية البروليتارية - لينين ص ٦٦،٦٧،٦٨ .

٧٢-ابحاث مختارة حول القومية العربية - ابو خلدون ساطع الحصرى ص ١٩٦.

٧٣-اربع مقالات فلسفية - ماوتسى تونغ ص ٦١-٦٢.

٧٤-الفلسفة الماركسية . ف . افاناسييف ترجمة عزيز السباهي منشورات جريدة النور ص ١٠٤-١٠٥.

٧٥-اللغه بين القوميه و العالميه - تأليف الدكتور ابراهيم أنيس ص ٤٧-٤٨.

٧٦-ستالين.

٧٧-الامم و المسألة القومية. ايلينا مودر جنسكايا ص ١٧.

٧٨-الامم و المسألة القومية. ايلينا مودر جنسكايا ص ١٨.

٧٩-اراء و احاديث في اللغة و الادب ساطع الحصرى ص ٧١.

٨٠-اللغه بين القوميه و العالميه - تأليف الدكتور ابراهيم انيس ص ٢٣٤-٢٣٥.

٨١-اللغه بين القوميه و العالميه - تأليف الدكتور ابراهيم أنيس ص ٢٩٢.

٨٢-اللغه بين القوميه و العالميه - تأليف الدكتور ابراهيم انيس ص ١٩٠.

٨٣-اللغه بين القوميه و العالميه - تأليف الدكتور ابراهيم انيس ص ١٥٣.

٨٤-اضواء على الدراسات اللغوية المعاصرة. الدكتور نايف خورما ص ٢٢٦-٢٢٧.

٨٥-الصراع على كردستان . المسألة الكردية في العلاقات الدولية خلال القرن التاسع عشر تأليف الدكتور ن .١.خالفين ترجمة الدكتور احمد عثمان بكر ص ١٦.

٨٦-الصراع على كردستان المسألة الكردية في العلاقات الدولية. خلال القرن التاسع عشر تأليف الدكتور ن .١.خالفين ص ٢٠.

٨٧-الصراع على كردستان المسألة الكردية في العلاقات الدولية. خلال القرن التاسع عشر تأليف الدكتور ن .١.خالفين ص ٩٣.

٨٨-الصراع على كردستان المسألة الكردية في العلاقات الدولية. خلال القرن التاسع عشر تأليف الدكتور ن .١.خالفين ص ٩٤-٩٥.

*سەرنجێکی تایبەتی بەم باسە لەلایەن مامۆستا دوکتۆر کەمال مەزهەر.

٨٩-اللغة بين القومية و العالمية - تأليف الدكتور ابراهيم أنيس ص ٩٩.

٩٠-طريق في كردستان تأليف اي. ام. هاملتون - ترجمة جرجيس فتح الله ص ٤٦.

*١(المفكر و مهمات المرحلة في ضوء تجربة الكوميديا الالهية لدانتى) نووسینی دوکتۆر کەمال مەزهەر هەر بە عەرەبی لە (مجلة آفاق عربية، العدد الرابع، كانون الاول ١٩٨٣) - وەرگێراوەو کراوە بە کوردی.

# وشەیەکی پێویست

**خوێنەری بەڕێز...**

بەشی دووەمی ئەم کتێبە بریتییە لە کۆمەڵە وتارێك لەسەر زانستی جیۆپۆلیتیك کە خوالێخۆشبوو حلمی عەلی شەریف لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا نووسیونی.

ئەم وتارانە گەرچی سالآنێکی زۆری بەسەردا تێپەڕیوەو گۆڕانکاریە خێراو یەك لە دوایەکەکانی جیهان هەندێ لە تێڕوانین و بۆچوونەکانی نووسەری بەجێهێشتووە، لەوانە هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت و نەمانی جوت جەمسەری و هاتنە کایەی سیستمی نوێی جیهان و بوونی میدیایەکی هاوبەش وەك فاکتەرێکی گرنگ بۆ دروستبوونی نەتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم وتارانە گرنگی و بایەخی خۆیان لە دەست نەداوە، بەتایبەتی لە بواری ناساندنی زانستی جیۆپۆلیتیك و ئەو هۆکارانەی کە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆیان بەم زانستەوە هەیە، ئەمە جگە لەوەی نووسەر زۆر بە وردی قسە لەسەر دروستبوونی دەوڵەت و هۆکاری گەشەکردن و مانەوەی دەکات، هەروەها زانیاریەکی فراوانی لەسەر شەڕی ئەستێرەکان خستووەتە ڕوو کە لە سالآنی هەشتاکاندا و لەسەر دەستی ڕۆناڵد ریگن سەرۆکی ئەوسای ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گەیشتە ئاستێکی زۆر ترسناك، بۆیە کۆکردنەوەی ئەم وتارانەو کردنی بە کتێب بۆ خوێنەری ئێستای کورد کارێکی شیاو و پێویستە.

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

# جیۆپۆلیتیكس و دەوڵەت و سیاسەتی دەرەوەو چارەنووسیی جیهان

جیۆپۆلیتیكس بەم ناوەی ئێستایەوە باس و لێكۆڵینەوەیەكی تازەیە زاناو پسپۆرە جوگرافیاناسەكانی دەوڵەتە سەرمایەدارو ئیمپریالیە گەورەكانی جیهان هانیویانەتە كۆڕی زانستی ئادەمیزادەوە.

پەیوەندییەكی توندوتۆڵی هەیە بە چارەنووسی گەل و وڵاتە بچوك و مامناوەندییەكانی جیهانەوە، لە گۆڕەپانی وڵاتە گەورە چاوبرسییە چەوسێنەرەوەكانەوە هەڵئەقوڵێت و هی خۆیانەو لەوانەوە بڵاوبۆتەوە. پێش ئەمانیش هەر لە دەوڵەتە هاوشانە كۆنەكانی جیهانەوە بە شێوەیەكی تر هاتۆتە كایەوە.

سەبارەت بەوەی نەتەوەی كوردو خاكی كوردستان هەروەها هەموو نەتەوە هاوتاكانی كورد كە تا ئێستا چەپۆكی خاوەنانی ئەم ئایدیۆلۆجییەتەیان بە سەرەوەیە، پێویستە خوێنەرو ڕۆشنبیرانی كورد لەم بەشە زانستە ئاگادارو شارەزابن.

جیۆپۆلیتیكس وشەیەكی پێكەوە نراوە لە دوو وشەی لە خۆی پچوكتر دروستكراوە كە واتایەكی تایبەتی هەیەو بەندە بە زانستی جوگرافیاو سیاسەت و دەوڵەت و بنكەو پێوەندییەكانی دەوڵەتی باسلێكراو و دەوڵەتانی دەوروپشتیو دوورو نزیكییەوە.

بیر لە دواڕۆژی دەوڵەت و دیبلۆماسییەت و شەڕ و ئاشتی و فراوانی دەوڵەت و یەكگرتن و جیابوونەوە ئەكات.

وشەی یەکەمیان (جیو) واتا زەوی و وشەی دووەمیان پۆلیتیکس ئەو باسانەیە کە بەندە بە دەوڵەتەوە، بە تایبەتی سیاسەتی ئەو دەوڵەتە.

ئەوی ڕاست بێت گەوهەرو ناوەڕۆکی ئەم باسە بیرتییە لەو باسانەی جوگرافیای وڵاتێك یان ناوچەو هەرێمێك یان زەوییەکی گەورەتر ئەبەستن بە زانستی جێبەجێکردنی سیاسەتەوە.

بێگومان خوێنەر تاکو لەم باسە بە باشی تێبگات پێویستە سەرەتاکانی زانستی جوگرافیاو جوگرافیای سیاسی بزانێت، لە لایەکی تریشەوە جیۆپۆلیتیکس و کەرەسەو ئامرازی پێکەوەنان و یەککگرتن لەنێو دەوڵەتانی گەورەدا دەستنیشان ئەکات.

ئەم دەوڵەتە گەورانە بیر لەوە ئەکەنەوە نەخشەی سیاسی و ئابوری و عەسکەری دابنێن کە خۆیان لە مەترسی دەوڵەتە گەورە ناحەزەکانیان بپارێزن هەروەکو بۆ جێبەجێکردنێکی پتەوو قایمی ئەم نەخشەیە ئەبێ لایەنە لاوازەکانی دامەزراو و دەزگا جۆربەجۆرەکانی خۆیان چارەسەر بکەن.

لەبەرئەمەیە لێدوان و لێکۆڵینەوە لە جیۆپۆلیتیکس لەناو دەوڵەتە گەورە خاوەن زەوی و زارە پڕ سامانەکان و خاوەن ملیۆنەها دانیشتوان و بەهێزەکاندا سەریهەڵداوەو بایەخێکی زۆری پێدراوە. تەنانەت ئەوانەی کە ڕۆڵەی ئەم دەوڵەتانەش نەبوون و کەوتوونەتە سەر باسکردن و نووسینی تیۆری جیۆپۆلیتیکس ڕووی باسەکەیان کردۆتە دەوڵەتە گەورەکان و خۆشیان بوون بە خزمەت گوزاری ئەو دەوڵەت و ئیمپراتۆرییەتانە.

مێژووی جیۆپۆلیتیکس لەگەڵ پەیدابوونی دەوڵەتانی گەورەو ئیمپراتۆرییەتدایە، بەڵام لە هەرکات و جێگایەکدا بە شێوەیەك ڕەنگی داوەتەوە. ئەمە جگە لەوەی بە گەڵاڵە کراوی لە سەدەی نۆزدەهەمدا سەریهەڵداو ئینجا بەرە بەرە تا ئێستا ڕوو لە پێشکەوتنە. دامەزراوە سیاسی و دەزگا ستراتیجییە بەرزەکانی دەوڵەتە گەورەکان بە تایبەتی سەرمایەدارییەکانیان کردوویانە بە بەردی بناغەی زانست و شارەزایی لە پێناوی تەشەنەکردن و گەشەکردنی قازانج و دەستکەوتی تازەداو لە پێناوی دەستخستنی ناوچەی ئابوری گرنگی نوێ، سا ئەم دەستخستنە لەژێر هەر ناوو پەردەیەکدا برەخسێت. چونکە هەر بە هۆی شارەزابوون و لێ تێگەیشتنەوە

ئەتوانن ئارەزووی دوا ڕۆژی سەرکردەو چاوبرسییەکانی دەوڵەتە ئیمپریالییەکان و دەزگا جاسوسییەکانیان بهێننە دی. بۆیە جیۆپۆلیتیکس ئەم دەوڵەتانە ئەخاتە سەر ڕێبازی دووبەرەکی و ناکۆکییەکی سەختی ئاشکراو نهێنی لە پێناوی خۆپاراستن یان گەشەکردن و فراوانکردنی قازانجە جۆربەجۆرەکانیانەوە.

وەکو لە پێشەوە وتمان جیۆپۆلیتیکس باسێکی کۆن و فراوانە چونکە زانستێکی زیندوو بزێو و پەلهاوێژ و مێژووییە، لەگەڵ ئەوەشدا یەکەم جار بەم ناوەوە ڕۆدۆلف کیلن- مامۆستای مێژو و ڕژێمی حکومەتان لە زانۆکی جۆتنبرگ لە سوید ئەم ناوەی لەم زانستە ناوە، لە "کتێبی دەوڵەت ڕووداوێکە لە ڕووداوەکانی ژیان" کە لە ساڵی ١٩١٧دا بڵاوی کردۆتەوە ئەم ناوە هاتووە، بەڵام وە نەبێ زانایانی جیۆپۆلیتیکس هەموویان وەکو یەك لەم باسە دووابن، ئەگەرچی لە شێرازە سەرەکییەکانیدا هەموویان بۆ هەمان مەبەستی ناوکۆیی چوون. هەریەکە کەموزۆر لە پەلەکانی ئەم باسە دوواون، لایەکیان بە گرنگ زانیوەو لایەکی تر کەمتر و هەندێکیان لە پێناوی سەرخستنی ئامانجی جیۆپۆلیتیکسانەی دەوڵەتەکانیانا هێزو سوپای زەمینی و هەندێك هی هەوایی و هەندێك هی دەریاییان بەلاوە گرنگ و کاریگەرتر بووە.

لە سەرەتای پەیدابوونی ئەم زانستەوە تا ئەمڕۆ و لە ئایندەشدا هەر زانایانی ئەم بەشە زانستییەی ناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی خەریکی لیکۆڵینەوەو شیکردنەوەی ئاسانترین هێزی سوپایی ئەبن کە دەیانەوێ قازانجی سیاسی و ئابوری دەوڵەتە گەورەکانیان تاکە تاکەو بە کۆمەڵ بچەسپێنن. نەخشەی سیاسی و جوگرافی دەوڵەتانی تری جیهان لە پێناوی قازانجی تایبەتی خۆیاندا بگۆڕن. ناوچەی دەسەڵاتی سیاسی و ئابوری نوێ بە پێی پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیای جەنگ و دەستکەوتنی ئەم تەکنۆلۆجیایە پەیدابکەن.

بێگومان کە دیبلۆماسییەت لە کۆڕی دەستخستنی دەستکەوت و دەستڕۆیشتوویيدا بێ ئەنجام ئەبێت، ئینجا فەرمانڕەوایانی دەوڵەتە چاوبرسییە چەوسێنەرەوەکان یان ئەوانەی خاوەن مافی ڕەوای خۆیانن پەنا ئەبەنە بەر دەزگاکانی جەنگ و ئەیکەن بە ڕێبازی سەرکەوتن و بە ئامانج گەیشتن. واتا جەنگ کردن ئامرازێکی تری سیاسەتە پاش پوچەڵبوونی ئامرازی دیبلۆماسییەت.

سەبارەت بەوە ئەڵمانەکان لە چارەکی دووەمی ئەم سەدەیەدا پەیمانگایەکی تایبەتی و گۆڤارێکیان بۆ ئەم لایەنە دامەزراند. نووسەرانی ئەم گۆڤارە لە گۆڤارەکەیانا لە ساڵی ١٩٢٨دا بەم جۆرەی خوارەوە باسی جیۆپۆلیتیکس ئەکەن.

"جیۆپۆلیتیکس زانستی پێوەندی زەوییە بە کاروباری سیاسییەوە. جوگرافیا، بەتایبەتی جوگرافیای سیاسی بایەتەکانێتی کە بە پێی بیروڕای ئەوان زانستیی بووە سیاسییەکان "الکائنات السیاسیە" لە جێگاو شوێنی خۆیاناو بەم پێیە لایان وابووە کە ئەبێ بە هونەر، هونەری سەرکردایەتی کاروباری سیاسی".

سەرەڕای ئەوەی کارل هوسهوفەر کە دامەزرێنەری ئەم پەیمانگایەو بەڕێوەبەری گۆڤارەکە بووە کەچی خاوەنی پێناسێکی پوختی جیۆپۆلیتیکس نییە بەڵکو -ئوتوماوڵ- کە شاگردی هوسهوفەرو قوتابیەکی جوگرافیا خوێن بوو لەو باشتر جیۆپۆلیتیکسمان پێ -ئەناسێنێت و ئەڵێت "جیوپۆلیتیکس وەکو بوونەوەرێکی زیندوی ڕانەوەستاو هەمیشە بزێو بە دەوڵەتەوە خەریک ئەبێت، بە تایبەتی دەربارەی پێوەندی دەوڵەت بەو شوێنەو هەرچی لەو شوێنەدایە. جیۆپۆلیتیکس گوێ ئەداتە پێویستییە هەرێمییەکانی دەوڵەت، بەلام جوگرافیای سیاسی تەنیا خەریکی ئاوو خاك (بینە) ئەبێت. لە پێناوی گەشەکردن و دەستکەوتی تازەدا پەنا ئەبرێتە بەر جوگرافیا.

جیۆپۆلیتیکس بۆ لێکدانەوەی دواڕۆژ تەرخان ئەکرێت، وەکو ئەوەی ئایا دەوڵەت پێویستییەکانی خۆی دەست ئەکەوێت؟ لە چ لایەکەوە گۆڕانی پێویست ئەگونجێت؟

دیارە ڕێوشوێنی سەرکەوتنی ئەم پرسیارانە ڕاستەوخۆ قەوارەی دەوڵەت بە تایبەتی لایەنە نیشتمانی و ئابوری و پێوەندییەکانی دەرەوەی دەستنیشان ئەکات، کەچی جون کیفەر -بە شێوەیەکی تر لەم باسە ئەدوێت و لە کتێبی *Realities and world Power*دا ئەڵێت "جیۆپۆلیتیکس لە چەند شتێك پێکدێت بەلام لەسەر تیۆری هەڵسووکەوتی دەوڵەت دامەزراوە کە ئەمەش دایکی ڕاستەقینەی بنچینەییەتی. بۆیە بووە بە بناغەی سیاسەتی دەرەوەی وڵات یان هەر خۆی سیاسەتی دەرەوەیەتی.

بەلام -ئەدموندوالشی- کە لە پێش هەڵگیرساندنی شەڕدا قەشەیەکی ناوبژیکەری نێوان ژاپۆن و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوو جیۆپۆلیتیکسمان

بەوە پێنەناسێنێت کە "لێکۆڵینەوەیەکە جوگرافیای ئادەمیزادو زانستی کرداری سیاسی بە یەکەوە کۆئەکاتەوە" وە بە کێش و تەرازووی ئەم لێکدانەوەیە هێرش ئەباتە سەر بۆچوونی قوتابخانەی جیۆپۆلیتیکسی نازییەکان، سەبارەت بەوەی نازییەکان ئەڵەمانیایان بە ناوجەرگەی جیهان دائەنا ئاسیاو ئەوروپاو ئەفەریقایان بە دورگەی ئەم ناوجەرگەیە (*Heart Land*) کە بە حەوت دەریا دەورە دراوە، ئەمەش ریکاو ئوستورالیاو گرینلاندو دورگەکانی تری دنیاش کە کەوتوونەتە کەنار ئەم دورگەیە بە هی خۆیانی ئەزانن. لەو بڕوایەدا بوون کە لە ئەڵەمانیاوە هێزە سوپاییە هەواییەکەی ئەتوانێت پەلاماری هەموو بەشەکانی تر بدات و بیانخاتە ژێر باڵی خۆیەوە. ژاپۆنەکانیش دەربارەی جیۆپۆلیتیکس بەرنامەی تایبەتی خۆیان هەبوو، ئەم بەرنامەیە دوای داگیرکردنی کۆریا لە ساڵی ١٩١٠دا زیاتر گەشەی پێدرا بەلاَم لە قاڵبێکی شاردراوەدا بلاَویان ئەکردەوە. سیاسەتی داگیرکەرانەی خۆیان لە پەنا بیروڕای کۆچەرێتی و هەرێمی ڕۆژهەلاَتی پێشکەوتووی بزورگەوە ئەخستە گۆڕەپانی سیاسەتی ئەوکاتەی نێودەوڵەتانەوە. کەچی ئەمریکایی و ئینگلیزەکان چونکە تیرە داگیرکردن بوون بە دوای بنکەی عەسکەری و کەرەسەی خاودا ئەگەڕان. بۆیە ئامانجی جیۆپۆلیتیکسی ئەمان لەگەڵ هی ئەڵەمانەکان لەوەدا جیاواز بوو، ئەڵەمانەکان بە دوای ناوچەی تازەدا ئەگەڕان، ئەمان تەقەللایان ئەدا ناوچە داگیرکراوەکانی خۆیان بپارێزن.

لە کۆڕی باسکردنی جوگرافیاو جوگرافیای سیاسیدا گەلێك لە نووسەرانی ئەم باسە بە هەڵە جوگرافیای سیاسی و جیۆپۆلیتیکس تێکەلاَوی یەکتری ئەکەن کەچی ڕاست ئەوەیە سنور بۆ یەکە یەکەی ئەم سێ بابەتە بکێشرێت.

بۆ ئەوەی لەم نووسینەشدا سەر لە خوێنەران نەشێوێت بە کورتی باسی جوگرافیاو جوگرافیای سیاسی و جیۆپۆلیتیکس ئەکەین هەروەها شتێکیش لەسەر جیاوازییەکانی نێوان ئەم سێ بابەتە باس ئەکەین.

لە جوگرافیادا زەوی یان هەرێم بنچینەی باس و لێکۆڵینەوەیە بریتیە لە هەندێ پایەو خاسییەتی لە یەکچووی سروشتی و ئابوری و مرۆڤایەتی لە ناوچەکانی جوگرافی دیاریکراودا کە لە ناوچەکانی تری دەوروپشتی خۆی جیای ئەکەنەوە، ئەمانەش ئەبن بە بناغەی باس و لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە. ئەبێ ئەوە لەم بارەیەوە

بزانرێت كه خاسییەتی هەرێمی جوگرافیای لە ڕووی دینامیكییەتەوە خاوو سستەو بزێوی نەگرتۆتە خۆی.

بەڵام جوگرافیای سیاسی بەندە بە دەوڵەتەوە. ڕاستییەكەی ئەوەیە چونكە دەستكردی مرۆڤە بە پێچەوانەی جوگرافیاوە ئەم بزێوەو حەز لە جوڵانەوەو گۆڕان ئەكات، ڕێكئەكەوێت ناوچەكە پچوك یان مام ناوەندی یان گەورەو پان و بەرین بێت وەكو هۆڵەندەو سویسرە یان ڕۆمانیاو ئیتالیا یان وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكاو یەكێتی سۆڤییەت و كەنەدەو ئوستورالیاو سودان.

كە باسی جوگرافیای سیاسی ئەكرێت ڕووئەكرێتە چالاكی كاروكردەوەی هاونیشتمانەكانی ئەو هەرێمە بێ ئەوەی زۆر گوێ بدرێتە ڕابوردوو، باسكردنەكەش بەندە بە قازانجی یەكگرتووی دەوڵەتە نیازلێبووەكەوە.

بێگومان دەوڵەتیش وەكو مرۆڤ وایە دێتە دنیاوەو پێئەگات و گەشە ئەكات و پیر ئەبێت و لەناو ئەچێت.

واتە لەوانەیە زۆر بمێنێت یان زوو لەناوبچێت. پچوك بێتەوە یان گەورە، سنوری بە هەرلایەكدا بچێتە دواوە یان بەرەو پێشەوە بڕوات وە چەند ناوچەیەك یەكبگرن و ناوچەیەكی گەورەی یەكگرتوو پێكەوە بنێن یان ناوچەیەك ببێت بە چەند ناوچەیەكی پچوكی سەربەخۆوە یان پارچەیەك لە ناوچەیەك جیابكرێتەوەو ناوچەیەكی تری پێ گەورە بكرێت. وەكو پاكستان كە بەنگلادیشی لێ جیابووەوە یان ئەو دەوڵەتانە بە ئارەزوو یان بە زۆر لەگەڵ دەوڵەتی تردا یەكیان پێگرتوون نمونەی بە ئارەزووەكە كۆماری یەككگرتووی عەرەبی لە میسرو سوریا دروستبووی كاتی خۆی وەكو وڵاتە یەككگرتووەكانی ئەمەریكا كە بەرەبەرە گەورە بووە تا گەیشتۆتە ئەم ئاست و ئەندازەیەی ئێستا.

لەبەرئەوەی باس و لێكۆڵینەوەی جوگرافیای سیاسی پێوەندییەكی ئێجگار زۆری بە سنوری سیاسی دەوڵەتانەوە هەیە كە ئەمیش بەندە بە ڕابوردووی مێژوویی و مرۆڤایەتی و سروشتی ئەو دەوڵەتە باسلێكراوانەی ئەبنە سەرچاوەیەكی ئێجگار گرنگی جوگرافیای سیاسی.

دیارە ئەم جوڵانەوەیە و دینامیكییەت و بزاوتن و فرەلقی لێكۆڵینەوەو فرە ستونە ئەم باسەی گران و دژوار كردووە، لەگەڵ ئەوەشدا جیۆپۆلیتیكس چەندەها

جار لەم گران و سەخت و دژوارترە. ئەمیش لەبەر دوو هۆی سەرەکی، یەکەمیان لە ڕووی زانستەوە ئەم لەسەر پایەی قایم دانەمەزراوە. دووەم سەبارەت بەوەی جیۆپۆلیتیکس باسی دواڕۆژ ئەکات و نەخشە بۆ دواڕۆژی دەوڵەتێك یان چەند دەوڵەتێك یان هەموو جیهان ئەکێشێت، ئەم نەخشەیەش بەندە بە ئامێتە بوون و بەیەکەوە لکان و هەندێ جار بە یەکداهەڵپژانی ناوچەی جوگرافی و ستراتیجی عەسکەری سەردەمی خۆیەوە لەبەر ئەمانە ئەم بابەتە قورس و سەخت و گرانتر ئەبێت.

بێگومان لەکاتی سەدەی نەتەوایەتی ڕەگەزپەرستانەو ستراتیجییەتی سوپایی جیهانگیریدا کە دەوڵەتە خاوەن عیلاقەکان چاو ئەبڕنە داگیرکردنی جیهان یان بەشێك لەم جیهانە یان هیچ نەبێت بە ئاشکراو لە ژێر پەردەوە تەقەللا ئەدەن دەست بەسەر وڵاتانی پچوك و مام ناوەندیدا بگرن، ئەم باسە ئەوەندەی تر گرنگ دێتە پێشچاوو خۆی بەسەر سیاسەت و پێوەندییە سیاسییەکانی نێو دەوڵەتاندا ئەسەپێنێت.

دکتۆر محمد ریاض لە کتێبی جوگرافیای سیاسی و جیۆپۆلیتیکسدا بەم جۆرەی خوارەوە جوگرافیاو جوگرافیای سیاسی و جیۆپۆلیتیکس لە یەکتری جیائەکاتەوە:

١-جیۆپۆلیتیکس ئەو نەخشەیە ئەکێشێت کە دەوڵەت ئەبێ چۆن بێت بەڵام جوگرافیای سیاسی باسی قەوارەی جوگرافیای دەوڵەت ئەکات.

٢-جیۆپۆلیتیکس خەیاڵ لە دواڕۆژی دەوڵەت ئەکاتەوە بەڵام جوگرافیای سیاسی بە ڕوونکردنەوەی ڕابردو و ئێستا ڕازییە.

٣-جیۆپۆلیتیکس بزێوو بەرەوپێش ئەڕوات بەڵام جوگرافیای سیاسی حەز لە ڕاوەستان و نەگۆڕان ئەکات.

٤-جیۆپۆلیتیکس هەوڵئەدات جوگرافیاو ڕاستییەکانی بکات بە خزمەتگوزاری دەوڵەت بەڵام جوگرافیای سیاسی تەنیا وێنەی دەوڵەتە.

لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێت کە لە نێوان جوگرافیاو جوگرافیای سیاسی و جیۆپۆلیتیکسدا شان بە شانی جیاوازی خاڵی ناوکۆییش هەیە، ئەوە جگە لەو پێوەندییانەی لە نێوان جوگرافیای سیاسی و زانستی سیاسیدا هەیە بە لەیەکچوون و جیاوازیشەوە. چونکە جوگرافیای سیاسی لەسەر دوو ستون وەستاوە: زەوی و گەل،

کە لەم دوو ستونە یان لە ئەنجامی پێکەوەبوونی ئەم دوو ستونە، ستنوێکی تریش دێتە کایەوە کە دەوڵەتە.

هەرچەندە زانستی سیاسی پەیوەندییەکی تەواوی بە دەوڵەتەوە هەیە لە هەمان کاتدا پەیوەندییەکی توندوتۆڵیشی بە ڕێکخستنی هەڵسوکەوت و دۆستایەتی و ناحەزی و بەگژاچوون و شەڕو ئاشتی نێوان دەوڵەتانی جیهانەوە هەیە، لەم لایەنەوە جوگرافیای سیاسی زۆرتر لە جیۆپۆلیتیکس نزیك ئەبێتەوە چونکە زانستی سیاسی هەروەکو نەخشە بۆ ژیانی سیاسی و ئابوری و عەسکەری ڕۆژانەی دەوڵەتان ئەکێشێت هەروەها بیریش لە دواڕۆژی دەوڵەتێك یان چەند دەوڵەتێك یان هەموو جیهان بە پێی گەورەو بچوکی کاربەدەستانی دەوڵەتەکە ئەکاتەوە.

سیر هالفورد ماکندەر جوگرافیا ناسی ئینگلیزی و پرۆفیسۆری جوگرافیا لە زانکۆی لەندەن و جێگری سەرۆکی کۆمەڵی جوگرافیاییە شاهانەکانی بەریتانیا لە تیۆرییە بەناوبانگەکەیدا لە ساڵی ١٩٠٤ لە وتارێکدا ئەڵێت "ئەوانە مێژووی جیهانیان دامەزراندووەو لەمەولاش هەر دروستی ئەکەن کە خەڵکی ناوچە مەزنەکانی ناوەوەن بریتین لە دانیشتوانی دەشتایەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپاو دەشتاییەکانی ڕۆژهەڵات و ناوەڕاستی ئاسیا. چونکە ئەمانە دانیشتوانی کەنار ئەوروپاو ئاسیایان خستۆتە ژێر پاڵەپەستۆی خۆیانەوە کە پانایی ئەم ناوچەیە (٢١) ملیۆن میلی چوارگۆشە ئەبێت. ئینجا درێژە بە باسەکەی ئەدات و ئەڵێت "لە خواروو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئەم ناوچەیەوە کە ناوی ناوە ناوجەرگەی جیهان *Heart Land* ناوچەیەکی کەوانە شێوەی هەیە پاپۆڕ ئەیگاتێ وە لەو بڕوایەدا بووە کە ئەم ناوچەیە لە ژێر دەسەڵاتی هەر لایەکدا بێت ئەیخاتە کۆڕێکەوە شانەکانی ئەوروپاو ئاسیا بۆ ژێر هەمان دەسەڵات کێش بکات، ئیتر بەم جۆرە سەرچاوەکانی سامانی ئەکەوێتە دەست و کە ئەم سامانە گەورەیەشی کەوتە دەست بناغەی ئیمپراتۆرییەتێکی جیهانیگری دائەمەزرێنێت. هەروەها لای وابووە بە یەکگرتنی ڕوسیاو ئەڵەمانیا ئەم کارە بە ئەنجام ئەگات، دیارە ماکندەری ئینگلیزی بەم باسەی ئینگلیزەکانی هۆشیارکردۆتەوە کە هەست بەم مەترسییە بکەن. چونکە لای وابووە ئەگەر ئەم دوو وڵاتە ڕوسیاو ئەڵەمانیا کە کەوتونەتە ناوجەرگەی جیهانەوە یان خۆیان ناوجەرگەی جیهانن یەکبگرن هەڕەشەیەکی گەورەو سامناك لە بەریتانیا ئەکەن، بۆیە داوای

لێکردن کە چارەسەری خۆیان بکەن و ڕێگای ئەم چارەسەرییە نزیکبوونەوەیە لە ڕووسەکان.

لە ساڵی ١٩١٩ لە کاتی بەستنی کۆنگرەی ئاشتی لە پاریسدا کتێبێکی بڵاوکردەوە سەرناوەکەی "ڕەوشت بەرزی دیموکراسی و ڕاستێتی ڕووداو" بوو، تیایا ئەڵێت "یەککگرتنی ڕوسیاو ئەڵەمانیا یان ئەگەر ئەڵەمانیا ڕوسیا داگیربکات ئاشتی ئەوروپا دووچاری مەترسییەکی گەورە ئەبێت".

ماکندەر هەر سوور بووە لەسەر ئەوەی کە هەرکەسێك -هیرت لاند-ی بە دەستەوە بێت دورگەی جیهانیشی ئەکەوێتە دەست، ئەم دورگەیەش کە ئەورووپاو ئاسیاو ئەفەریقا لە باوەشیا ئەبێت ئەبێتە یەك ئۆقیانوسی گەورە.

بەم پێیە ماکندەر ئەم تیۆرییەی خوارەوەی دانا کە ستراتیجییەتی جەنگ و داگیرکەری ئینگلیز و ئەڵەمانیای تیا ڕەنگئەداتەوە. ئەوی ڕاست بێت ئەڵەمانەکان چ فەرماندەو چ چینە خاوەن دەسەڵاتەکان زۆر هوشیارانە لە مەغزی تیۆرییەکانی ماکندەر گەیشتبون:

١-هەر لایەك فەرمانڕەوای ئەورووپای ڕۆژهەڵات بێت دەست بەسەر ناوچەکە واتا- هیرت لاند-دا ئەگرێت.

٢-هەر لایەك فەرمانڕەوای ناوجەرگە بێت دەست بەسەر دورگەی جیهاندا ئەگرێت.

٣-هەر لایەك فەرمانڕەوای دورگەی دنیا بوو دەست بەسەر گشت لایەکی جیهاندا ئەگرێت.

دەربارەی ناوجەرگەی جیهان -فاوست- کە ئەویش جوگرافیاناسێکی ئینگلیزی بوو پێشنیازی کرد کە ناوچەی دەریای ناوەڕاست و دەریای سوورو کەنداوی عەرەبی بخرێتە سەر ناوجەرگەی جیهان.

بێگومان ئایدیۆلۆجییەتی ناوجەرگە *-Heart Land-* هێزێکی سوپایی گەورەی بەدەستەوە بێت و نیازی وا بێت جەنگێکی گەورە بەرپا بکات چاك بۆی ئەگونجێت و ئەم ڕێبازە بەرەو پێشی ئەبات. هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو بووبوو بە ئایدیۆلۆجییەتێکی گرنگ لای ئەوانەی بە جیۆپۆلیتیکسەوە خۆیان خەریك ئەکرد.

بۆیە سەیر نییە کە هوسهوفەری ئەڵەمانیایی زۆر بە وردی سەرنجی ئەدایە نووسین و بیروڕاکانی ماکندەری ئینگلیزی بە وردی لێی ئەکۆڵییەوە، ئەم

لێکۆڵینەوەیەش خستییە سەر ئەو ڕێبازەی کە بە زۆر یان بە خۆشی هەوڵبدرێت ئەڵەمانیاو یەکێتی سۆڤییەت یەکبگرن تا ئینگلیزەکانی پێ بتۆفێنن.

هوسهوفەر لەو بڕوایەدا بوو کە لە کاتی بە گژاچوونی هێزێکی جیهانی گەورە یان چەند هێزێکدا ئەبێ ناوجەرگەی جیهان بە دەست ئەڵەمانەکانەوە بێت و ناوچەکەشی بەو ناوچە ستراتیجییانە ئەزانی کە پێویستی جەنگێکی وان. ئەویش بریتی بوون لەو قەڵا گەورەیە کە لە ڕووباری ئالپ لە ڕۆژئاوای ئەورووپاوە تا ڕوباری ئامور لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا درێژە ئەکێشێت. ئەم ناوچەیەش هەموو پیشەسازییەکی گرنگ و بایەخدارو پێویستی بە کەرەسەی خاوی تەواوەوە تیا دێتە بەرهەم پیشەسازییە ستراتیجییە گرنگەکانی ئەم ناوچەیەش کەوتونەتە ئەو جێگا دوورانەوە کە بە ئاسانی ناکەونە بەردەست.

هەروەها لەو بڕوایەدا بوو کە دەستگرتن بەسەر سامانە بێهاوتاکانی ناوچەی ئورال و ئۆکرانیاو قەوقاز ئەبێتە پشتیوانێکی کاریگەر بۆ دامەزراندنی ئەڵەمانیایەکی شایستەو خاوەن ئابورییەکی تێروپڕ کە بتوانێت دەست بەسەر هەموو جیهاندا بگرێت.

کەچی -نیکولاس سپایکمان- پرۆفیسۆری زانکۆی (یالە -*Yale*-) لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە شێوەیەکی تر بۆ ئەم باسە ئەچێ کە زۆر بە قوڵیش لە سیاسەتی جیهان تێئەگەیشت و ئەڵێت.

"هەر لایەك فەرمانڕەوای دەست و پەلی ناوجەرگەی جیهان بێت ئەورووپاو ئاسیای ئەکەوێتە ژێردەستەوە هەرکەسێك ئوراسیای کەوتە ژێردەست دەست ئەکێشێت بەسەر جیهاندا".

بەڵام جوگرافیاناسێکی تری ئەمەریکایی، ئەمەریکای ژووروی لە ئاسیا لا گرنگ ترە. کەچی جورج رینەر جوگرافیازانێکی تر ئەڵێت "سەبارەت بەوەی هێزی جەنگی هەوایی لە جیهاندا زۆر گەشەی کردووە ئیتر ناوجەرگەش بەو پێیە ئەبێ ئەوەندە فراوان بێت کە هەموو وشکاییەکانی جیهان بگرێتەوە".

سەرەڕای ئەم بیروڕایانەی هەندێ جوگرافیازانی ئەمەریکایی هێزی هەوایی چەکداری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە کلاوڕۆژنەیەکی ترەوە ئەڕوانێتە ناوجەرگە.

بێگومان پیلانەکانی ئەوەیە بتوانێت بە هێزێکی جەنگی هەوایی، دامەزراوە ستراتیجییە گرنگەکانی پارێزەری ناوجەرگە یان تەرخان کراو بۆ ناوجەرگەی دەوڵەتی شەڕکەری دوژمنیان تێکوپێك بدەن.

ئەوی ڕاست بێت ئێستا ناوجەرگەی جیهان لای هێزە هەواییە چەکدارە گەورەکانی جیهان لە زەمینەوە گواستویەتییەوە بۆ ئاسمان و نەخشە بە شێوەیەك دائەنێن کە بە هێزی چەکداری هەوایی دوور بردو سامناك و فرەکوژو فرەوێرانکەرو خاوەن تەکنۆلۆجیای بەرز دەست بگرن بەسەر جیهانداو گەلان و دەوڵەتانی کەم دەسەڵات لە پەلوپۆ بخەن.

بێگومان ئەم بڕین بڕکێیەی لە پێناوی داگیرکردنی مانگ و ئەستێرەو دامەزراندنی ئێستگەی گەورە لە بۆشایی ئاسماندا ئەیکەن هەر لەسەر ئەو ئایدیۆلۆجییەتە بناغەی دامەزراوە کە ناوجەرگە چۆتە بۆشایی ئاسمانەوە و کام لا بە تەواوی ناوجەرگەی گرتە باوەش ئەوە جیهان ئەکات بە موڵکی خۆی.

بێگومان هەر لە دامەزراندنی یەکەم ئیمپراتۆرییەتی سەرزەمینەوە تا ئێستا ئارەزووی داگیرکەری فەرمانڕەواو چینە دەسەڵاتدارە چەوسێنەرەوەکانی دەوڵەتە گەورەکانی جیهان ئەم بەشە ئایدیۆلۆجییەتەی نێو ئادەمیزادی کردووە بە گیانەوەرێکی زیندوو، هەر جارە قەوارەی بە شێوەیەك و ناوەڕۆکی وەکو یەك و بەیەك نیازو لە یەك سەرچاوەوە لەناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا ڕاستکردۆتەوە.

لەبەرئەوەی کوردستان و هەموو ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاست و کەنداوی عەرەب و لەم لاشیانەوە هندستانی قەوارە کۆن بە دەست خاوەنانی ئەم ئایدیۆلۆجییەتەوە ژێردەستەو گرفتار بووبوون، ئەم دەردیسەری و گرفتارییەش کەموزۆر تا ئەم ڕۆژانەی ئێستاشمان هەر لە کایەدایە، بۆیە پێویستە لەسەر دانیشتوانی ئەم ناوچانە بە تایبەتی ڕۆشنبیرەکانیان زۆر بایەخ بەم ئایدیۆلۆجییەتە بدەن و بە دوایا بگەڕێن و لێی تێبگەن تا شیرازە ڕەشەکانی بپچڕێنن و خۆیان لە تۆڕی تورهاوێژە ئیمپریالیستەکان بپارێزن.

سەبارەت بەوەی بەشێکی زۆری خاکی کوردستان و نیشتمانی عێراق هەمووی و وڵاتانی سەر کەنداوی عەرەب هەموو کەوتونەتە سەر دەریایەکی دەوڵەمەندی خاوەن سەدان هەزار ملیۆن بەرمیل نەوت و نەوتیش بگێڕی مەکینەی شەڕی ئاشتییەو

کەرەسەیەکە لە هەرە کەرەسە بە نرخ و بایەخدارە ستراتیجییەکانی دەوڵەتە گەورەکانە، لەبەرئەوە ئەبێ گومان لەوە نەکەین کە دەزگا ستراتیجییەکانی ئەم دەوڵەتە گەورانەو کۆشکە خاوەن بڕیارە سیاسیەکانیان خانەیەکی زۆر تایبەتیان بۆ ئەم هەرێمە گرنگە شورە کێشاوەو کۆمەڵە پسپۆڕو شارەزایەکی تایبەتیان بۆ سەرخستنی ئەم ئایدیۆلۆجییەتە، ئایدیۆلۆجییەتی جیۆپۆلیتیکس تەرخانکردووەو هەموو کەرەسەو ئامرازێکی پێویست و سامانێکی نیشانە نەکراویان خستۆتە بەردەستیان تاکو ئەم بیروباوەڕە بگۆڕن بە کردەوەو ببێتە ڕاستییەکی مادی بینراو.

بە خۆڕایی نییە چەندین گەل و بزوتنەوە نیشتمانی و نەتەوایەتی و مرۆڤایەتییەکانیان بە سەرکردە و پارت و حکومەتەکانیانەوە شەووڕۆژ بە یەکەوە ئەبەستن و ملی ڕێگای خەباتێکی سەختی ئاشتیخوازانە و خوێناوی ئەگرنە بەرو دەیان ساڵ و هەزاران لاوی پایەبەرزو بە نرخ ئەکەن بە قۆچی قوربانی لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆیی و کامەرانیداو خەریکن لە لوتکەی ئامانج نزیك ئەبنەوە کە چی لە ناکاو شاباڵێکی شوومی نادیار ناگەهان لێیان پەیدا ئەبێت و ڕەنجی چەند ساڵەیان بەبا ئەدات، یان کێشەو بەرەیەکی لە خەیاڵدا نەبویان بۆ ئەڕەخسێنێت کە ڕیسەکەیان لێ ببێتەوە بە خوری!

## بەسەر سنووری وڵاتاندا کشان و بایەخدارترین دەرفەت

جیۆپۆلیتیکس باسێکە لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی گەورەو خاوەن دەسەڵات و دەوڵەتانی ئیمپراتۆریدا هاتۆتە کایەوە. هەرچەندە بەم روونی و فراوانییەو بەم ناوەوە نەبووە، بەڵام ناوەرۆکەکەی هەرهەمان باس و لێکۆڵینەوەو بۆچوونەو بۆ هەمان ئارەزو و ئامانج بەکارهێنراوەو لەمەودواش هەروا بەکارئەهێنرێت.

جیۆپۆلیتیکس ئایدیۆلۆژییەت و باسێکە کە پێویستە رۆڵەو رێکخراو و کاربەدەستانی دەوڵەتانی بچوك و گەورە ناوەرۆك و توێکڵی بە باشی لێکبدەنەوە، بە تایبەتی هی گەلان و دەوڵەتانی بچوك چونکە ئەبنە نێچیری تیروکەوانی رژێم و دەوڵەتە گەورە چاوبرسییەکان کە بە تینی گڕی ئەم ئایدیۆلۆژییەتە گەلەکانی خۆیانو هێزە کاریگەرەکانیان بە تایبەتی هێزی چەکدارو رێکخراوی لاوان لە کۆڕی هەوڵ و تەقەلای جێبەجێکردنی نیازو ئامانجە ناڕەواکانیانا جۆشئەدەن.

بێگومان کاربەدەستانی بڕیاردەری (صانع القرار) دەوڵەتانی گەورەو ئیمپراتۆریەتەکان کە بە پێی کێش و تەرازووی جیۆپۆلیتیکسی دەستیانکردووە بە کارکردن، بە هیچ شێوەیەك یاساو عورفی نێودەوڵەتان و گەلانیان بەسەر نەکردۆتەوەو زۆر جار بێشەرم و شکۆو بە ئاشکرا پێشێلیان کردووە ئەمانە کە نەخشەی کارو کردەوەیان کێشاوە تەنیا بیریان لە قازانج و دەستکەوتی ئەو وڵاتە کردۆتەوە کە سەرکردایەتیان کردووە، بێگومان قازانج و دەستکەوتی چینێك یان توێژاڵێکی گەورەی سەرەوەی ئەو چینە بووەو بەس!.

بۆیە لای ئەم جۆرە کاربەدەستانە کشان بەسەر خاکی گەلانی تردا مەبەستی سەرەتایی و گەوهەری سیاسەتی دەرەوەیان بووە، با ئەم کشان و خۆئاوساننەش بۆ مەبەستی جۆراوجۆریش بووبێت، وەکو پەرەپێدانی بازرگانی یان دەستخستنە ناو

کاروباری وڵاتێکی ترەوە یان خەڵك بە زۆر بە کۆیلەکردن یان داگیرکردنی زەویوزاری نویّ و تێکەڵکردنی بەهی خۆیان. بۆیە ئیمپراتۆرییەتە کۆنەکان وەکو ئاشورو بابل و عیلام و ئیغریق و فارس و فیرعەونییەکان.. کە پەلاماری یەکترییان داوەو لایەکیان بەسەر لایەکی تریانا سەرکەوتوون زۆر بێ بەزەییانەو دڕندانەو نامرۆڤانە ڕەفتاریان لەگەڵ سەرکردەو لەشکرو دانیشتوانی لایەنە ژێرکەوتووەکەدا کردووە.

بۆ نمونە ئاشورییەکان پێستی سەرکردە دیلەکانیان بە زیندوویی گرووە، کیسراکانی فارسیش هەندێکیان چاوی سەرکردە بەدیل گیراوەکانیان هەڵکۆڵیوەو هەندێکی تریان ئێسقانی دەفەی شانیان بە زیندویی دەرهێناون!! پێش هەموو پەلاماردانێك کۆمەڵێك بڕوبیانو و ئامۆژگاری پیاو ماقولانی ئەو دەمەی خۆیان و ئارەزووی هەڵبەستراوی خواوەندەکانی خۆیان بۆ ڕێکخستووەو ڕازاندۆتەوە تا هێرش و داگیرکردنەکەیان بخەنە قاڵبێکی هەق و ڕەواو داگیرکراویش بە ناهەق و زۆردارو ناڕەوا و لە ڕێلادەر لە قەڵەم بدەن.

ماکندەر لە کتێبی *Demoeratie Ideals Reality* دا ئەڵێت "لە کۆنەوە تا ئێستا هەر سەدەیەك جیۆپۆلیتکسی خۆی هەیە، بۆیە لە کاروکردەوەکانمانا هەر بەو بیروباوەڕە کۆنانە ڕاستییەکانی جوگرافیا تەماشا ئەکەین". ئەرستۆی فەیلەسوفی ئیغریقی لە کتێبی "سیاسەتدا" بەم شێوەیە دەربارەی ئەم باسە ئەدوێت "هەڵکەوتی جوگراڤ یۆنانی کە هەرێمێکی خۆش هەوایە (معتدل) ئیغریقی وا هەڵخستووە کە دنیا بکەوێتە ژێر دەستییەوە، واتە گەلانی باکوری ساردو باشوری گەرم".

هەروەها (ابن الخلدون) زانای بەناوبانگی عەرەب کە لە ساڵی ٨٨٠ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە بە پێی ئاووهەواو جوگرافیا ڕەوشتی خەڵکی دەستنیشانکردووەو ئەڵێت "ئاووهەوا وای لە خەڵکی ناوەڕاستی ئەفەریقا کردووە کە حەز بە ئارامی و خۆشگوزەرانی بکەن هەروەها بەهێزبوون و لەناوچوونی هەر دەوڵەتێك ئەخاتە پاڵ خزمایەتی و یەکێتی خوێنی دانیشتوانی ئەو دەوڵەتە یان پێچەوانەکەی، واتا دانیشتوانی هاوخوێن و هاونەتەوە بەهێزئەبن و وڵاتانی فرە نەتەوە لاواز ئەبن و لە ئەنجاما دەوڵەتەکەیان هەڵئەوەشێتەوەو لەناوئەچێت".

لە ٣ هەزار ساڵ لەمەوپێشەوە وەکو زانایانی ئەم دواییەی جیهان هەریەکەیان هەر جارە ناوچەو هەرێم و چەند وڵاتێکیان لەلا ناوجەرگە (*Heart Land*)ی دنیا

بووەو بەوپێیە ئەبێ بەشەکانی تری جیهان ژێردەستەو دەسندە خۆری ئەم ناو جەرگەیە بن، ئەوساش هەروەها هەر لایە شوێنێکی بە ناوجەرگەی جیهان زانیوە وەکو ولاتانی فیرعەون و بابل و ئەکەدو ئاشورو میدیاو عیلام و ئەخمینی و ئیغریق و بیزەنتی..

لە سەدەکانی ناوەڕاستیشدا تا پێش شەڕی یەکەمی جیهان عوسمانلی و ئیسپانیاو پورتوغال و فەرەنساو بەریتانیا و هۆڵەندە..".

زانایانی جیۆپۆلیتیکس لەو بڕوایەدان کە زەوی و زارو ئاووهەوا بەردی بناغەی دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتە گەورە کۆنەکانی مێژوون، وەکو سۆمەرو ئەکەدو بابل و ئاشورو میسری ولاتی فیرعەونەکان. ناوداریو بەناوبانگی حەزرەتی لوت و نەتەوەکەی بە هونەری پیتوبەرەکەتی دۆڵی ڕووباری دیجلەو فورات و دۆڵی ڕووباری نیل و ڕووباری ئەردەن ئەبەستنەوەو ئەڵێن بۆیە لوت و نەتەوەکەی لە ئیبراهیمی خەلیل جیابوونەوە چونکە ئەم حەزی بە کۆچەریی و گەڕان بەنێو گردو هەردی پڕ گژو گیادا ئەکرد، هەروەها میدیاو ئەخمینییەکان بەرزاییەکانی ئێستای ئێران پێکییەوە ناون و حەیسییەکانیش بەرزاییەکانی ئەنادۆڵی ئێستای تورکیا.

ڕەنگە کۆنترین نەخشەی جوگرافی، نەخشەی هیکاتیوس *Hecateus* بێت کە لە سەدەی شەشی پێش زایینیدا دایناوەو جیهانی کردووە بە دوو ناوچەوە ناوچەی سارد کە ئەورووپاو باکوری ئاسیا بووە و ناوچەی خۆش هەوا (الدافیء) کە ئاسیاو ئەفەریقا بووە، بە پێی بیروڕای ئەو ناوچەی خۆش هەوا زەمینەیەکی باش دێنێتە کایەوە بۆ دانیشتن و دامەزراندنی دەوڵەتانی خاوەن هێز بەلام لە سەدەی پێنجی پێش زایینیدا پارمیندس *Parmanides* جیهان بەپێی ئاووهەوا ئەکات بە پێنج ناوچەوە ناوچەیەکی زۆر گەرم و دوو ناوچەی زۆر ساردو دوو ناوچەی مامناوەندی یان خۆش هەوا، ئیتر ئەرستۆ بە پێی ئەم دابەشکردنە تیۆرییەکەی خۆی داناو وتی "ولاتی ئیغریق تۆوی هێزو توانای لێ شین ئەبێت".

بەلام پلینی *Pliny* جوگرافی زانی ڕۆمانی نەخشەیەکی سەیری جیۆپۆلیتیکسانەی بۆ ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی کێشاو لای وابوو کە ڕۆما دەسەلاتی خۆی ئەگەیەنێتە لێوارەکانی دەریای ناوەڕاست و، بە پێی پێویست درێژە بە دەسەلاتی خۆی ئەدات تا ئەگاتە ڕووباری راین و دانوب و فورات و نیل. بەلام

جیۆپۆلیتیکسەناسەکانی عەرەب و ئیسلام جیهانی ئاوەدانکراوەیان کردبوو بە دوو بەشەوە ئەوروپا لە باکورو ئەفەریقاو ئاسیا لە باشوور ئەم دووانەی دواییان هەر بەیەك قارە لە قەڵەم ئەدا بۆیە جیۆپۆلیتیکسەکانی عەرەب چاویان بڕیبووە دەریاو زەوی دەوروپشتی ئۆقیانوسی هیندی و ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو ناوەڕاستی ئەفەریقا، هەر لەبەر ئەمەشە کە جیاوازی نێوان ئیمپراتۆرییەتی ئیسلامی و ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی لێرەدا بە ڕوونی دەرئەکەوێت هەریەکەیان لایەکیان بە ناوچەرگەی بە نرخ و بایەخداری جیهان دائەنا و ڕوویان تێئەکرد.

ڕۆمانیەکان ئەورووپاو دەریای سپی ناوەڕاستیان لا بایەخدار بووە، بەڵام ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی لە بەغدا ئەفەریقاو ئاسیاو زەریای هندییان لا بایەخدار بووە، دیارە ئەم باس و لێکۆڵینەوانە لەلایەن کاربەدەستان و سەردارانی دەوڵەتە گەورەکان و ئیمپراتۆرەکان و زانایانی رابەری ئایدیۆلۆژی جیۆپۆلیتیکسەوە دەربارەی ئاووهەواوو زەوی بە نرخ و بێنرخ وڵاتانی خاوەن هێزو بێهێزو گەلی شایستەو هی مامناوەندی و هی بێ فەرەوە هەمووی بۆ زەمینە خۆشکردن بووە لە پێناوی درێژەدان بە سیاسەتی داگیرکردنی زەویوزارە نوێیەکان و ژێردەستەکردنی گەلانی بچوك و لاوازەوە.

فەردریك راتزل پرۆفیسۆری جوگرافیای سیاسی لە زانکۆی لایبزگ لە کتێبی جوگرافیای سیاسی لە ساڵی ١٨٩٧دا یاساکانی ئەم باسەی داناوەو لە وتارێکدا کە سەرناوەکەی "حەوت یاسای گەشەکردنی زەوی دەوڵەت" لە سێ خاڵی دوایی یاساکەیدا ئەڵێت.

٥-کە دەوڵەتێك گەشەئەکات هەوڵئەدات ناوچەی خاوەن نرخی سیاسی قوتبدات، واتە ئەو بەشانەی دەشتایین یان کەنار دەریان یان خاوەن میتاڵن (معدن).

٦-دەوڵەتی بچوك لە دەرەوە مەترسی بۆ دێت واتا دەوڵەتی گەورەی پێشکەوتوو کە ژمارەی دانیشتوانی زۆربێت ئارەزووی داگیرکردن ئەیبزوێنێت.

٧-ئارەزووی داگیکردن و وڵاتانی تر بە خۆوەلکاندن لە دەوڵەتێکەوە بەناو دەوڵەتانی تردا بڵاوئەبێتەوە.

ئەم چەند دێڕەی فەردریك هەرتزل-ی پرۆفیسۆری بەناوبانگی جوگرافیازانی ئەڵەمانی ئەرکی لێکۆڵینەوەو یەکالاکردنەوەی تیا نەهێشتۆتەوەو زۆر ڕوون و ئاشکرا

گەلی ئەڵەمان و گەلانی چاوتێبڕاو لە خاك و سامانیان لە مەبەستەکانی خۆی بێ پێچوپەنا تێگەیاندووە.

هەروەها هیتلەری قارەمانی جەنگ هەڵگیرسێنەری جەنگی دووەمی جیهان بەم جۆرەی خوارەوە گەلی ئەڵەمانی و بەتایبەتی لاوەکانی هانئەداو ئەیوت:

"گەلی ئەڵەمانیا ٨٥ ملیۆن کەسن لەسەر زەوییەکی ٦٠٠ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشە ئەژین، کەچی گەلی ئینگلیز نزیکەی نیوەی ئەم ژمارەیەن خاوەنی (٢٦) ملیۆن کیلۆمەتری چوارگۆشەن، کە واتا بە چ ڕێگایەك و چۆن ئەتوانین شیری پێویست بۆ منالآنی ئەڵەمانیا دەستەبەر بکەین".

ئنجا هەنری کابوت لوج نوێنەری پێشوتری ئەمەریکا لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و باڵوێزی کۆنی ئەمەریکا لە ڤێتنامی خواروودا ئەڵێت "دەوڵەتانی بچوك کە ئەرکی پێشکەوتنی جیهانیان بە سەرەوەیە لە پێویست زیاتر ژیاون".

وەنەبێت لە پێناوی خۆگەورەتر کردن و دەسەلآتدارێتی و زەوی نوێ پەیداکردنا هەر دەستیان بە جوگرافیاو جوگرافیای سیاسییەوە گرتبێت بەڵکو پەنایان بۆ هەموو بەشێکی زانست و زانیاری تر بردووە کە بیانکەن بە بەردی بناغە لە پێناوی جێبەجێکردن و سەرخستنی ڕێبازو ئامانج و ئاواتەکانیانا.

ئەوەتا راتزل کە لە سەرەتاوە بە مورفۆلوجییەوە خەریك بووە پەنای بردۆتە بەر تیۆرییەکانی داروین و بەم کێشوتەرازووە مەرجەکانی دەوڵەتی کێشاوەو لای وابووە کە دەوڵەت وەکو هەموو گیاندارێك هەر وەکو داروین تیۆری بۆ داناوە، گەشە ئەکات یان لەناوئەچێت وە ئەگەر دەوڵەت لە بزوتن و جوڵانەوە کەوت نە پێزی تیا ئەمێنێت و نە خاسییەتەکانی.

ئەوەی ڕاست بێت دەربارەی ئەم باسەی ئەم جارە بەشی زۆری ئایدیۆلۆژییەتی جیۆپۆلیتیکس لە خاڵێکی سەرەکی و گرنگدا ڕەنگ ئەداتەوە کە ناویاننـاوە "بایەخدارترین دەرفەت –المجال الحیوی– *Lebens Raum* دەربارەی ئەم باسە ئۆتۆماوڵ *OTTOMAULL*ی ئەڵەمانی قوتابی جەنەراڵ کارڵ هوسهوفەر ئەڵێت ".. کە جوگرافیا لە پێناوی تەشەنە کردندا بەکارئەهێنرێت جیۆپۆلیتیکس خۆی تەرخانئەکات کە چارەسەری کێشە چاوەڕوان کراوەکانی دوا ڕۆژ بکات وەکو ئایا ئەو دەرفەتەی دەوڵەت پێویستێتی جێبەجێ بووە؟ وە ئەبێ چۆن دەستی بدەیتی کە

لەگەڵ مەرجەکانی جورافیای خۆ وڵاتیدا بگونجێت؟ ئەبێ لە چ لایەکەوە گۆڕانی پێویست ڕووبدات؟

بێگومان قەوارەی نیشتمانی و ئابوری ئەو وڵاتەو سیاسەتی دەرەوەی بەپێی جۆری جێبەجێکردنی وەڵامی ئەم پرسیارانە دەستنیشان ئەکرێت.

پرۆفیسۆر راتزل کە خاوەنی قوتابخانەی جوگرافیای سیاسی ئەڵەمانی بوو لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا ئەیوت "دەرفەتی گەورە ژیان ئەپارێزێت- المجال العظیم یحفض الحیاة" ئیتر ئەم دروشمە، دروشمە دروستکراوکانی تری لە مێشکی سەرکردە نازییەکانی ئەڵەمانیادا وروژان کە "بایەخدارترین دەرفەت- *Lebens Raum* و ناوچە گەورەکان *Gross Raum* بەناوبانگترین دروشمیان بوون، نازییەکانی ئەڵەمانیا لەو بڕوایەدا بوون کە پەرەسەندن و گەشەکردنی زەوی دەوڵەت مافێکی ڕەواو بێگەردە کە وەکو ئەزانین لەو هەورازی هەزار بە هەزارەوە توڕیدانە دۆزەخی نەهاتەوەو ئەڵەمانیایان بە داگیرکردن و دابەشکردن گەیاند، دەربارەی خۆگەورەکردن و سنور بەرەو پێشەوە گواستنەوەو جێبەجێکردن و پەیداکردنی "بایەخدارترین دەرفەت- المجال الحیوی" ئەڵەمانەکان شانبەشانی گەشەکردنی هێزی سیاسی و ئابوری و عەسکەری نەخشەیان بۆ ئەکێشا.

لەم بارەیەوە فەردریك راتزل دوو جۆر باوەڕی خستە ناو ئەڵەمانییە دەسەڵاتدارەکانەوە یەکەمیان بیروباوەڕی دامەزراندنی ئەوروپایەکی گەورە دووەمیان بیروباوەڕی چەند هەرێمێکی گەورە.

دەربارەی چەند هەرێمێکی گەورە قوتابخانەی میونخ بە نیازی دەستگرتن بەسەر هەموو جیهاندا ئەم سیستەمەی خوارەوەی پێشنیاز کرد کە هەموو سەرزەمین و دەریاکانی تیا کۆبکرێتەوە.

١-ئەمەریکای گەورە بریتی بێت لە هەردوو بەشەکەی ئەمەریکای ژوورو خواروو بە سەرکردایەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

٢-ئورو ئەفەریقا: بریتی بێت لە هەموو ئەوروپا جگە لە یەکێتی سۆڤییەت وە هەموو ئەفەریقا و هەموو وڵاتانی عەرەبی ئاسیایی و تورکیا بە سەرکردایەتی ئەڵەمانیاو ئیتالیا.

٣-ڕوسیای گەورە: بریتی بێت لە بەشی زۆری یەکێتی سۆفییەت جگە لە ڕۆژهەڵاتی سیبریاو هەروەها ئێران و ئەفغانستان و هند بە پاکستانی ئێستاشەوە بەو مەرجەی ڕوسیا لەگەڵ ئەڵەمانیا ڕێکبکەوێت.

٤-ڕۆژهەڵاتی ئاسیای گەورە: ئەمیش بریتی بێت لە ڕۆژ هەڵاتی یەکێتی سۆڤییەت و چین و خوارووی ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو بۆرماو ئەندەنوسیاو ئوستورالیاو بەشی زۆری زەریای باسفیکی بە سەرکردایەتی ژاپۆن.

قوتابخانەی میونیخ-ی ئەڵەمانی لایان وابوو کە ئەم بە شانە بەم جۆرە لەیەك دوور ئەبن و هەریەکەیان خێرو بێریان سەرو مڕ بەشی خۆیان ئەکات، بۆیە تەرازووی پێوەندییەکانی نێوان ئەم دەوڵەتانە بە هیچ لایەکدا لاسەنگ نابێت و لە شەڕکردن و بەیەکدا هەڵپڕژان دوور ئەکەونەوە.

لێوردبوونەوەیەکی سەرپێیی ئەم دابەشکردنە گومان لە سیاسەتی دەستدرێژکەرانەو گەڕان بە دووی بایەخدارترین دەرفەتدا ناهێڵێت.

کە جەنەراڵ کارڵ هۆسهوفەر بڕوای تەواوی بەوە هەبێت کە بایەخدارترین دەرفەت (المجال الحیوی) مێژووی مرۆڤایەتی ئاراستە بکات وفەردریك راتزل-یش ئەندازە بچوکی وڵاتێك بکات بە پێوانەی ژێرکەوتن و لەناوچوونی دەوڵەتی ئەو وڵاتە ئیتر نابێت بیروباوەڕی داگیرکەرانەو نامرۆڤانەی نازییەکانی ئەڵەمانی کە بیروڕای ئەمانە سەرچاوەی کاروکردەوەیان بوو وەك دیاردەیەکی سەیر بێتە بەرچاومان، ئەگەر سەرنجی سیاسەتی دەرەوەو کردەوەکانی دەوڵەتە کولۆنیاڵیو ئیمپریالیستەکان بدەین بۆمان دەرئەکەوێت کە کۆن و نوێیان توندو تۆڵ دەستیان بەم دروشمانەوە گرتووەو بەپێی تواناو دەسەڵاتی خۆیان هەوڵی جێبەجێکردنیان داوە، با لە پەردەپۆشیشدا جیاواز بووبن و هەریەکەیان بە سازو ئاوازێك رایانگەیاندبێت.

ئەوەتا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەناوی ئەوەوە کە ئەمەریکا ئەبێ بۆ ئەمریکایەکان بێت و خۆیان نە چاو ئەبڕنە خاك و ئابوری کەس و نە ڕێگاش بە کەس ئەدەن چاویان تێبڕێت، بیروباوەڕی مۆنرۆ-یان بڵاوکردەوە و کردیان بە بەردی بناغەی سیاسەتی دەرەوەیان.

هەرچەندە ئەم سیاسەتە بە ڕواڵەت دەست بە هێمن خوازی گرتن و گۆشەگیری لە هەراو هوریای دووبەرەکی سیاسی نێوان دەوڵەتە ئەوروپاییەکان و شۆڕشی گەلانی ئاسیاو ئەفەریقا ئەگەیەنێت، بەلاَم ناوەڕۆك و گەوهەرەکەی بریتی بوو لە دەستگرتن بە ڕووی دەوڵەتە سەرمایەدارە گەورەکانی ئەوروپاوە کە ئیتر پەل بۆ ئەمەریکای ناوەڕاست و خواروو نەهاوێژین.

ئیتر بەم جۆرە ئەمەریکا بە جێبەجێکردنی سیاسەتی بیروباوەڕی مۆنرۆوە خۆی خزانە سەرانسەری ئەمەریکاو بەشەکانی ناوەڕاست و خوارووی کرد بە کێڵگەیەکی دەرگا خراوە سەرپشت بۆ سەرمایەداری ئەمەریکایی تازە وچان.

ئەمەریکاییەکان ئیتر دەستیان کرد بە زەویوزار کڕینی ئەو ولاَتانەو دەستیان گرت بەسەر کشتوکاڵ و میوەو کێڵگەکانیانا بە تایبەتی کاکاو قاوەو لاستیك و شەکرو کۆلاو میوەجاتە بە نرخە خاوەن فرۆختە باشەکانیان.

هەروەها دەستخستنی سامانی نەوتی مەکسیك و فنزویلاو مسی پیرۆو شیلی و توتیای پولیڤیایان بۆ خۆیان مسۆگەر کرد، بە کورتی بیروباوەڕی مۆنرۆی بە دیمەن مرۆڤ خوازانەی دژ بە ئیمپریالیزمی ئەوروپا لە ساڵی ١٩٢٠-وە تا ساڵی ١٩٤٠ ئەمەریکای ناوەڕاست و باشووری خستە ژێر دەسەلاَت و چەوسانەوەی ئیمپریالیزمی ولاَتە یەککرتووەکانی ئەمەریکاوە. ئنجا کە ئەو ولاَت و زەوی و زارو سامانانە لە ئاستی سەرمایەی گەشەکردووی ئەمەریکاوە بچوك بووەوە و تێریان پێ نەئەخوارد پەلیان هاویشت بۆ ڕۆژهەلاَتی ناوەڕاست و خوارووی ڕۆژهەلاَتی ئاسیاوە، بە ئاشکرا خۆیان کرد بە میراتگری دەوڵەتە ئیمپریالیستییە لە شەڕدۆڕاوەکانی ژاپۆن و ئەڵەمانیاو ئیتالیا، نەك هەر لە ولاَتە ژێردەستەکانی ئەم دەوڵەتە گەورانەدا بەڵکو تەنانەت لە خودی ئەو ولاَتانە خۆشیانا، ئنجا بوون بە شەریکە بەشی سەرمایەدارە گەورەکانی ئینگلیزو فەرەنساو هاوپەیمانیان.

ئێستا بەشی زۆری سەرمایەی کۆمپانیاو دامەزراوە سەرمایەدارییە گەورەکانی ژاپۆن و ئەڵەمانیاو ئیتالیا بە سەرمایەی ئەمەریکا موتوربە کراوە.

ئەمەریکا هەر بەمەوە نەوەستا بەڵکو خۆی کرد بە ڕیش سپی و پارێزەری بەناو دنیای ئازاد! دژی دەوڵەتە سۆشیالیست و پێشکەتن خوازەکان و بوو بە ئاگر خۆشکەری شەڕی نێوان شۆشگێران دژ بە شۆڕشگێڕان (مضاد الثورة).

ئەوەتا ئەبینین کلکیان دژی گەلانی ئەنگۆلاو موزەمبیق و زامبیاو کوباو نیکاراگواو هێزە شۆڕشگێڕەکانی سلفادۆرو هەموو بزوتنەوەیەکی ئازادیخوازانەی جیهان تۆز ئەکات، بە پەیمانی عەسکەری شەڕخوازانە گەمارۆی دنیای داوە وەکو پەیمانی ئەتلەنتی لە ئەورووپای ڕۆژئاواو دەریای سپی ناوەڕاست و گەروەکانی دەریای ڕەش و پەیمانی سەنتو لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا وپەیمانی ناتۆ لە خوارووی ڕۆژهەلاتی ئاسیاو پاکستان تافلیپین و ئوستڕالیا ئەمە جگە لە کۆمەڵە پەیمانێکی شەڕخوازانەی تر لە نێوان خۆی و وردەڵە دەوڵەتی کۆنەپەرست و نیوە ژێردەستەدا.

بێگومان تا سیاسەتی داگیرکەرانەو چەوسێنەرەوانەی خۆیان جێبەجێ بکەن پێویستیان بە سەرخانێکی ڕۆشنبیری و ئایدیۆلۆژی هەیە، بۆیە لە سەرەتاوە جگە لەوەی کە زۆر دەربارەی مافە ڕەواکانی مرۆڤ ئەدوان و وەك پارێزەری ئەم مافەو چارەنووسی گەلان ئەهاتنە کۆڕو گۆڕەپانی پڕوپاگەندەو ڕاگەیاندنەوە، هەندێك لە ڕۆشنبیرە سەرمایەدارەکانی ئەمەریکاش کەوتنە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی کوسموپۆلیتی، ئەو بیروباوەڕەی کە بەناوی پێشکەوتنی زانست و تەکنۆلۆجیای تازەو شت بە فیڕۆ نەدان و کەڵك وەرگرتن لە هەموو گەلان داوای دامەزراندنی یەك دەوڵەتی گەورەیان ئەکرد لە جیهاندا گوایە پارچە پارچە بوونی گەلان و فرە دەوڵەت بیروباوەڕی نەتەوایەتی و دەوڵەتانی نەتەوایەتی مرۆڤایەتی لە پێشکەوتن و گەشەکردن دوورئەخاتەوە.

بەڵام گەوهەری ئەو ئایدیۆلۆژییەتە ڕێگا خۆش ئەکات بۆ ژێردەستەکردنی گەلانی بچوك و دواکەوتوو ئێستاش کە گوایە خۆیان و ئەورووپای ڕۆژئاواو گەلانی ئازاد لە مەترسی یەکێتی سۆڤییەت ئەپارێزن، ڕۆناڵدریگن خەریکی جێبەجێکردنی پرۆژەی بۆشایی ئاسمان چەکدارکردنە دژی ساروخە دوورهاوێژەکانی سۆڤییەت بەڵام ناوەڕۆکی ئەم سیاسەتەش هەر درێژەدانە بە سیاسەتی تاکە دەسەلات لە جیهاندا.

بە کورتی وەکو دوکتۆر علی محمد المیاح-یش ئەڵێت سیاسەتی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا سەرکۆمارەکەی روناڵدریگن بێت یان کارتەر یان ترومان یان هەر کەسێکی تر هەر لەسەر ئەم دوو خاڵەی خوارەوە دائەڕێژرێت:

١-له هەر لایەكەوە مەترسی ڕووبكاتە قازانجی ئەمەریكا ئەو لایە ئەكەوێتە ناو سنوری ئاسایشی نیشتمانی ولاَتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكاوەو پێویستە چارەسەر بكرێت.

٢-پڕۆژەیەكی ئامادەكراوی هێرش بردنەسەر هەر شوێن و لایەكی پێویست ئەبێ ئامادەكرابێت و ئەبێ هەموو دەسەلاَتێكی عەسكەری و ئابوری و سیاسی و ڕاگەیاندن بۆ ئەم پرۆژەیە تەرخانبكرێت.

لە لێكۆلێنەوەو باسكردنی جیۆپۆلیتیكسدا دوو خاڵی گرنگمان بۆ ڕوونئەبێتەوە، یەكەمیان ئەوەیە كە پێڕەوكەرانی ئەم ئایدیۆلۆژییەتە ڕێكئەكەوێت دروست بن لەگەڵ یەكتریداو ڕێكئەكەوێت دوژمنی خوێنەخۆیی یەكتری بن، وەكو ئەمەریكاو بەریتانیا كە دوو دۆستن و ئەمەریكا و ژاپۆنی پێش شەڕی دووەمی جیهان و بەریتانیاو ئەڵەمانیای بەگژ یەكاچووی هەردوو شەڕی جیهانی یەكەم و دووەم. دووەمیان ئەوەیە كە پێڕەوكەرانی ئەم ئایدیۆلۆجییەتە هەموویان چ دەوڵەت بن چ پارت و ڕێكخراو لە پاڵ ناوەڕۆكی شەڕخوازی و داگیركەری و یاسای نێوان دەوڵەتان بە هیچ زانیندا ڕەگەزپەرستیشن و خۆیان بە هەڵبژاردەو شایستەی گەلان ئەزانن و بە خۆیان ڕەوا ئەبینن گەلانی تر ژێر دەستەو دەربەدەرو سەرگەردان بكەن نمونەی بێ گرێی هەردوو خاڵەكە "ئیسرائیل" قەوارەی زایۆنیستیەكان لە فەلەستین و ڕۆژهەلاَتی ناوەڕاستدا ئەخەینە پێشچاو، پێش ئەوەی دەستپێبكەین بەشی كردنەوەی باسەكە چەند وتەیەكی خاوەن بیروباوەڕی جیۆپۆلیتیكسی ئەڵەمانییەكان بە نمونە ئەهێنینەوە كە دەقاودەق بوون بە سەرچاوەی بیروباوەڕی قەوارەی زایۆنیستییەكان هەر لەو كاتەوە بیریان لە دامەزراندنی ئەم قەوارەیە كردۆتەوە تا ئەوكاتەی بە هێزی گەلانی عەرەب ئەخزێنرێنەوە شوێن و جێگای شایستە بە خۆیان.

دەربارەی سنور كە وەك گیانداری زیندوو وایە فەردریك راتزل ئەڵێت "سنور ناوچە سیاسییەكان لە یەكتری جیائەكاتەوەو ئەگەر دەرفەت (المجال) بە هێزێك بزانین ئەوا ئەبێت بە نیشانەی پێوەندی لەسەر هێز دامەزراوی نێوان دەوڵەتان".

هەروەها كارل هوسهوفەری دامەزرێنەری پەیمانگای جیۆپۆلیتیكس كە سنورمان پێ ئەناسێنێت ئەڵێت "سنوور نیشانەی مەرجەكانی هێزی سیاسییە لەكاتی خۆیدا" واتا بە پێی دەسەلاَتی سیاسی ئەوكاتەی خۆی سنوور دەستنیشان

ئەکرێت بە فراوان بوون یان بچوك کردنەوەی، ئنجا نیتشە فەیلەسوفی ڕەگەزپەرستی ئەڵەمانی و خاوەنی تیۆری "*Super man*" پیاوی هەڵبژاردەو "*Super stata*" دەوڵەتی هەڵبژاردە" لە کتێبی "زەردەشت وای ئەوت"دا ئەڵێت "ئاشتیخوازی بکەن بە هۆیەك بۆ نوێکردنەوەی جەنگ و چاکترین ئاشتی ئەوەیانە کە تەمەن کورت بێت، من ڕێگای ئاشتیتان نیشان نادەم بەڵکو ڕێگای سەرکەوتن، با کردەوەتان هەر خەبات بێت و ئاشتیتان هەر سەرکەوتن بێت" بە گشتی لەو بیروباوەڕەدا بون کە چاکترین سنور ئەوەیانە کە لە قۆناغی داهاتوودا وڵات گەورەیی دەستەبەر بکات، با لەبەر ڕۆشنایی ئەم بیروباوەڕە بزوتنەوەی زایۆنیستی و هەموو بزوتنەوەیەکی نەتەوەپەرستی و ڕەگەزپەرستانەی دنیا بەراورد بکەین و بزانین گەلەکانیان و گەلانی دراوسێ و جیهان بەرەو چ هەزار بە هەزارو کوێرەوەری و سەرگەردانییەك ئەبەن.

ئەوەی ڕاست بێت پەیڕەوکردنی سیاسەتی کۆچکردنی جولەکە بەرەو فەلەستین کە گوایە وڵاتی باووباپیرانیانە لە ساڵی ١٨٨٢وە دەستپێئەکات کە پەنجا جولەکە زۆر بە سستی و بێدەنگی ڕوویانئەکردە خاکی فەلەستین تەنانەت لە ساڵی ١٩١٥دا هەموو جولەکەی فەلەستین دانیشتوی ٣٪ی هەموو خاکی فەلەستین بوون بەڵام بە یارمەتی بەریتانیاو ئەمەریکاو هەموو دەوڵەتە ئیمپریالیستییە بەناو دیموکراتیخوازەکان و بە یارمەتی جولەکە زایۆنیستە هەرە دەوڵەمەندەکانی ئەم وڵاتانە وەکو روتشلدی ملیاردێری فەرەنسا ژمارەیان لە ساڵی ١٩٤٨دا گەیشتە نزیکەی ٣ چارەکە ملیۆن. بە پەیڕەوکردنی سیاسەتی زەوی و سنوور وەك گیاندارێکی زیندووە بۆی هەیە گەورە بێت و بۆی هەیە بچوك، بە پێی ئەوە خۆیان گەیاندە ئەو ژمارەیەو بەهێزی ئاگرو ئاسن کوشت و کوشتارو ملیۆنێك عەرەبی فەلەستینیان ئاوارەو سەرگەردانی وڵاتانی عەرەبی تر کرد کە تا ئێستا "ئەوانەو هی دوای ئەوان زۆریان لەژێر خێوەتگەدا ژیانی تفت و تاڵ و پڕ کوێرەوەری ئەبەنە سەر".

"کە سنوور ڕەنگدانەوەی هێزو دەسەڵات بێت وەکو جەنراڵ کارڵ هوسهوفەر ئەڵێت" زایۆنیستەکانی ئیسرائیل بە هاوکاری هەردوو دەوڵەت فەرەنساو بەریتانیا لە ساڵی ١٩٥٦دا هێرشێکی گەورەیان بردە سەر میسرو لە ئەنجامی ئەم هێرشەدا یەکێتی سۆڤییەت خۆی تیاکرد بە هاوکارو پارێزەری میسر و بولگانین هەڕەشە

بەناوبانگەکەی لە فەرەنساو بەریتانیا کرد زایۆنیستەکان ئەو دەرفەتە بایەخدارەیان دەستکەوت کە بە سەربەستی بە کەنداوی عەقەبەدا هاتووچۆ بکەن واتا کەنداوی عەقەبە لە ڕوو داخراویان بۆ خۆیان خستە سەرپشت.

ئنجا دوای ئەم دەستدرێژییە خوێناوییەی کردیانە سەر میسری عەبدولناسر بە یارمەتی ئەمەریکا جارێکی تر پەلاماری هەموو دەوڵەتە عەرەبییەکانی سەر سنوری فەلەستینی داگیرکراویان لە ساڵی ١٩٦٧داو لە ئەنجامی ئەم پەلامارەو شکستی دەوڵەتانی میسرو سوریەو ئەردەن و هەموو هێزە عەرەبییە بەشداربووەکانی تر ٣٦ هەزار میلی چوارگۆشەی تر کەوتە ژێر دەستی زایۆنیستەکانەوە کە بریتی بوون لە بەری ڕۆژئاوای ڕووباری ئەردەن و جۆلان و غەززەو سیناو دوو دورگەی تیران و سەنافیری دەرگای کەنداوی عەقەبە. جەنەرال عیزەر وایزمان بەڕێوەبەری پەلاماری ساڵی ١٩٦٧ دەربارەی ئاشتی ئەڵێت "پرۆژەی ئاشتی ئەم ناوچەیە هەمان پرۆژەی (هەرتزل)ە لە ڕووباری نیلەوە بۆ ڕووباری فورات".

هێزە خاوەن بڕیارەکانی ئیسرائیل هەر بیروباوەڕی کۆنی جولەکەیان بۆ خۆیان کردووە بە ڕێبازی سیاسەتی دەرەوەو عەسکەری خۆیان کە ئەڵێت "هەر جێگایەك بەری پێتانی کەوتە سەر ئەبێ بە هی خۆتان".

بێگومان ئەم شەڕانەی زایۆنیستەکان لە ساڵی ١٩٤٧-١٩٥٦-١٩٦٧دا لەگەڵ دەوڵەتانی عەرەبدا هەڵگیرسان ئامێتە بووە بە سیاسەتی جولەکە لە دەرەوە هانین لەوانە دە هەزار جولەکەی حەبەشەیی پەنابەر لە سودانەوە گواسترانەوە بۆلای خۆیان، هەروەها ئامێتە بووە بە عەرەب دەربەدەرکردن و بە تۆقاندن و کوشتن و لە جێگای خۆیان هەڵکەندن و ڕاونان و بێبەش کردن و برسی کردنی ئەو عەربانەی کە نە تۆقاندن و کوشتن وە نە پارەو پول پێدان لە جێگای خۆیان ئەیان بزوێنیت و شارو دێهاتی خۆیانیان پێچۆڵ ئەکات، لێرەدا دوو خاڵی تر خۆیان ڕاست ئەکەنەوە یەکەمیان بۆچی دەوڵەتە ئیمپریالستی و کۆلۆنیالییەکانی ڕۆژئاوا یارمەتی زایۆنیستی ئەدەن؟ دووەمیان بۆچی بیروباوەڕی زایۆنیستی جیۆپۆلیتکسی لە هەمان کاتدا حەز بە داگیرکەری و ئاوسان و گەورەبوونی قەوارەو سنورو حەز بە ڕەگەزپەرستی و ئازاردانی نەتەوەی عەرەب و گەلی فەلەستین ئەکات؟ ئایا ئەمە

ڕێڕەو و سەرەتایەکی هەمیشەیی ئەم جۆرە دەوڵەت و بزوتنەوانەیە یان هەر ڕەوشتی چەند دەوڵەت و بزوتنەوەیەکە؟!

وەڵامی بەشی یەکەمی پرسیارەکە بە مێژووی پێوەندییەکانی سەرکردەی زایۆنیستیەکان و ڕەوشت و خاسییەتە ناوکۆییەکانی ئەمان و دەوڵەتە ئیمپریالیستیو کۆلۆنیالییەکان ڕوونئەکرێتەوە.

لە ساڵی ١٩١٧دا وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بلفور پەیماننامەیەکی لە وڵاتی خۆیدا بڵاوکردەوە کە دوای سەرکەوتن بەسەر ئەڵەمانەکان و عوسمانلییەکاندا قەوارەیەکی نەتەوایەتی لە فەلەستین بۆ جولەکە دابمەزرێنن، حکومەتی بەریتانیا دەستەبەری جێبەجێکردنی ئەم پەیمانە کرد، پێش ئەم لە ساڵی ١٧٩٩دا ناپلیۆن داوا لە جولەکەکانی ئاسیاو ئەفەریقا ئەکات کە تێکەڵی هێزە عەسکەرییەکەی ببن بە مەرجێك دوای سەرکەوتن (قدس)یان بداتێ، سەرکردەکانی زایۆنیستەکانی ئەوکاتەش بەڵێنیان دا بە فەرەنسا کە لە بازرگانی نێوان خۆیان و هندستان و وڵاتانی تردا تەنیا بازرگانە فەرەنسییەکان بەشداربکەن.

ئنجا دوای لاوازبوونی بەریتانیاو فەرەنسا، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە چەك و پارە یاریۆی ئابوری خۆی کرد بە میراتگری ئەم دوو دەوڵەتە، فەرەنساو بەریتانیا. لەوەتی قەوارەی ئیسرائیل دامەزراوە خێرا خێرا ئەمەریکا پەیمان تازە ئەکاتەوە کە ئاسایش و ئاشتی ئیسرائیل لەگەڵ ئاسایش و ئاشتی ئەمەریکا جیاناکاتەوەو هەموو ساڵێك بە دزی و ئاشکرا چەند هەزار ملیۆن دۆلارێك بە خەڵات ئەدات بە ئیسرائیل جگە لە چەك و تفاقی جەنگی و پیلان و فڕوفێڵی ئەمەریکاو دەزگا جاسوسییەکانی لە وڵاتانی عەرەب و دەرەوەی عەرەبدا لە پێناوی پاراستنی ئەم قەوارەیەدا ئەم دەوڵەتە ڕۆژئاواییانە لەم یاریدەدان و زایۆنیست خوازیەدا چەند ئامانجێکیان هەیە:

١-جێگای فەلەستین زۆر جێگایەکی ستراتیجی گرنگە لە نێوان ئاسیاو ئەفەریقادا و سەرە پردێکی گرنگە بۆ پەڕینەوەی هێزی عەسکەری و کەرەسەی بازرگانی لە ئەوروپاوە بۆ ئەم دوو ئۆقیانووسە.

٢-دامەزراندنی دەوڵەتێکی وا لەسەر ئەم خاکە ستراتیجییە ئەبێت بە هۆی جیاکردنەوەی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی عەرەب لە ئاسیا لە وڵاتانی ڕۆژئاوای عەرەب لە

ئەفەریقاداو مەترسی یەکێتی نەتەوەی عەرەب و ڕزگاربوونی لە دەسەڵاتی سیاسی و ئابوری و عەسکەری ڕۆژئاواییەکان چ ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دوور ئەکەوێتەوە.

٣-ئەم قەوارەیە زایۆنیستییەکانی کردووە بە داردەستێکی کاریگەر بۆ لەناوبردن یان لاوازکردنی هەر دەوڵەت و بزوتنەوەیەکی ئازادی و پێشکەوتنخوازی گەلانی عەرەب.

٤-بووە بە سەرەپردێکی بازرگانی ڕۆژئاوا لەگەڵ گەلێك دەوڵەتی ئاسیاو ئەفەریقادا.

٥-هەر لە ئەمەریکاو ڕۆژئاوادا لە هەموو دەزگاو دامەزراوە سیاسی و ئابوری و عەسکەری و ڕۆشنبیرییەکانی ئەو وڵاتە ئیمپریالیستی و سەرمایەداریانەدا سەرمایەی بێ شوماری زایۆنیستەکان و کاربەدەست و زانایان و پیاوانی دەزگاکانی جاسوسی و ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندە تێکەڵ و ئامێتەی یەکتری بوون و هاوکارو هاودەسەڵات و هاوقازانجی یەکترین، کە زۆر بە ڕوونی ئەم یەکێتییە لە قەوارەی زایۆنیستییەکاندا (ئیسرائیل) ڕەنگیداوەتەوە لە لایەك وە لە ناو کۆمپانیا هەرە گەورەکانی ڕۆژئاوادا لە لایەکی ترەوە.

وەڵامی خاڵی دووەمیان هەر پەیوەندییەکی توندوتۆڵی هەیە بە هۆیەکانی پەیدابوونی خاڵی یەکەمیانەوە چونکە وەکو دیارە بیروباوەڕو ئایدیۆلۆجییەتی هەر دەوڵەت و هێزو پارت و ڕێکخراوێك وەکو دووکەڵی ئاگر سەرخانی ژێرخانێکی ئابوری ئەو وڵاتانەیە کە حەز بە دەستدرێژی و خۆگەورەکردن بە وڵاتان و گەلان و زەویوزاری خەڵکی تر بکەن، ئەبێ ئایدیۆلۆجییەتێکی شەڕخوازانەی دژ بە گەلانی نزیك و دوور بخەنە کارەوە تا پاکانەی خوێنڕێژی و دەستدرێژی و زۆرداری و دڕەندەییان بۆ بکات، ئەگینا چۆن بە چ ناوێکەوە ڕۆڵەی گەلانی تر دەربەدەرو سەرگەردان بکەن و هی نەتەوەکەی خۆیان بخەنە جێگایان، بۆ سەرخستنی ئەم سیاسەتە نەتەوە زۆرلێکراوەکە چەند پلەیەك لە ڕێزی خۆیان و مرۆڤی ئاسایی بەرەو پاش ئەبەن گوایا خۆیان خوا بۆ سەرکردەیی گەلانی تری ئەم دنیایەی ڕەخساندون یان ئەوان خوێنیان پاك و خاوێنەو هی گەلانی تر تێکەڵ و پیس بووە یان ئەوانی تر هەر ڕەگەز ناقۆڵاو مێشك پوچ و پێست بۆگەن و بێفەڕن، بۆیە ئەبێ نۆکەری ئەم گەلە شازادە هەڵکەوتووە لێهاتووانە بن.

مێژوو ئەو ڕاستییەی پێ سەلماندوین کە بیروباوەڕی ڕەگەزپەرستانە هەرگیز لە بیروباوەڕی داگیرکەرانە و چەوسانەوە و ژێردەستەکردنی گەلان جیاناکرێتەوە، مێژووی ڕەوشت و ڕەفتاری ئیمپراتۆرییەتە گەورەکانی گیتی هەر لە دوو سێ هەزار ساڵ بەر لە زایینییەوە تا ئێستا ئەم ڕاستییەی خستۆتە پێشچاو.

هەرچەندە کات و جێگای ئەم سیاسەتە و بیروباوەڕە جیاواز و دوورە یەکتری بن بەڵام ناوەڕۆکیان هەر بریتی بووە لە داگیرکردن و کوشتن و لەناوبردن و ئازاردان و زەوی بە زۆر لە دەست خەڵکی دەرهێنان و ئاوارەکردن و گواستنەوەی کۆمەڵانی خەڵکی ترو بە زۆر نیشتەجێکردنی بەشێکی گەلەکانی خۆیان لە شوێن کۆچ پێکراوەکان.

ئاوا بە پێڕەوکردنی ئەم ڕێبازو سیاسەتە ئیمپریالیستەکانی ڕۆژئاواو هاوکارە زایۆنیتسەکانی ڕۆژئاوا پێکەوە دەرفەتیان (المجال) لە خاکی فەلەستیندا دەستکەوت و هەر بە هۆی ئەم دەرفەتەوە تا بتوانن وێڵ و عەودالی دەرفەتی ترو گەورەتر ئەبن.

ئەوی ڕاست بێت گەلانی جیهان و ئازادیخوازان و پیاوانی خاوەن بیری ڕووناک و مرۆڤ پەروەران هەر لە کۆنەوە زۆر بە توندی بە گژ ئەم بیروباوەڕو ڕەفتارەدا چوون، ئەم دووبەرەکی و خەباتی ڕەوای گەلان دژی داگیرکردن و زەوی لە گەلانی تر داماڵین و ڕەگەزپەرستی لە هەموو ئاستێکدا هەر بەردەوامە چونکە لقێکی هەرە گرنگی ناکۆکی و دووبەرەکی نێوان دوو هێزی دژ بە یەکترییە و پێشکەوتن و سەرکەوتن و کامەرانی دواڕۆژی کۆمەڵانی زەحمەتکێشی هەموو جیهانی لەسەر بەندەو بێگومان ڕۆژێك دێت سەرخان و ژێرخانی ئەم دیاردە پیسە نامرۆڤانەیە زیندەبەچاڵ ئەکرێت.

# جیۆپۆلیتیکس و خەڵك و دەوڵەت

زانایانی جیۆپۆلیتیکس زۆر بە تەنگەوەن هێزو تواناو پایەداری دەوڵەتان تێبگەن، بە تایبەتی هی ئەو دەوڵەتانەی دوژمن و ناحەزی دەوڵەتانی خۆیانن یان حەز بە دۆستایەتی و هاوکاری کردنیان نەکەن، واتا بەرەیەکیان لەگەڵدا پێك بهێنن یان چاویان تێبڕیون بیانخەنە ژێر دەسەلاتی دەوڵەتەکانی خۆیانەوە یان هەر ڕاستەوڕاست بەشێك یان هەموو خاکەکانیان داگیربکەن و دەوڵەتانی خۆیانیان پێ گەورە بکەن.

تا لەم باسە باشتر تێبگەین پێویستە لە ڕووی فەلسەفی و یاسا (قانون)ەوە خوێنەر سەرەتایەك لە دەوڵەت و دروستبوونی و فرمانەکانی تێبگات.

وشەی دەوڵەت خۆی لە خۆیدا واتایەکی تیۆری هەیە، کە دەزگایەکە هێزی ناوچەکەی خۆی گرتۆتە دەست و ئەم هێزەش بەسەر هەموو شتێك و دەسەلاتێکی تردا فەرمانڕەوایەو خۆی لە هەموو لایەك بە خاوەن دەسەلات و خاوەن هەقتر ئەزانێت، کە نابێت کەس و هیچ هێزو توانایەکی تر لە ئاستیا سەرکێشی و ملپێچی بکات.

دیارە ئەم دەسەلاتە بێئامانەش کە مافی گرتن و کوشتن و ئازاردان و خەلاتکردنی هەیە، خۆی لە خۆیەوە بۆ خەڵکی قوت نابێتەوە، بەڵکو پشت ئەبەستێت بە ئایدیۆلۆجی و بناغەی مادی تایبەتییەوە و، لە هەموو کات و جێگایەکدا شانئەداتە سەر دوو هێزی کاریگەر لەناو کۆمەڵدا:

یەکەم: هێزی عەسکەری

دووەم: هێزی ئابووری.

هارۆڵدلاسکی بە وردی دەوڵەت لە حکومەت جیائەکاتەوە کە ئەڵێت "دەوڵەت دەزگایەو حکومەت کەسانێکن، کە بە ناوی دەوڵەتەوە فەرمانڕەوایەتی ئەکەن".

ئەوی ڕاست بێت دەوڵەت و حکومەت لە سێبەری هەموو ڕژێمێکی ناسراوی ئەم سەرزەمینەدا ئەم جیاوازییە یان لە نێواندا هەیە جگە لە کۆمەڵگا هەرە سەرەتاییەکانی ئادەمیزاد، کە بە کۆمەڵگای کۆمۆنیستی سەرەتایی ناوبانگی بڵاوبۆتەوە، لەگەڵ ڕژێمە زۆر دیکتاتۆرییەکان، کە دەوڵەت و فەرمانڕەوا لە یەکتری جیاناکرێنەوە وەکو لویسی چواردەهەمی فەرەنسا ئەیوت: "من دەوڵەتم و دەوڵەتیش منە".

جا ناکرێت ئەم فەرمانڕەوایانە بە ناوی دەوڵەتەوە ئەم هەموو دەسەڵاتەیان بێ پشتوپەناو بناغەیەکی ئایدیۆلۆجی بە دەستەوە بێت. بۆیە زانایانی یاساو کۆمەڵایەتی و فەیلەسوفە خاوەن تیۆرییە جۆراوجۆرەکان کەوتنە لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەو باسکردن و پاکانەکردن، بەڵام بە گشتی بوون بە دوو بەشەوە بەشی ئایدیالیستی (میثالی) و بەشی ماتریالیستی (مادی) یان سۆشیالیستی عیلمی.

هەر زوو ئەرەستۆی گریك وتوویەتی "دەوڵەت بۆ ئەوەیە ژیانێکی خۆش بۆ هاووڵاتیان جێبەجێ بکات".

هۆبز-یش ئەڵێت "شارستانێتی نایەتە دی ئەگەر ئەم شارستانێتییە دەسەڵاتی ژیان و مردنی بە دەستەوە نەبێت؟. جۆن لوك-یش ئەڵێت "ئەبێ دەزگایەکی گشتی فەرمانڕەوا هەبێت مافی ژیان و سەربەستی و مردنی بە دەستەوە بێت".

دوکتور (منذر شاوی) یش ئەڵێت "دەوڵەت بریتییە لە جیاوازیکردن لە نێوان فەرمانڕەواو فەرمان بەسەرداکراو".

ئەوی ڕاست بێت ئایدیالیستەکان جارێك بۆ پاکانەکردن و شیکردنەوەی ئەم باسە پەنا ئەبەنە بەر تیۆری باوکایەتی، کە دەوڵەت ئەچێتە قەوارەی باوکەوەو خەڵکیش ئەچێتە قەوارەی منالی ئەو باوکەوە واتا چۆن باوك منداڵی خۆی دێنێتە دنیاوە و پەروەردەی دەکات و پێیدەگەیەنێت و مافی تەمێکردن و سزادانی ئەو منالەشی هەیە، هەروەها دەوڵەتیش وایە خاوەنی هەمان دەسەڵاتە واتا دەوڵەت هەر خێزانە بەڵام لە قەوارەیەکی گەورەتردا.

هی تریش هەن ئەیبەستن بە میللەتەوە واتا میللەت بە پێی پەیمانێکی مۆرکراو یان بڕواپێکراو ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ یان نیوە ناڕاستەوخۆ بە ئارەزووی خۆی سەبارەت بەوەی ئەم فرمانە واتا فرمانی دەسەڵاتدارێتی لە هەموو جێگەو کاتێکدا بە هەموو ئەندامەکانی ناکرێت، داوێتییە دەست کۆمەڵێکی لێهاتوو، کە بۆ ماوەیەك و بە پێی دەستوورو یاسایەکی دیاری نیشانەکراو بەکاری فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتدارێتی بەپێی قازانجی گشتی هەڵسێت، کە هەموو ئایدیۆلۆجیستە دیموکراتیخوازەکان لەم بەرەیەدا کۆئەبنەوە.

لە سەدەکانی ناوەڕاست و پێش ناوەڕاستیشدا گەلێ ئایدیۆلوجیستی سەر بە فەرمانڕەواکانی ئەوسا فەرمانڕەوایی دەسەڵاتدارەکان و دەوڵەتیان خستۆتە پاڵ هێزی ئاسمان، گوایە ئەم دەسەڵاتدارانە لە جیاتی هێزێکی ئاسمانی یان چەند هێزێکی پیرۆزی ئاسمانی نادیار لە پێناوی خێرو خۆشی خەڵکی و ڕاگرتنی لەنگەری دادپەروەری ئەم ئەرکەیان گرتۆتە ئەستۆ.

ئەوەی کە خاوەن تیۆرییە ئایدیالییەکان لە هی تر جیائەکاتەوە ئەوەیە، کە هەمیشە سووربوون لەسەر ئەوەی کە فەرمانڕەواو دەوڵەت دادپەروەرو بێلایەنن، جیاوازی لە نێوان خەڵکیدا ناکەن، هەژارو دەوڵەمەند لای ئەوان یەکسانن. تەنیا دادپەروەری، کە لە یاساکانیاندا ڕەنگئەداتەوە فەرمانڕەوایەو بەس!! لەگەڵ ئەمەشدا لە سێبەری ڕژێمی کۆیلەییدا خاوەن کۆیلە مافی ئازاردان و ماندووکردن و گەلێ جار کوشتنی کۆیلەی هەبووە، هەروەکو لە سێبەری ڕژێمی دەرەبەگایەتیدا دەرەبەگ بە پێی یاسای دەوڵەتەکەی خۆی مافی سوخرەگەری هەبووەو جوتیار ئەبو بێدەنگ و سەنگ بەلای کەمەوە چەند ڕۆژێك لە هەفتەیەکدا سوخرە بۆ دەرەبەگ بکات. هەروەکو لە سێبەری ڕژێمی سەرمایەداریدا سەرمایەدار لە سنورێکی نیوە ئازاددا بە هێزی کرێکاری دەوڵەتەکەی خۆی سەرمایەی نوێ کۆئەکاتەوە.

بۆیە ئایدیۆلۆجیستە مەتریالییەکان و سۆشیالیستە عیلمییەکان کەوتنە خەباتێکی توندوتیژ لە پێناوی ڕوونکردنەوەی سەرەتاکانی دامەزراندنی دەوڵەت و ئامانجی دروستبوونیاندا.

ئەمانە ئەڵێن هەر دوای کۆمەڵگەی کۆمۆنیستی سەرەتایی و پەیدابوونی دوو چین، چینی چەوسێنەرو چینی چەوساوە ئیتر دەوڵەت بە شێوەی سەرەتایی پایە نزم

دروستبووەو بەرەبەرە بە دەم پێشکەوتنی ئادەمیزادو شارستانێتی و پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیاو کشتوکاڵ و پیشەسازییەوە، دەوڵەتیش وەکو سەرخانی ئەم ژێرخانانە ڕوو لە پێشکەوتن بووە، بەڵام هەمیشە نوێنەری چینی خاوەن دەسەڵات بووە، چینی خاوەن دەسەڵاتیش ئەو چینە بوو، کە ئامرازی بەرهەمهێنانی بەدەستەوە بووە، یان ڕاستتر خاوەنی ئامرازی بەرهەمهێنان بوە، ئەم خاوەنێتییە کردوویەتی بە خاوەنی دەوڵەت و ئەمجا بە خاوەنی دەسەڵاتی ماددی و عەسکەری و ئابوری، بە پێی ئەم بۆچوون و شیکردنەوەو لێکدانەوەیە فەرمانڕەوایەتی کردووەو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا گرتووەو بە پێی قازانجی خۆی بردوونی بەڕێوە.

ئیتر بە پێی بۆچوونی ئەوان دادپەروەری و یاسا پەرستی و خەڵکی چوون یەك سەیرکردن، هەموویان چاوبەست و فڕوفێڵن و قازانجەکانی ئەم چینە خاوەن دەسەڵاتانەی لە پەنادا ئەشاردرێنەوە. هەروەها ئەو ڕاستییەش ناپێچنەوە کە ئەڵێن دەوڵەتانی سۆشیالیستی عیلمی-ش هەر بە پێی ئەم ئایدیۆلۆجییەتە فەرمانڕەوایی ئەکەن و ئەڕۆن بەڕێوە، واتا دەسەڵاتی چینی خاوەن ئامرازی بەرهەمهێنان کە پڕۆلیتاریایە فەرمانڕەوایە بەسەر چین و توێژاڵەکانی ترداو دەوڵەتی سۆشیالیستی بە پێی قازانجی گشتی ئەم چینە چینی پڕۆلیتاریاو هاوکارەکانی فەرمانڕەوایی ئەکات و هەموو دەزگا ماددی و ئایدیۆلۆجییەکانی ئەم دەوڵەتە پێش هەموو شتێك قازانجی ئەمانی خستۆتە پێشەوەو بەرەبەرە چین و توێژاڵەکانی تر کە لەوەپێش دوژمن و خاوەن دەسەڵات بوون لەناوئەبات.هەروەکو دەوڵەتەکانی پێشوش لە پێناوی قازانجی چینە خاوەن دەسەڵاتە چەوسێنەرەکان هەر وایانکردووە.

ئەمجا بۆ لێتێگەیشتن لە دەوڵەت پێویستمان بەم سەرەتایەی پێشوو هەبوو لەگەڵ ئەوەشدا جیۆپۆلیتیکس لە کلاوڕۆژنەیەکی ترەوە سەیری دەوڵەت ئەکات.

دکتور محمد ریاض ئەڵێت "جیۆپۆلیتیکس ئەو فرمانەی گرتۆتە ئەستۆ کە لە دەوڵەت وەك بوونەوەیەکی عضوی بکۆڵێتەوە کە لە ئەنجامی یەکگرتنێکی دیاریکراوی خەڵکی دامەزرابێت لەسەر بەشێك لەم سەرزەمینە کە بۆی هەبێت لە چوارچێوەیەکی سیاسی دیاریکراودا پەرەبسێنێت و بکشێت یان پوچەڵ ببێتەوەو لەناوبچێت".

دوکتور علی المیاح-یش مەرجە سروشتییە پێویستەکان (العوامل الطبیعیة) و ئەو مەرجانەی پەیوەندییان بە خەڵکەوە هەیە (العوامل البشریە) بە مەرجی بنچینەیی

ئەزانێت بۆ ئەوانەی ئەیانەوێت لە جیۆپۆلیتیکس باش تێبگەن. (ئادەمیزاد یان خەڵك یان گەل یان نەتەوە).

بەڵام لەم لێکۆڵینەوەیەدا باسی بەشی دووەمیان ئەکەین واتە ئەو مەرجانەی پەیوەندییان بە خەڵکەوە هەیە یا پێیان بڵێین ئادەمیزاد یان خەڵك یان گەل یان نەتەوە.

یەکێك لە مەرجە بناغەییەکانی دەوڵەت دروستبوون ئەوەیە کە لە قەوارەی ئەو دەوڵەتەدا کۆمەڵە خەڵکێکی دامەزراو لەسەر زەوییەکی دیارو نیشانەکراو و سنوور کێشراو هەبێت کە ئەو خەڵکە قازانج و سوودیان لەو دامەزراندن و پێکەوە ژیانە دەستکەوێت. زۆر کۆمەڵانی تری خەڵك هەن پێکەوە ئەژین و ئەگەڕێن بەڵام لەبەرئەوەی بە زەوییەکی سنوور دیارو کێشراوەوە نەبەستراونەتەوە پێیان ناوترێت بەشێکی دەوڵەت یان دەوڵەتیان لێدروست نابێت وەك قەرەج (غجر) کە هەمیشە گەڕۆك و کۆچەرن.

ئەم خەڵکەش لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی ناسراودا ئەژین هەموویان لە ڕووی نەتەوایەتی و ڕەگەزو هاوخوێنییەوە یەکسان نین، بەڵکو لەهەر دەوڵەت و یان چەند دەوڵەتێکدا ڕەنگ و ڕوویەکی تایبەتییان بە خۆیانەوە گرتووە.

لە هەندێ دەوڵەتدا لە چەند وڵاتێکەوە خەڵکی کۆچیان بۆ کردووەو تیا کۆبوونەتەوەو بە هەموویان لەگەڵ هەندێ خەڵکی کۆنی وڵاتی ئەو دەوڵەتەوە گەلێکی تازەیان پێکهانیوە، یان زمانێك بووە بە زمانی یەکگرتووی ئەو گەلە، یان زمانی بەشی زۆری خەڵکە کۆچکردووەکە خۆی سەپاندووە بەسەر زمانەکانی ترداو بووە بە زمانی یەکگرتووی ئەو دەوڵەتە وەکو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ئوسترالیا کە لە هەر دوولا زمانی ئینگلیزی بووە بە زمانی یەکگرتو و سەرەکی ئەم دوو وڵاتە.

بەڵام لە هەندێ دەوڵەتی تردا خەڵکەکەی هەر لە سەرەتاوە هەموویان یەك نەتەوە و یەك ڕەگەزو یەك سەرچاوەی ڕەگەزایەتییان هەیە، یان چەند سەرچاوەیەکی بچوکی لاواز لە سەرچاوەیەکی گەورەو بەهێزو خاوەن خاسییەت و سروشتی خاوەن تواناداا تواونەتەوەو ئامێتەی یەکتری بوون و بەیەك زمان قسەئەکەن و نەتەوەیەکی تایبەتی دیارو جیاواز، لە هی تریان پێکهانیوە، کە بەم جۆرەیان ئەڵێن نەتەوە (الامم).

له هەندێ دەوڵەتی تریشدا چەند نەتەوەو ڕەگەزێك لەبەر گەلێ هۆی جۆراوجۆرو بە زۆرو بە خوایشت لە قەوارەی دەوڵـەتێکدا کۆبوونەتـەوە و ئەچنـەوە سـەر چـەند تیرەو ڕەگـەزو نەتەوەیەك بەڵام بە هـەموویان گـەلێکی یـەکگرتوو، یـان چەند گـەلێکی یـەکگرتوویان پێکـهانیوە. کـە زانایـانی جیۆپۆلیتیکـس و زانسـتی کۆمەڵایـەتی زۆر خۆیـان بـەم جـۆرە دەوڵەتانـەوە خـەریککردووەو لـەوانی تـر زیـاتر بـە لێکۆڵینـەوەو شـیکردنەوەی پتـەوی و لاوازی و کێشـەو بـەرەی نێوانـی گـەلانی ئـەم دەوڵەتانــەوە ماندوو بوون.

ئەوی ڕاستبێت وەکو نەتەوەو ڕەگەزو تیرەو زمان بابەتی سەرەتایی ئەم باسەن، هـەروەها ئـاین و بـڕوای ئاسمانی نادیـارو خواپەرستی-ش بابـەتی تـری ئـەم باسـەن، هەرچـەندە لـە کێش و پێوانـەی ئـەوانی پێشوودا نین چونکـە تـا ئێسـتا بـە ڕوونـی و ئاشـکرایی دوو دەوڵــەتی جیـهان لەسـەر بناغـەی ئـاین دامـەزراون، کـە قـەوارەی زایۆنیستی و پاکستانن.

زایۆنیستەکان ئاین و نەتەوەیان تێکەڵ کردووەو بەناوی هەردووکیانەوە کە هەر بەیـەکیان ئـەزانن، یان ئەیانـەوێت وای بخـەنە پێشـچاو، دەوڵـەتی (ئیسـرائیل)یـان بـە یارمەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ڕۆژئاوا دروستکرد.

موسوڵمانانی دەوڵەتی پاکستانی ئێستا، کە نزیکـەی پێنج یـەکی دانیشتوانی ئەوسـای هندسـتان ئـەبوون دەوڵـەتێکی ئیسـلامییان لەسـەر خـاکی ئێسـتای پاکسـتان بەنگلادیش دامەزراند ئیتر لەم دوو نمونەیە بەولاوە نمونـەی ئـاوا ڕوون و دیـار نییـە، هەرچەندە ئەندەنوسیاش دوای دامەزراندنی نازناوی ئیسلامی بە بەری دەوڵەتەکەیدا هەڵکێشا. دەوڵەتۆکە زۆر بچکۆلەکەی فاتیکانیش بۆ خزمـەتگوزاری ئاینی مەسیحی کاثولیکی باوەڕگە (مذهب) دامەزراوە.

سـەبارەت بـەوەی پسـپۆڕو زانایـانی زانسـتی جیۆپۆلیتیکـس و جوگرافیـای سیاسـی بایـەخێکی زۆریان داوە بـەم باسە چونکـە ڕاسـتەوخۆ پـەیوەندی بـە توانـاو لاوازی و پتەوی و پوچەڵی دەوڵەتەوە هەیەو ئەبێتە هـۆی گەشـەکردن و پەرەسـەندنی دەوڵەت، یان لاوازی و پوچەڵ بوونەوەو لەناوچوونی.

بۆیـە پێویسـتە لـەم باسەشـدا هـەمان بایـەخ و نرخـی هـەبێت و بـۆ خوێنـەران ڕوونبکرێتەوە.

ئەگەر پێش ئەوەی باسی هەر دەوڵەتێك، یەك یەك، بکەین، سەرنجێك بدەینە هەموو سەرزەمین ئەڕوانین کە ئێستا ٤/٥ ملیار خەڵك لە هەموو ڕەگەزو نەتەوەو تیرەو ئاینێك ئەژین، کە بە سەدان زمانی جۆراوجۆر ئەدوێن و بە وشکایی ئەم سەرزەمینەدا بڵاوبوونەتەوە و ئەم ژمارەیە لە ساڵی ٢٠٠٠ی زایینی‌دا چاوەڕوان ئەکرێت بگاتە ٦ ملیار کەس بەڵام وەنەبێت ئەم بڵاوبوونەوەیە یەك کێش و تەرازووی هەبێت، بەڵکو لە ناوچەیەکدا چڕو لە ناوچەیەکی تردا نیوە چڕو لە جێگایەکی تردا شاش بەش بووە.

بە پێی سەرژمێری بڵاوکراوە، نزیکەی ٦٠٪ی لە سێ ناوچەدا بڵاوبوونەتەوە، ناوچەی چین و ژاپۆن ناوچەی هندو پاکستان و بەنگلادیش، ناوچەی ئەوروپا.

لە سەرژمێریکی تردا دوکتۆر ریاض محمد ئەڵێت"٥٥٪ی دانیشتوانی سەرزەمین کەوتونەتە ئاسیای ڕۆژهەڵات و خواروو، ٢٥٪ی کەوتونەتە ئەوروپاو یەکێتی سۆڤییەتەوە ئەوانی تر بەسەر بەشە وشکاییەکەی تری سەرزەمیندا بڵاوبوونەتەوە، لەم جێگایانەشدا وە نەبێت چڕی و شاشی بڵاوبوونەوەیان چۆن یەك بێت ئەمانەش شوێنی زۆر چڕو نیوە چڕیان تێدا هەڵکەوتووە.

ئەمجا لێرەدا کێشەیەکی تر دێتە پێشەوە کە ئایا ئەو خەڵکەی لە وڵاتێکدا بە چڕی ئەژین، خاکی وڵاتەکەیان ژیان و گوزەرانیان مسۆگەر ئەکات؟ چڕی و شاشی دانیشتوانی دەوڵەتێك بۆیان ئەبێت بەخێر، یان بە کوێرەوەری؟

کاربەدەستانی ئەم دەوڵەتانە بە چ شێوەیەك چارەسەری کێشەی ژیان و گوزەرانی خەڵکی دەوڵەتەکەیان ئەکەن؟

ئەگەر چاوێك بە مێژووی کۆنی ئادەمیزاددا بگێڕین گەلێك نمونەی جۆراو جۆرمان دێتە پێشچاو کە ئەبنە وەڵامی ئەم پرسیارانە.

هەندێك دەوڵەت هەوڵیانداوە بکشێن بەسەر خاکی دراوسێکانیانداو بەم ڕێبازە چارەسەری کەم دەرامەتی خۆیان بکەن یان هەر خۆیانی پێ فرە سامان بکەن، وەکو ئیمپراتۆریەتەکانی ڕۆمانی و فارسی و مەغۆل..

هەندێکی تریان لە دەریاکان پەڕیونەتەوەو خاکی گەلانی تریان داگیرکردووە، وەك ئەثینایییەکان و پورتوغال و ئیسپانییەکان و ئینگلیزو فەرەنسایییەکان..

ئەگەر نەخشەی ئیمپراتۆریەتی ئاشوری بهێنینە بەرچاو ئەروانین کە کەوتۆتە نێوان ڕووباری فورات و شاخی زاگرۆسەوەو هی بابل هەر لە شاری بابلدا بووەو ڕۆمانییەکان لە هەرێمی لاتیوم و چینییەکان لە مێرگی خۆتان لەسەر ڕووبارێك لە تورکستانی ڕۆژهەڵاتدا بوون.

بەڵام ئەمانە بەم بەشە خاکانەی خۆیان دانەمرکاون و بەرە بەرە خۆیان بە خاکی گەلانی تر ئاوساندووە، تاکو لە پەلوپۆ کەوتوون و ئەوسا سەرەوژێر هاتونەتە خوارەوە.

دەوڵەتی ڕۆمانی لە تافی لاوێتیدا- ساڵێ دووی پێش زایینی- کشاو دەوروبەری سوریاو هەندێك بەشی وڵاتی عەرەب و ئەرمەنستانی خستە سەر خاکی خۆی تا نزیکەی دوو سەد ساڵێك دوای ئەوە هەرەسی هانی.

ئیمپراتۆرییەتی عەرەبی وەکو دوکتۆر ریاض محمد ئەڵێت "لە ساڵی ٧٥٥ی زایینیدا ئەندەلوسی لە دەست چوو، لە ساڵی ٧٩٠ز-دا مەراکیش و لە ٨٩١دا میسرو بەرقەو لە ساڵی ٩٣٤ز-دا کوردستان و وڵاتی فارس..".

بۆیە جیۆپۆلیتیکسییەکان ناتوانن ئەم لایەنەی ژیانی مرۆڤایەتی فەرامۆش بکەن، وەك چۆن پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بەکارو فرمانی ئەوانەوە هەیە ئاواش هەموو فەیلەسوف و پسپۆڕو زانایانی بەشەکانی تری زانستی هەمەجۆرەی ئادەمیزادی بەخۆیەوە خەریك کردووە.

زاناو پسپۆڕانی ئابوری لەم بارەیەوە ئەڵێن ئاستی دەرامەتی تاکە کەسێك (الدخل الفردی) سەنگ و پێوانەی پێشکەوتن و دواکەوتنی هەر دەوڵەتێکە و ئەم سەنگ و پێوانەیەش لە ئەنجاما دەستێکی گەورەی لە نەخشەکێشانی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتدا ئەبێت.

بەم پێشەکییە کورتە دێینە سەر باسی خەڵك و دەوڵەت وە ئەو مەرجانەی خەڵکی دەوڵەتێك خاوەن هێزو سامان و دەسەڵات، یان دەوڵەتەکەی پێ گەورەو ناودارو دەسەڵاتدار ئەبێت، وە دەوڵەتێکی تری پێ بێهێزو لاوازو پەککەوتە ئەبێت و دووچاری ڕمان و لەناوچوون ئەبێت.

بۆ شیکردنەوەو ئاسانکردنی ئەم بابەتە پێویستە هەردوو لقەکەی جیاجیا باسبکرێت کە بریتین لە:

## یەکەم-ئەنثرۆپۆلۆجی-

*Anthropology* علم الانسان-یان وەکو پێی ئەوترێت شارستانێتی کە بە پێی فەرهەنگی (المورد) "زانستێکە لە پەیدابوون و سەرچاوەی ئادەمیزاد ئەدوێت و بەدوای پێشکەوتن و ڕەگەزو خووڕەوشت و نەتەوەو ئایینی ئادەمیزادا ئەگەڕێت و خەریك ئەبێت".

بەلای زانایانی جیۆپۆلیتیکس و سیاسەتمەداران و زانستی کۆمەڵایەتییەوە هەر لقێك لە لقەکانی زانستی ئادەمیزاد (ئەنثرۆپۆلۆجی) نرخ و بایەخێکی گەورەی دەربارەی هێزو توانای دەوڵەت هەیە چ لە کاتی ئاشتی یان لەکاتی شەڕدا. ئەو دەوڵەتانەی ئەم لقانەیان بە ڕێکوپێکی تیا گونجاون ڕوو لە پەرەسەندن و گەشەکردنن بە پێچەوانەی ئەمەشەوە ئەوانی تر هەمیشە خەریکی سازکردنی کێشەو تەنگوچەڵەمەو گیروگرفتن.

هەروەها هەر دەوڵەتە بە پێی مەرج و دەرفەتی تایبەتی خۆی و هەڵکەوتی مەرجەکانی تری وەکو جێگەو شوێن و ڕووبارو دەریاو سنوورو دراوسێ و پیتو بەرەکەتی خاکەکەیەوە دەربارەی خاڵەکانی ئەنثرۆپۆلۆجی یەك یەك جوڵاوەتەوە. لە هەندێ وڵاتدا وەکو وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا سیاسەتی چاوپۆشی و نەرمی بەکاردەهێنرێت و لە هەندێ وڵاتی تریشدا ئەوپەڕی توندوتیژی فەرمانڕەوا ئەبێت، جا سەبارەت بەوەی کە بابەتی باسەکەمان پەیوەندی بە چەند خاڵێکەوە هەیە وا لە خوارەوە باسی هەرە گرنگەکانی ئەکەین:

١-ڕەگەز (**السلالە**): زانایانی کۆن بە پێی ڕەنگی پێست و مووی سەرو شێوەی سەرو دیمەنی دەرەوەیان ئادەمیزادییان کردووە بە سێ بەشەوە:

أ-ڕەگەزی سپی قەوقازی.

ب-ڕەگەزی زەردی مەغۆلی.

ج-ڕەگەز ڕەشی زنجی (قولەڕەش).

هەندێ زانایان هەر ڕەگەزێکیشیان کردووە بە چەند بەشێکەوە وەکو ڕەگەزی سپی قەوقازی کە ئەڵێن بەشی نۆردی و ئەلپی و دەریای سپی ناوەڕاستن.

ئەوی ڕاست بێت ئەم ڕەگەزانە هەر لە شێوەی پێست و مووی سەرو هەندێ دیمەنی دەرەوەی لەشی مرۆڤدا جیاوازییان هەیە، دەنا لە زیرەکی و تواناو کارو فرمانی هەموو بەشەکانی ئەندامی لەشی مرۆڤدا تێکڕا وەکو یەکن. لە لایەکی تریشەوە سەدان ساڵە ئەم ڕەگەزانە تێکەڵی یەکتری ئەبن و ژن و ژن خوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە، کە هیچ ڕەگەزێك نەماوە بە خاوێنی مابێتەوەو لەگەڵ ڕەگەزی تردا تێکەڵ نەبووبێت.

بەڵام دەوڵەتە گەورەکان چ بەرامبەر گەلانی ترو چ لەناو خۆیاندا لە سێبەری ڕژێمی چینایەتی چەوسێنەردا ئەم بابەتەیان بە شێوەیەکی تاڵ و ناخۆش بەکارهێناوەو ئێستاش لە پاش ئەوەی مرۆڤایەتی هەنگاوی گەورەی لە کۆڕی شارستانێتیدا بەرەوپێش هەڵهێناوە کەچی ڕەگەزپەرستی لە زۆر وڵاتی جیهاندا کەموزۆر جێپێی بەجێماوە و بەشێکی زۆری مرۆڤ هەندێجار لەژێر پەردەی جیاوازی ڕەگەزو هەندێجار لەژێر پەردەی جیاوازی نەتەوەدا ئەچەوسێنرێنەوە.

ئەوەتا لە وڵاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکا کە خۆیان بە پارێزەری دنیای ئازاد ئەزانن! ئاگایی ڕەگەزناسی (شهادة الجنسية) بە پێی خۆبەستنەوە بە خاکی ئەمەریکاوە ئەدەن بە هاونیشتمانەکەیان کەچی تا ئێستا لە چەند پارێزگایەکی خوارووی ئەم وڵاتەدا بە ئاشکراو بە پێی یاسای تایبەتی ئەو پارێزگایانە ڕەگەزپەرستی ئەکەن و ڕەش پێست و بۆر پێست لەگەڵ سپی پێستدا لە کارو فەرمانو قازانج و خێرو خۆشی وڵاتەکەیان جیاوازییان لەگەڵدا ئەکرێت.

هەروەها لە خوارووی ئەفەریقادا سپی پێستانی ئەوروپا بە زۆرەملێ خاکی ئەفەریقاییەکانی ئەو وڵاتەیان داگیرکردووەو بە پێی ڕەفتارێکی نامرۆڤانەش، کە بە پێی دەستوورو یاسایەکی بۆ دانراو ئەجوڵێنەوە، ئازاری ئەفەریقاییەکان ئەدەن و ئەیانچەوسێننەوەو دەرگەی زیندان و کوشتن و برین و تۆقاندنیان لێخستونەتە سەرپشت.

هەروەها لە زۆر وڵاتی تر کە بە پێی ئەم دابەشکردنە لە هەمان ڕەگەزیشن لەژێر پەردەی جیاوازی نەتەوایەتیدا بەشە دەسەڵاتدارەکەی نەتەوەیەك، یان گەلێکی گەورە، نەتەوەو گەلێکی بچووك ئەچەوسێنێتەوە.

ئەم سیاسەتە بەلای زانایانەوە باری دەوڵەت لاسەنگ ئەکات و هێزو توانای بەرەوخوار ئەبات و لە کاتی شەڕدا هەلی زێڕین ئەداتە دەست دوژمنەکانیان، جگە لەوەی کە ڕۆڵەی ئەم گەل و نەتەوە زۆرلێکراوانە بە دڵ پارێزگاری ئەو وڵاتانە ناکەن و بە نارەزوو لە ریزی لەشکری ئەو وڵاتانەدا ناجەنگێن.

ئەمە جگە لەوەی کە ناوەرۆکی نامرۆڤانەی ئەم سیاسەتە ڕاستەوخۆ جێگا پەنجەی لە قەوارەی ئەو دەوڵەتانەدا دیارە، لە پەیوەندییە دەوڵەتییەکانی ئەم دەوڵەتە ڕەگەزپەرستانەو دەوڵەتانی جیهانیشدا ڕەنگیداوەتەوە. وەکو چۆن هەموو دەوڵەتانی جیهان جگە لە وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکاو (ئیسرائیل) و هەندێ دەوڵەتی ڕۆژئاوایی بە دزی کۆمەڵگای دەوڵەتانەوە دەوڵەتی ئەفەریقای خوارووی ڕەگەزپەرستیان نافەرۆز کردووە و لە ڕێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکانی جیهانیشدا نەفرەتی لێکراوە. ئەگینا ئەگەر ڕەگەزپەرستی سەرچاوەیەکی زانستی هەبوایە بۆچی ڕەش پێستان لە هەموو بەشەکانی زانستی و فرمانی مرۆڤایەتیدا لەم وڵاتانەدا کەڵکیان لێوەرئەگیرێت و بۆچی لە ڕیزی هێزە چەکدارەکانی خۆیاندا کاریان پێئەکەن؟! بۆچی قەوارەی زایۆنستییەکان بە یارمەتی ئەمەریکا زنجییەکانی حەبەشە (فلاشا) یان لە سودانەوە گواستەوە بۆ فەلەستینی داگیرکراو؟!

بۆچی کاربەدەستانی ئەمەریکاو ئیسرائیل دژ بە سامێتییان کردووە بە خوێنی سیاوەش و وازی لێناهێنن؟

بێگومان هەروەکو هیتلەرو نازیەکان لەژێر پەردەی ئەم ئایدیۆلۆجییەتەدا ڕێبازی داگیرکەریو ئاوسان و گەورەکردنی دەوڵەتی ئەڵەمانیایان گرتبووە بەر، ئێستاش هەموو دەوڵەتە ڕەگەزپەرستەکانی جیهان و جیاوازی کارەخوازەکان هەر هەمان ڕێبازو نیازیان هەیەو بۆ هەمان مەبەست دەست لە جیاوازیخوازی هەڵناگرن تا خۆیان و دەوڵەتەکەیان بە ناخی زەمیندا ئەبەنە خوارەوە!

٢-زمان: ئاشکرایە کە زمان دیاردەیەکی گرنگ و پێویستی شارستانێتی و پایەیەکی هەرە گەورەی پەیدابوونی نەتەوەیە، تەنانەت هەندێ ڕابەرانی نەتەوەپەروەر پێش مەرجەکانی تری پەیدابوونی نەتەوەی ئەخەن. لەم بارەیەوە ساطع الحصری نەتەوەپەروەری گەورەی عەرەب دەربارەی نەتەوەی عەرەب ئەڵێت "مەرجە بنچینەییە دروستکەرەکانی نەتەوە زمان و مێژوویەکی یەکگرتووە کە لە ئەنجامی ئەمەشەوە هەست و ئاوات و ئازاری هاموبی لێئەوەشێتەوە". واتا بایەخێکی ئەوتۆی نەداوە بە خوێن، یان ڕەگەز، کە گەلێك دەوڵەتی عەرەب خوێنیان کردووە بە سەرچاوە بۆ پێناسینی هاوڵاتێکی عەرەبی لە وڵاتەکانیاندا وە بە هۆی خوێن و ڕەگەزەوە ئاگایی ڕەگەزناسی (الجنسیە) بەهاوڵاتیانی خۆیان ئەدەن. بنچینەی بڕواکەشی لەبەرئەوەیە کە ئەڵێت "بەشی زۆری عێراق و شام و هەموو بەشەکانی باکوری ئەفەریقا- هەر لە میسرو سودانەوە تا ئەوپەڕی مەغریب - عەرەب نەبوون و نەکراون بە عەرەب تا دوای ئیسلام".

هەروەها ڕابەرانی ئایدیۆلۆجییەتی سۆشیالیستی عیلمی-ش هەر زمانیان بە مەرجێکی بنچینەیی زانیوە کە دەربارەی پەیدابوونی نەتەوەو مەرجە سەرەکییەکانی دوواون.

دکتۆر محمد ریاض ئەڵێت "زمان شیرازەیەکی گرنگە گەلانی عەرەبی لە ئۆقیانوسەوە تا کەنداوی عەرەب کردووە بەیەك نەتەوە". چونکە یەکێتی زمان پایەیەکی گەورەیە لە دامەزراندنی یەکێتی بیروباوەڕو یەکێتی ڕۆشنبیری هەموو نەتەوەیەکدا.

هەروەها دوکتۆر علی المیاح-یش ئەڵێت "زمان چاکترین و کاریگەرترین هۆیە، لە کۆڕی جیاکردنەوەی گەلێك لە گەلێکی تر، ئەبێتە پایەیەکی گرنگ بۆ یەکگرتنی کۆمەڵان، پێچەوانەکەشی جیابوونەوە دێنێتە کایەوە".

وەکو خۆشمان سەرنج ئەدەین نەتەوەی کورد پاراستنی زمانی خۆی بە مەرجی سەرەکی بایەخداری مافی خۆی داناوە، بۆیە لە هەموو نەتەوەکانی دراوسێیی پتر دەستی بە زمانی خۆیەوە گرتووەو ئەیپارێزێت و گەشەی پێئەکات و لە فەوتان و لاوازبوون دووری ئەخاتەوەو لە ماوەیەکی زۆر کەمدا لە کۆڕی پەرەپێدان و پێشکەوتندا هەنگاوی گەورە گەورەی پێهەڵهێناوە. هەروەها

پێشخستن و خاوێنکردنەوەی زمانی کوردی کردووە بە نیشانەی پێشکەوتنی نەتەوەی کورد بە تێکڕایی.

لەبەرئەوە ئەو دەوڵەتانەی کە بە یەك زمان قسە ئەکەن لای جیۆپۆلیتیکسییەکان پایەیەکی بەهێزیان بۆ خۆیان دەستەبەر کردووە، بە پێچەوانەی ئەمەوە فرەزمانی لە وڵاتێکدا لایان ئەبێتە هۆی گۆبەندنانەوە، ئەوی ڕاست بێت هەندێ جار زمان کراوە بە بەڵگەو بیانوو بۆ بەسەر وڵاتاندا کشان (التوسع) وەکو هیتلەر کاتێ خۆی بە بیانووی زمانی ئەڵەمانییەوە هەندێ وڵات و ناوچەی خستە سەر خاکی ئەڵەمانیا، دەوڵەتە ئەورووپاییە ڕۆژئاواییەکان لە ترسی هێزە چەکدارە بەسامەکەی ئەڵەمانیا دانیان نا بەودی ئەڵمانیا بە ئاشتی نەمساو سوید و هەندێ ناوچەی تر تێکەڵی خاکی ئەڵەمانیا بکات.

بێگومان لە وڵاتێکدا گەلێك بە چەند زمانێ قسە بکات و سێبەری ڕەگەزپەرستی و کۆنەپەرستی و جیاوازیخوازی بەسەر ئەو وڵاتەدا کێشابێت ئەوا ئەم فرە زمانییە ئەبێتە مایەی شەڕو ئاژاوەو گێروگرفت. بەڵام ئەگەر یەکسانی و مرۆڤخوازی و دیموکراتییەت فەرمانڕەوا بێت ئەوا فرەزمانی گەلی وڵاتێك ئەبێتە هۆی ئاڵوگۆڕی شارستانییەت و زانست و ڕۆشنبیرێتی لە نێوان گەلانی یەککگرتووی ئەو وڵاتانەدا وەکو لە سویسرە بە چوار زمان قسە ئەکەن و هەر چوار زمانەکەش لە ئاستی دەستوورو یاسای دەوڵەتی سویسرەدا هاوتاو هاوسەنگن کە ئەمانەن، زمانی فەرەنسایی و ئیتالی و ئەڵەمانی و ڕۆمانی کۆن.

هەروەها لە هندستان سەرەڕای ئەوەی ٤٧٪ی خەڵکی هندستان بە زمانی هندی ئەدوێن، لەگەڵ ئەمەشدا دەستووری هندستان دانی بە (١٥) زمانی سەرەکی و ٧٢٠ دیالێکت و ٤٢ زمانی بچووك و ٢٣ زمانی عەشیرەتداناوە.

لە بەلچیکا دوو زمانی هاوتا بە پێی دەستووری بەلچیکا هەیە زمانی فلمنك لە باکوری وڵات کە ئەچێتەوە سەر زمانی ئەڵەمانی و زمانی والون لە باشوری وڵات کە ئەچێتەوە سەر زمانی لاتینی.

بۆیە پێویستە کە سیاسەتی دەرەوەی هەر وڵاتێك و هێزی دەوڵەت و چۆنێتی خەڵکەکەی هەڵئەسەنگێندرێت سەرنج بدرێتە زمانی خەڵکەکەی و بزانرێت ئەچێتەوە

سەر زمانی چ گەلێکی ترو لەو دەوڵەتەدا چەند زمان هەیەو هەر زمانەش پەیوەندی بە زمانی چ نەتەوەیەکی ترەوە هەیە.

**٣-نەتەوەو نەتەوەی جیاجیا و کەمایەتی نەتەوایەتی:**

هەروەکو زانایانی زانستی سیاسیو کۆمەڵایەتی خۆیان خەریککردووە بە بابەت و لێکۆڵینەوەی نەتەوەو پەیدابوونی و گەشەکردنی و کێشەو گیروگرفتەکانییەوە، هەروەها زانایانی زانستی جیۆپۆلیتیکس-یش لە هەمان ئاست و ئەندازەدا بگرە هەندێ جار زیاتریش شارەزابوونی ئەم بابەتە زانستییەیان لا گرنگ و بایەخدارە.

مێژووی شەڕی جیهانی دووەم ئەم نرخ و بایەخە بە باشی ڕۆشن ئەکاتەوە کە نازییەکانی ئەڵمانی ڕەگەزی ئاری و نەتەوایەتی جەرمانییان کرد بە بەردی بناغەی پڕوپاگەندەو ئایدیۆلۆجییەتی بزوتنەوەکەیان لە دەزگا جۆربەجۆرەکانی ڕاگەیاندنی دەوڵەتی ئەڵمانیدا.

لە لایەکەوە پڕوپاگەندەیان بۆ پایەبەرزی ڕەگەزی ئاری ئەکرد لەنێو ڕەگەزەکانی تردا و لە هەمان کاتدا داوای یەکێتی و سەرکردایەتی نەتەوەی ئەڵمانییان لە دنیادا ئەکرد. هەر بە بیانووی جێبەجێکردنی ئەم نیازەوە شەڕی دووەمی جیهانییان هەڵگیرساند.

ئەوی ڕاست بێت وەکو سەرمایەدارە ئیمپریالی و مۆنۆپۆلییەکان ڕەگەزایەتی و نەتەوایەتییان بۆ داگیرکەری و چەوساندنەوەی گەلانی تر بەکارهێناوە، گەلێ نەتەوەی تر، کە خۆی دەبێ وابێت، نەتەوایەتیان، یان ڕاستتر، بیروباوەڕی نەتەوەپەروەرییان کردووە بە ئاڵای پیرۆزی پێش لەشکری خەبات و تێکۆشان، لە پێناوی ڕزگاری و سەربەستی و کامەرانیداو کردویانە بە چەکێکی کاریگەری دەم ئەڵماس لە گۆڕەپانی بەربەرەکانی ئیمپریالیزم و داگیرکردنداو لە پێناوی یەکێتی و بەختیاری سەرجەمی نەتەوەکەدا.

ئەوەتا بزوتنەوەی ئازادیخوازانەی عەرەب، یەکێتی نەتەوایەتی کردووە بە چەکی خەبات دژی ئیمپریالیزم و داگیرکردن و بەشبەشکردنی خاکی عەرەب هەروەها گەلی فەلەستین، هەموو گەلانی عەرەبی کردووە بە دوژمنی ئیمپریالیزمی ئەمەریکاو داگیرکەرە زایۆنیستییەکان.

هـــەروەها نەتـــەوەی کوردیـــش ڕێگـــای بزوتنەوەیـــەکی ئازادیخوازنـــەی پێشکەوتنخوازی لە پێناوی ڕزگاری و مافی نەتەوایەتی ڕەواو بەختیاریدا گرتۆتـە بـەرو بزوتنەوەکـەی خسـتۆتە ئاسـتی بزوتنـەوە پێشـکەوتنخوازییە مـرۆڤ پەروەرییەکانی جیهانەوە.

بێگومان بزوتنـەوەی نەتەوایـەتی دوو دەمـی تیژی هەیـە، لە ڕێبـازی ئـازادی و بـەختیاری و مرۆڤپـەروەریدا لـەنێو گـەلانی ژێردەسـتەو نیـوە ژێردەسـتەو تـازە ڕزگاربوودا ئەبێت بە بزوتنەوەیەکی پیرۆزی مرۆڤ دۆستانەو دژ بە ئیمپریالیزم، و لـە سـێبەری ڕژێمێکـی سـەرمایەداری گـەورە، یـان بـە پێـی ئایدیۆلۆجییـەتێکی ڕەگەزپەرسـتانەی کۆنەپەرسـتانە، ئەچێتـە ئاسـتی بزوتنەوەیـەکی دوژمـن بـەخێرو خۆشی و کامەرانی ئادەمیزادەوە.

بێگومان نەتەوە، یان خەڵك، یان گەلان مەرجی بنـەڕەتی پـەیدابوونی دەوڵـەتن و بـەبێ ئەمانـە دەوڵـەت دروسـتنابێت، بۆیـە ئـەبێ لـە واتاکـانی تێبگـەین و هـەندێ نمونەیان لەسەر بهێنینەوە.

زانایـانی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی هەریەکـە بـە جۆرێـك باسـی نەتـەوە ئەکـەن هەرچەندە مەرجـە بنچینەییـەکانی هـەموویان لـە چـەند خـاڵێکی نـاوکۆییدا خۆیـان ئەگرنەوە.

نەتەوەپەروەری بەناوبانگی عەرەب ساطع الحصری دوو مەرجی سـەرەتایی بۆ نەتەوەناسین داناوە، زمانی یەکگرتو و مێژوویەکی ناوکۆیی، هەروەها ئـەڵێت کـە ئـەم دوو مەرجە هاتە کایەوە هەستێکی نەتەوایـەتی و ڕۆشـنبیری یـەکگرتووش دێتـە نێـو کۆمەڵانی خەڵکی نەتەوەکەوە. بەڵام ستالین کە باسی نەتـەوە ئـەکات ئـەڵێت "کۆمەڵـە خـەڵکێکی دامـەزراوی ناکۆچـەرن زمـانێکی یـەکگرتوو خـاکێکی دیـاریکراوو ئابوورییەکی ناوکۆییو مێژوویەکی ناوکۆییان هەیە و ژیانێکی ڕۆشـنبیری نـاوکۆیی کە بە هەستی ناوکۆیی دەریئەبڕن".

بـەڵام دوکتـۆر صـلاح الدیـن علـی الشـامی ئـەڵێت "نەتەوایـەتی کـە بڵاوبۆتـەوەو بووە بە پایەیـەکی سەرەتایی قەوارەی سیاسی پێدانەمەزرێت بریتییـە لـە زمـانێك و مێژوویـەك و مـیراتێکی نـاوکۆیی، کۆمەڵـە خـەڵکێکی پـێ بەیەکەوە ئەبەستێت".

ئەوی ڕاست بێت گەلێك لە زانایان كە خۆیان بە خەڵك و گەل و نەتەوەو دەوڵەتەوە ماندوو كردووە گەلێ جار ئەمانەیان، یان واتاكانیان لێ تێكەڵاو ئەبێت، نەتەوە ئەكەن بە گەل و گەلان ئەكەن بە نەتەوەو نەتەوەی بچوك ئەكەن بە كەمایەتی نەتەوایەتی، یان هەر بە كێش و پێوانەیەكی تر واتای نەتەوە لێكئەدەنەوە بۆ نمونە ئەوانەی بە ئایدیۆلۆجییەتی ئاینی ئیسلامییەوە بەندن هەموو موسڵمانانی جیهان بەیەك نەتەوە ئەزانن، هەندێك لە هەر وڵاتێكدا هەر نەتەوەیەك لە چ ئاستێكدا لە نەتەوەیەكی تر بچوكتر بوو پێی ئەڵێن كەمایەتی نەتەوایەتی (الاقلیە القومیە). بۆیە پێویستە واتای ئەم وشانە بە ڕاستی بەكاربهێنرێت چونكە ڕاستەوخۆ واتای وشەكان پەیوەندی هەیە بە مافی ئەو گەل و نەتەوەو نەتەوەی بچوك و كەمایەتی نەتەوەوە كە ئەمیش لە شیكردنەوەو باسكردنی دەوڵەت و سیاسەتی دەرەوەو چارەنوسی گەلاندا ڕەنگئەداتەوە، كە ناوەڕۆكی بابەتی باسی زانستی جیۆپۆلیتیكسە.

وەكو لە پێشەوە باسكراوە نەتەوە ئەو كۆمەڵە خەڵكەیە، كە زمان و هەست و شارستانێتی و خاك و مێژو و ئابورییەكی ناوكۆیی و یەكگرتوویان هەبێت، ئەم واتاو ڕاستییە هیچ پەیوەندییەكی نییە بە زۆری و كەمی ژمارەی خەڵكەكەیەوە، وا ڕێكئەكەوێت نەتەوەیەك ژمارەی ملیۆنێك كەس بێت و نەتەوەیەكی تر دە ملیۆن یان سەد ملیۆن یان زیاتر.

هەروەها ڕێك ئەكەوێت نەتەوەیەك بە تەنیا لەسەر خاكێك وە لە چوارچێوەی یەك دەوڵەتدا بژی و ڕێكیشئەكەوێت دوو نەتەوەو زیاتر خاكەكانیان دابێتە دەم یەك و هەموویان لە چوارچێوەی یەك دەوڵەتی یەكگرتوو، یان فیدراڵی یان كۆنفدراڵیدا بژین، بێگومان كە دوو نەتەوە یان زیاتر لە قەوارەیەكی وادا پێكەوە ژیان هەریەكێكیان بە ژمارە لەوی تریان زیاتر ئەبێت، بەمە نەتەوە كەم ژمارەكە نابێت بە كەمایەتی نەتەوایەتی، وەكو زۆر جار زانایانی بێگانە لە باسی نەتەوەی كورددا پێی ئەڵێن كەمایەتی نەتەوایەتی كورد، بەڵكو بەم جۆرە نەتەوانە كە هەموو خاسییەتی نەتەوایەتییان لە خۆیانا كۆكردۆتەوەو لە چوارچێوەی دەوڵەتێكدا لەگەڵ نەتەوەی تردا ئەژین پێیان ئەوترێت نەتەوەی بچوك یان دووەم و سێیەم نەتەوە لە چاو نەتەوە هاوبەشەكانی تریانا، بەڵام كەمایەتی نەتەوایەتی بەوانە ئەوترێت كە لە خاكێكی ترەوە هاتبێتنە وڵاتێكی ترو لەسەر خاكی نەتەوەیەكی تر بە كۆمەڵ یان پچڕپچڕ

لەملاو ئەولای ئەو ولاتەدا بژین وەکو ئەرمەنی لە لوبنانداو تورك لە بولگاریاو جەزایری لە فەرەنسا. نەتەوەی بچوك شەریکە خاك و شەریکە بەشی تەواوی هەموو مافە نەتەوایەتی و مرۆڤایەتی و نیشتمانییە لەگەڵ ئەو نەتەوە گەورەیەی لەگەڵیا ئەژین و هەر جیاوازی کردنێك لەم شەریکایەتییەدا ئەبێتە هۆی پەیدابوونی کێشەی نەتەوایەتیو گیروگرفت پەیدابوون و ئارەزووی جیابوونەوەخوازی لەنێو نەتەوە بچوکەکەدا، کە ئەمەش قەوارەی دەوڵەتە یەکگرتووەکەی پێهەڵئەوەشێنێتەوەو دوژمنانی ئەو دەوڵەتەی پێخۆش ئەکات. هەر لەبەر ئەمەشە دەوڵەتە سۆشیالیستییە عیلمییەکان و دیموکراتیخوازەکان لە سەرەتاوە بایەخێکی گەورەیان بەم دیاردەیە داوەو دەوڵەتانی تریش چاویان لێکردرون و گەلێکیان چارەسەریان کردووەو هەندێکی تریان لە ئاست و پلەی جۆراوجۆردا رێگاو نەخشە سازکردنیان بۆ کێشاوە، هەندێك بە دامەزراندنی ئۆتۆنۆمی (الحکم الذاتی) و هەندێکی تر بە یەکێتی فیدراڵی و هەندێکی زۆر کەمیش بە کۆنفدراڵی کە ڕاستییەکەی ئەمەی دواییان زۆر کەم خۆی لە مەیدانی ماندا ڕاگرتووە.

دوکتور صلاح الدین الشامی، فەرەنساییەکانی کەنەدا ئەکات بە نمونەو ئەڵێت ئەبوایە ئەم کەمایەتییە نەتەوایەتییە هەستێکی یەکگرتووانەی لەگەڵ بەشە زۆرەکەی ئینگلیزی کەنەدا هەبوایە، دیاریکراو نابێت بە دەوڵەت و چۆنێتی ژیانی خەڵکەکەو کەموزۆری و پێشکەوتن، ژمارەو تەندروستی و ئاستی گوزەرانیان و.. هی هەر دەوڵەتێك بێهێز یان بەهێز ئەکات وە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان هەیە بە ئاستی دەرامەت و ئابوری و هێزی عەسکەرییەوە. ئەمەش بەشێکە لەو زانستییەی جیۆپۆلیتیکس لێی ئەکۆڵێتەوە.

لێرەدا زۆری و کەمی خەڵکی دەوڵەتێك و چاکی ئەو خەڵکەو دابەشبوونیان بەسەر شارو لادێداو قەوارەی چینی کرێکارو ئاستی بەرهەمهێنانی ئەم چینەو قەوارەی لاوان بە گشتی لە چاو قەوارەی منداڵ و خەڵکەکەدا لای زانایانی جیۆپۆلیتیکس و جوگرافیای سیاسی بوون بە کەرەسەی گرنگی لێکدانەوەی هێزو لاوازی هەر دەوڵەتێك، لە ئاستی ئابووری و عەسکەری و کۆمەلایەتیدا. کە ئەم زانستە پارسەنگی هەر دەوڵەتێك لەنێو دەوڵەتانی تری جیهاندا قورس و سوك

ئەکات، بەم پێیە دەوڵەتانی تر پێوەندی سیاسی و ئابوری و عەسکەری خۆیانیانی لەگەڵدا ڕێکدەخەن.

لە نێو ئەم خاڵانەی پێشووی ئەم باسەدا ئاستی هاتنە جیهانی منالانی خەڵکەکەو پلەی تەمەن بایەخێکی زۆری پێدراوە، چونکە ئەو دەوڵەتانەی منالی تیا زۆر لە دایك دەبێت و کەمتر لێی ئەمرێت، هێزێکی زۆری لاوانیان دێتە بەردەست کە کەڵکیان لێوەرئەگرن لە جەنگ و لە ئاشتیدا، ئەم لاوانە لە ڕیزی بەرهەمهێنان و ڕیزەکانی سوپادا کاردەکەن.

دکتور علی المیاح بەراوردێك لە نێوان ڕوسیاو یەکێتی سۆڤییەتی ئێستا لەگەڵ ڕۆژئاوادا دەکات و دەڵێت چونکە خەڵکی ئەم ولاتەی یەکەم بەشێکی زۆریان بە کشتوکاڵەوە خەریکبوون و خەریکن حەزیان لە منالزۆری کردووە، بە پێچەوانەی گەلانی ئەوروپای ڕۆژئاواوە کە منالزۆریان پێخۆش نییە، ڕوسیاو یەکێتی سۆڤییەتی ئێستا توانیان بەسەر ناپلیۆن و هێتلەر واتا فەرەنساو ئەڵەمانیادا لە جەنگدا سەرکەون. هەروەها چین دژی پەلاماری ژاپۆن خۆی ڕابگرێت، چونکە هێزێکی گەورەی لاوانیان بە دەستەوەیە کە سەرچاوەیەکی پڕ سامانن لە کۆڕی بەرهەمهێنان و خزمەتگوزاری سوپاییدا.

ئیڤالدبرانس (*Ewald Branse*) پرۆفیسۆرو ئەندامی کۆمەڵەی زانستی و سیاسەتی عەسکەری ئەڵەمانی لە کتێبی "خەڵك و هەرێم لە جەنگی جیهانیدا *Space land peoplein the word war*" ئەڵێت "ئەگەر سەرنج بدەینە جوگرافیای جەنگ ڕاستەوخۆو بە ڕوونی بۆمان دەردەکەوێت کە ڕووداوەکان و ئەنجامی هەموو جەنگێك پەیوەندییەکی توندیان بە هەرێم و خەڵکەوە هەیە". هەروەها (تریسچك) کەیەکێکە لە هەڵگرانی مەشخەڵی هێتلەر ئەڵێت ".. ناحەزانی سیاسەتی ئێمە ناتوانن لەو ڕاستییە بگەن کە قەوارەی ئەڵەمانیا بەندە بە ملیۆنان خەڵکەوە کە لە دواڕۆژدا بە ئەڵەمانی ئەدوێن".

وتەی ئەم دووانە ڕاستەوڕاست لەگەڵ ئایدیۆلۆجییەتی جەنەراڵ هوسهۆفەری ئەڵەمانیدا جووتدەبن کە بە پێی ژمارەی خەڵکی ئەڵەمانیا بەدوای "دەرفەتی بایەخدار- المجال الحیوی"ی پێویستدا ئەگەڕا کە بوو بە هۆی هەڵگیرساندنی جەنگی دووەمی جیهان.

هەروەها بە پێی هەمان بۆچوونی جیۆپۆلیتیکسی، مۆسۆلینی لە ساڵی ١٩٢٧ وتارێکی لە پەرلەمانی ئیتالیادا خوێندەوە وتی ".. هێزی سیاسی و ئنجا هێزی ئابوری و ورەی خەڵکی بە زۆربوونی ژمارەی خەڵکەوە بەندن. ئەگەر ژمارەمان کەمبووەوە ئەوا ئیمپراتۆرییەتمان پێدانامەزرێت بەڵکو ئەبین بە ژێردەستە".

بێگومان لەبەر ڕۆشنایی لێکدانەوەیەکی جیۆپۆلیتسکانەدا زۆربوونی خەڵکی دەوڵەتێك ئەم دوو دیاردەیەی لێدەوەشێتەوە:

١-سەبارەت بە زۆربوونی خەڵکی دەوڵەتان چوونیەك نییە، بە پێی کەموزۆری ئەم خەڵکە هێزی سیاسی دەوڵەتانیش زیادوکەم ئەکەن.

٢-زۆربوونی خەڵکی ئەبێتە هۆی گەڕان بەدوای سەرچاوەی سامانی نوێی سەرزەمین.

بۆیە هەندێ زانا، زۆربوونی خەڵکی بە خێرو بەرەکەت و سەرچاوەی هێزو بەرهەمهێنان دەزانن، وە هەندێکی تریان لایاندەبێت بە گیروگرفت چونکە دەبێت خواردەمەنیان بۆ مسۆگەر بکرێت.

دەربارەی زۆربوونی خەڵکی مالثوس ئابوریزانی ئینگلیزی زۆر بەدبینانە سەیری ئەم دیاردەیەی دەکردو دەیوت:

"خەڵکی بە پێی متەوالیەی هەندەسی زیاددەکەن بەڵام بەرهەمی خواردەمەنی بەپێی متوالیەی عەددی لەبەرئەوە بۆشاییەکی گەروە لە پاش چەند ساڵێکی کەم دەکەوێتە نێوان خەڵکی و خواردەمەنییەوە کە ئەنجامێکی زۆر ڕەش و تاریکی دەبێت، بۆیە دەبێت جەنگ و نەخۆشی فرەکوژ وەکو تاعون و ڕشانەوەمان پێخۆش بێت تاکو پارسەنگی خەڵك و خواردن بگەڕێتەوە دۆخی ئاسایی خۆی". بەڵام گەلێك ئابوریناسی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی ئەو تێبینییەیان بە هیچ دەزانی و دەیانوت زانست و تەکنەلۆجیا هەمیشە بەرەوپێش دەچێ و نایەڵن ئەو جیاوازییە پەیدابێت.

ڕاستە دەیان و سەدان ساڵ لەمەوپێش کە زانست و تەکنۆلۆجیا ئاست و پایەیەکی ئەوتۆیان نەبووە، تا چارەسەری گیروگرفتەکانی ئادەمیزاد بکەن و فەرمانڕەواکانی دەوڵەتانی ئەو کاتەش دواکەوتوو و کۆنەپەرست و زۆردارو خوێنڕێژ بوون، داگیرکردن و کۆچکردنی بە کۆمەڵ لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێك و لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر یان لە جێگایەکی ئاوەدانەوە بۆ ناوچەیەکی چۆڵەوانی کردبوو بە

ڕێبازی چارەسەرکردنی کەمدەرامەتی و برسێتی و قاتوقڕی و بێبەرهەمی و فرەبوونی خەڵکی وڵاتێك، یان ناوچەو هەرێم و جێگایەك. بەڵام ئێستاو لە سێبەری شارستانێتی پێشکەوتوو و زانست و تەکنۆلۆجیای ئادەمیزادی ئەم سەدەیەدا و لەژێر سێبەری پێوەندییە مرۆڤایەتی و سیاسییەکانی نێودەوڵەتانی دنیاو بوونی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی دنیاو بەهێزبوونی بزوتنەوەی ئازادیخوازنەی گەلانی جیهانی سێیەم و بەرەی دەوڵەتانی سۆشیالیستی و بەهێزبوونی بزوتنەوەی کرێکارانی وڵاتانی سەرمایەدارو سەرجەم بەهێزبوونی بزوتنەوەی ئاشتیخوازانەی جیهان، پێویستە کێش و پێوانەیەکی تر جێگای خۆی لە کۆڕی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی ئادەمیزادا بکاتەوەو بێتە مەیدانی کارو فرمانەوە.

لەگەڵ ئەم ڕاستییەی سەرەوەشدا هێشتا پەیوەندییەکانی سیاسی و ئابوری و عەسکەری نێودەوڵەتان لە هەموو شوێنێکدا وە لەگەڵ هەموو دەوڵەتێکی ئەم جیهانەدا لەسەر پێی خۆی ڕانەوەستاوە، بۆیە زانایانی زانستی جۆربەجۆری مرۆڤایەتی بە دوو لایەنی ئەم بابەتەوە خەریکن، یەکەمیان سازکردنی گیروگرتەفکانی دیموگرافیا لە ناوخۆدا واتە هەر دەوڵەتە لە چوارچێوەی سنووری خۆیدا، دووەم پێوەندی ئەم بابەتە بە دەوڵەتانی دراوسێی دوورو نزیکەوە. بە گشتی دەربارەی دیموگرافیای خەڵکی هەر دەوڵەتێك سێ خاڵی سەرەکییان خستۆتە بەرچاو کە ئەمانەن:

**١-ژمارەی خەڵك.**

**٢-چڕی (الکثافة) دانیشتوان.**

**٣-جێگاگۆڕکێی دانیشتوان.**

ئەم جێگاگۆڕکێیە باری ئابوری و عەسکەری و بنیاتنان چۆن ئەگۆڕێت و ڕەوەندی کۆچکردن لە ناوخۆ بۆ دەرەوەو لە دەرەوە و هاتن چییان بەسەر ئەهێنێت.

پێش ئەوەی هەندێك لەم باسە بدوێین پێویستە ئەوە ڕوونبکەینەوە کە هیچ باس و بابەتێك نییە لە جیهاندا خۆی بە تاقی تەنیاو سەربەخۆ هەڵسوڕێت، بەڵکو هەموو لەگەڵ هەموو بابەتەکانی تری ئەم جیهانەدا کەموزۆر بە یەکەوە بەستراون و یەکتری پێش و دوادەخەن و بەملاو بەولادا هەڵئەسوڕێن، بۆیە پێویستە خوێنەر سەرنجی ئەم لایەنەی باسەکە بدات لەبەرئەوە ژمارە زۆری خەڵکی وەك لە پێشەوە

باسكراوه له چەند ڕوویەكەوە هێزو توانایە بۆ بەرهەمهێنان و سوپا، لە لایەكی ترەوە بە تایبەتی لەنێو دەوڵەتانی كەم سامان و كەم پێشكەوتوو دەبێت بە بارو ئەركێكی گەورە و مایەی تەنگوچەڵەمەو نائارامی سیاسی و ئابوری و پەیدابوونی یاخی بوونی عەسكەری و شەڕو هەڵلا، كەچی ڕاستییەكەی هەر هەستی كەمایەتی و یەكنەگرتنیان هەیە. ئەم هەستی ئامێتەنەبوون و تێكەڵنەبوونە پەیكەر و قەوارەی خەڵكی كەنەدەی لاواز كردووەو جیاوازیخوازی تیا جوڵاندونەتەوە.

هەروەها دكتور صلاح الدين بە كاڵ و كرچيش باسی كوردی عێراقی كردووە. بۆیە باسەكەیم نەهانیوەتە كایەوە.

ئاشكرایە بە پێی دەنگوباسی دەزگاكانی ڕاگەیاندنی دەوڵەتان چۆنێتی ژیانی فەرەنساییەكانی كەنەدا نەك هەر یەكێتی ژیان و گوزەرانی سەرجەم خەڵكی كەنەدەی بە ئینگلیزو فەرەنساییەوە شێواندووە بەڵكو پێوەندی سیاسی و پێوەندی نێودەوڵەتی دەوڵەتی كەنەدەو فەرەنساشی گرژو ناخۆش كردووە.

هەروەها دوكتور صلاح الدين سیاسەتی خۆبەگەورە زانین و بە چاوی سوك سەیری نەتەوەی بچووككردن و كەمایەتی نەتەوایەتی و چەوساندنەوەی نەتەوایەتی تاوانبار دەكات و دەیكاتە هۆی بنەڕەتی پەیدابوونی كێشەی نەتەوایەتی و ئارەزووی جیابوونەوەخوازی لە چوارچێوەی دەوڵەتێكی فرە نەتەوەدا. هەر بە پێی ئەم بۆچوونە كە بە پێی جوگرافیای سیاسی قەوارەی دەوڵەتان شیدەكاتەوە دەڵێت قەوارەی دەوڵەتان بەم جۆرەی خوارەوەن:

أ-قەوارەی بەیەكەوە بەستراوی ئاسایی:

لە ئەنجامی هەندێ مەرج و دەرفەتی تایبەتی كۆمەڵە خەڵكێكی چوونیەك و یەكگرتوو قەوارەیەكی بەیەكەوەبەستراوی ئاساییان پێكهانیوەو ڕەنگە مەرجی سروشتكار (الطبيعی)یش دەستی لەم قەوارەیەدا هەبێت. هەروەها قەوارەی وا ئەتوانێت بێگانەو خەڵكی ڕەوەكێش لە خۆیا بتوێنێتەوە.

هەروەها لەسەر باسەكەی ئەڕوات و دەڵێت قەوارەی وا دەتوانێت ببێت بە یەكێتییەكی سیاسی ئەوتۆ كە خەڵكەكەی بێ گیروگرفت لێی كۆببنەوە و، خۆیان لە ناكۆكی و دووبەرەكی دووربخەنەوەو ببن بە دامەزراوێكی كۆمەڵە ئادەمیزادێك بەردی

بناغەی چوونیەك بێت و قیافەتی قایم و یەكگرتوو. گەلی میسری كردووە بە نمونەی ئەم جۆرە خەڵك و پەیكەرە.

ب-قەوارەی یەكگرتووی تێروپڕ (المتكامل):

ئەم جۆرە بریتییە لە چەند قەوارەیەك كە قازانجی ناوكۆیی و پێویستی لە چوارچێوەی یەكێتییەكی سیاسیدا كۆكردونەتەوە. هەر قەوارەیەك خاسییەتی تایبەتی و زمان و ڕەنگ و كەلەپورو میراتی تایبەتی خۆی هەبێت. ئادەمیزاد بە چەند شتێكەوە پەیوەست بێت بەو مەرجەی قەوارە یەكگرتووەكە و، بیروباوەڕی ناوكۆیی تێروپڕ بخاتە ژوور ئەوانی ترەوە و هەر كەمتەرخەمییەك دەربارەی ئەم لایەنە یەكێتی سیاسی دووچاری ناكۆكی و دووبەرەكی دەكات و هەڕەشەی پچڕبوونی لێدەكات، بەریتانیا وەكو نمونەی ئەم جۆرە قەوارەیە دەخاتە پێشچاو كە لە چوار قەوارە پێكهاتووە، قەوارەی ئینگلیز لە ئینگلتەرەو قەوارەی سكۆتلەندی لە سكۆتلەنداو قەوارەی ویلزی لە ویلزو قەوارەی ئیرلەندی لە ئیرلەندا.

ج-قەوارەی پێكەوەلكاوی ڕێكوپێك (الكیان الملتئم المتلائم):

ئەمەش جۆرە پێكەوەبوونێكی ترە كە دەرفەت و زروف و مەرجی تایبەتی هانیوێتییە كۆڕی ژیانەوەو چەند كۆمەڵە خەڵكێكی لە قەوارەی جیاجیاو خاوەن هەست و پەیوەستی تایبەتی فڕاندووەو لە خۆی كۆكردۆتەوەو لە كۆڕێكی نوێدا جۆشی داون و لە بۆتەیەكی نوێدا هەمووی تواندونەتەوەو ڕەگ و ڕیشە كۆنەكەی لە بنەڕەتا هەڵكەندوون.

نیازی لەم قەوارەیەش وڵاتە یەكگرتوەكانی ئەمەریكاو ئوسترالیایە كە لە هەموو كوچەو وڵاتێكەوە كۆچیان بۆ كردووە و قازانجی ناوكۆیی بە یەكێوە لكاندوونی.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەڵێت هەندێ كەمایەتی جیاواز وەكو هیندییە سوورەكان و قولەڕەش و ئوسترالیاییە ڕەسەنەكان بە تەواوەتی ئامێتەی كۆمەڵە خەڵكە سپی پێستەكە نەبوون و جیاوازییان لەگەڵ دەكرێت و دووچاری چەوساندنەوە بوون.

٤-ئاین (الدین):

زانایانی ئەم باسە لەو بڕوایەدان كە ئاین دیاردەیەكی گرنگە بەشێكی زۆری كۆمەڵانی خەڵكی دنیای پێوە بەستراوەو جێپەنجەی ئەم پێوەبەستنەش لە نەخشەی

سیاسی ئەم جیهانەدا دیارە، ئەوی ڕاست بێت ئەم بایەخە لە سەدەکانی پێشوی مێژووی ئادەمیزادا بە شێوەیەکی ئاشکراو ڕوونتر ئەهاتە بەرچاو بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا ئاین ڕێبازێکی گرنگ و بایەخێکی گەورەی لە دنیادا هەیە.

لە لایەکەوە وەکو ڕێرەوێکی ئایدیۆلۆجی کە ڕابەری چاکەو خراپەو ڕەوشتی ڕۆژانەی بەشێکی هەرەزۆری ئادەمیزاد دەکات و لە لایەکی تریشەوە تا ئێستا کەموزۆر لەم کەرت و لەوکەرتی ئەم سەرزەمینەدا ڕەوشتی دەوڵەتان و پێوەندییە سیاسییەکانی نێودەوڵەتانی بەخۆیەوە خەریك کردووە.

لە زۆر جێگەی ئەم جیهانەدا ئاینخوازەکانی جیهان ڕێگای ئاشتیخوازی و دادپەروەرییان گرتۆتە بەر.

بۆ نمونە دەوڵەتە عەرەبی و ئیسلامییەکان خۆیان لە کۆنگرەیەکی ئیسلامیدا کۆکردۆتەوەو بەرنامەی هاوکاری نێو گەلانی ئیسلام و ئاشتیخوازی و پشتگیری بزوتنەوەی ئازادیخوازی گەلە ئیسلامییەکانیان کردووە بە سەرمەشقی خۆیان.

تا دێت ئایینی ئیسلام تۆزی لاوەکی کۆن لە خۆی دەتەکێنێ و دەبێتە بزوتنەوەیەکی هاوشان و هاوکاری هەموو بزوتنەوە دادپەروەرو ڕزگاریخوازەکانی تری جیهان.

ئەم لایەنەی کە ئیمپریالیست و کۆنەپەرستان بە زۆر دەیانەوێت بەسەر ئاینیا بسەپێنن و بەناوی ئاینەوە خاوەن ئاینە جۆربەجۆرەکان لە پێناوی قازانجی ناڕەوای خۆیاندا بکەن بە گژ یەکا خێرا لە ئەنجامی کردەوە ناڕاستەکانی خۆیاندا پوچەڵدەبوەوە. بۆ نمونە لە دوو جەنگی گەورەی جیهانیدا دەوڵەتانی خاوەن گەلانی مەسیحی ئاین، چوون بە گژ یەکتریداو وڵاتانی یەکترییان وێران کردوو ملیۆنان خەڵکی بێتاوانی یەکترییان لە ناهەق کوشت.

ڕاستە لە دنیادا دوو دەوڵەت و فاتیکان لەسەر بناغەی ئایینی ئیسلامی و موسایی و مەسیحی دامەزراون بەلاَم هەریەکەیان کۆمەڵە زروف و مەرج و دەرفەتی تایبەتی بەو شێوەیە قەوارەی بۆ کێشاون.

ئەم سێ قەوارەیەش دووانیان قەوارەی پاکستان و زایۆنیستییەکانە کە هەردووکیان لە ساڵی ١٩٤٧دا دامەزراون بە پێی دوو جۆر مەرج و زروفی جیاواز، هاتونەتە ڕیزی دەوڵەتانەوە.

له زۆربەی زۆری وڵاتانی دنیادا جیاوازی ئاین نەبووە بە مایەی کێشەو بەرە هەرچەندە تا ئێستا لە هەندێ دەوڵەتی دنیادا سیاسەتی جیاوازی کاری ئایینی، دەوڵەتە جیاواز کارەکانیانی بەم کێشیەوە ماندوو کردووە وەکو لوبنان و فلیپین و ئیرلەندەی ژوورو. کە ئەمەش بەلای زانایانی جیۆپۆلیتیکسەوە بۆتە مایەی گرژی و شڵەقاندنی ڕیزی خەڵکی ئەو وڵاتانەو دوژمنانیان لێهاندەدات کە بە ئاسانی زەفەر بە یەکێتی ڕیزەکانی خەڵکی ئەو وڵاتانە بەرن.

بۆیە سیاسەتی دڵفراوانی و لێبوردن و ڕێزگرتنی هەموو ئاینێك یەکێتی دەوڵەت ئەپارێزێت و پێچەوانەکەشی زیانی پێدەگەیەنێت.

### دووەم: دیموگرافی- Demography-

لە فەرهەنگی (المورد)دا دەڵێت "دیموگرافیا لێکۆڵینەوەی سەرژمێری خەڵکە دەربارەی هاتنە دنیاو مردن و تەندروستی و ژنهێنان..".

وەکو لە پێشەوە باسکراوە دەوڵەت بەبێ کۆمەڵە خەڵکێکی لەنێو دەوڵەتاندا هەروەك هەندێ جاریش ئەبێتە مایەی تێکەڵ بوونی شارستانێتی پێشکەوتوو وەبەرزبوونەوەی ئاستی شارستانیەت لە هەندێ ناوچەی تازە پێشکەوتوو، یان هەر دواکەوتوودا،

لەگەڵ ئەمانەی سەرەوەشدا ژمارەیەکی ڕێکوپێکی دامەزراو لە قەوارەیەکی گونجاو و پڕپیتوبەرەکەتوچڕییەکی ئاسایی و جیگا نەگۆڕکیٚی بێ سەرو شوێن چ دەربارەی زۆر بوونی دانیشتوان و چ کۆچ کردن لەوڵاتێکەوە یان کۆچ بۆ وڵاتێك کردن لەدەرەوە ئەبنە هێزو توانای دەوڵەتانی خاوەن ئەم مەرج و دەرفەتانەو دەوڵەتانی چاوبرسیش زۆرو زیاتر، پێش هێرش بردنە سەریان و تەماع تێ کردنیان، بیر لەکردەوەکانیان ئەکەنەوە.

لەبەراوورد کردنێکدا دکتور صلاح الدین الشامی دەربارەی چڕی خەڵکی میسر ئەڵێت: میسر، کەنزیکەی ٣٨ ملیۆن کەسە چڕی دانیشتوانی بەشێوەیەکە قورساییەکی زۆری خستۆتە سەر داهاتی وڵات. ئەم قورساییە بەهۆی زیادبوونی خەڵکیەوە ساڵ لەدوای ساڵ ئەرکی ئابووری وڵات قورس تر ئەکات، کەئەمەش

ئاستی ژیانی خەڵکی بەرەو خوارەوە خلۆر ئەکاتەوەو بەشی تاکە کەسێك لە سەرجەمی داهاتی نەتەوایەتی (الدخل القومی) بەرەو کەمی ئەبات.

هەروەها لەبەراوردێکی گۆڕان و جێگا گۆڕکێی دانیشستواندا (التغیر السکانی) دکتۆر محمد ریاض دەربارەی بەریتانیا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەلایەك و بەرازیل و هندستان لەلایەکی ترەوە ئەڵێت ((دوو دەوڵەتی یەکەمیان لەچاو جیهاندا پلەی گۆڕان تیایاندا لەمام ناوەندی کەمترە، کەچی هی دووەمیان بەپێچەوانەی ئەم دوو وڵاتەن.

ئەڵێت ئەم جێگا گۆڕکێیە تەرازوی وزەی خەڵکی ئەو دەوڵەتانە ئەشێوێنێت کە لەم کۆڕەدا دەوڵەتانی تازە پێگەیشتوو (النامی) بەشە زۆرەکەیان بەرکەوتووە کە بۆتە هۆی پەیدابوونی جیاوازییەکی دیارو فراوان لەنێوان ئەم دەولەتانەو دەوڵەتە پێش کەوتووە خاوەن زانست و تەکنەلۆجیاکاندا، کە ئێستا بۆ چارە کردنی کێشەو گیروگرفتی ئابوری نێودەوڵەتان ئەم دوو بەرە دەوڵەتە بەناوی دەوڵەتانی باکوورو باشوورەوە ووتو وێژ ئەکەن.

ئیتر بەم بەراوردکردنەی دکتۆر صلاح الدین الشامی ئەم باسە تەواو ئەکەین. دەربارەی پێوەندی نێوان ژمارەی خەڵك و قەوارەی بەرهەم هێنانی گشتی و نرخی ڕاستەقینەی کەڵك وەرگرتنی ئابوری ئەڵێت ئیتالیا پانایی وڵاتەکەی ١٧٠ هەزار میلی چوار گۆشەیەو پۆڵندە ١٢١هەزار میلی چوار گۆشەیەو عێرق ١١٧هەزار میلی چوار گۆشەیە، بەڵام دانیشتوانی ئیتالیا ٥٠ ملیۆن کەسە و پۆڵندە (٢٥) ملیۆن کەسە و عێراق (٦) ملیۆن کەس ئەبێت ((لەسەرسەر ژمێری ساڵی ١٩٥٧ ئەم ژمارانەی داناوە)) کەچی جیاوازیەکی گەورە لەنێوان بەرهەمی ئەم سێ دەوڵەتە لەقەوارەو چۆنێتیدا هەیە. ئەنجامەکەی بەوە تەواو ئەکات کە دابەش کردنی خەڵکی لەزەویەکدا بگونجێت لەگەڵ داهاتی سروشتی خاکەکەی و توانای سازکردن و بەرهەم هێنانی ئابوریانەی ڕێك و پێك، جا ئەم دابەش کردنەش لەڕوی ستراتیجی و ئامانجی پاراستنی قەوارەی یەکێتی سیاسی دەوڵەتەکەوە ئاسایی و بایەخدار بێت ئەوا هەلێکی باش بۆ ئەو دەوڵەتە دەڕەخسێت، کەشوێن و ناوێکی دیارو ئارام و بەکەڵکی هەبێت بۆ کارو باری ناوخۆیی ونێودەوڵەتی جیهانەوە.

# زەوی و دەوڵەت

لە بەشی سێیەمی ئەم باسەدا بە ناونیشانی (جیۆپۆلیتیکس و خەڵك و دەوڵەت) بە دوورو درێژی لەم باسە دواین، بە سەرەتایەك دەربارەی بنچینەی فەلسەفی و یاساو ئایدیۆلۆجی پەیدابوونی دەوڵەت باسەکەمان دەستپێکرد ئنجا چوینە سەر پێوەندی نێوان خەڵك و دەوڵەت و بیروباوەڕی زانایانی جیۆپۆلیتیکس دەربارەی ئەم پێوەندییە.

وەکو لە پێشەوە باسکرا زانایانی جوگرافیای سیاسی و جیۆپۆلیتیکس لایان وایە- کە خۆشی هەروایە- دەوڵەت بەبێ زەوی و خەڵك پەیدا نابێت، بە پێی ئەم ڕاستییە باسی پێشومان تەرخانکرد بۆ خەڵك و دەوڵەت، ئێستاش باسی زەوی و دەوڵەت ئەکەین، ئەوەی ڕاست بێت زۆرتر پێوەندی جیۆپۆلیتیکس بەم باسەوە ئەخەیە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە. چونکە پێوەندییەکی توندوتۆڵی هەیە بە زانستی هێزو توانای دەوڵەتەوە، دەربارەی دواڕۆژی هەر دەوڵەتێك کلیلی پێشبینی کردن ئەداتە دەست مرۆڤ.

لەم چەرخەو لە چەرخەکانی پێشوشداو هیچ نەبێت تا دەوڵەتانی ئیمپریالی و سەرمایەداری گەورەو چاوبرسی لەسەر ئەم سەرزەمینە بمێنن، ئەگەر لە دواڕۆژدا هی ئەستێرەکانی تری ئەم گەردونەشمان لێ قوت نەبنەوە! هەموو دەوڵەتێکی ئەم سەرزەمینە بە تایبەتی بچکۆلەو مامناوەندییەکانی ئەبێ هەمیشە دەستیان لەسەر دڵیان بێت کە دەوڵەتێکی لە خۆیان زەلام و گەورەتر پەلاماریان نەدات و دەسەڵات و سەربەستی خاك و خەڵکەکەیان پێشێل نەکات.

ڕاستە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان هەیەو کۆمەڵە دامەزراو و ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتان هەیە، هەموویان بە پێی دەستوور و یاسایەك لە لایەن دەوڵەتانی گەورەو بچوکی ئەم سەرزەمینەوە باوەڕپێکراوە، بۆ پارێزگاری ئاشتی و ئاسایشی دەوڵەتانی

جیهان خەبات ئەكەن و هاتونەتە كایەوەو ڕێبازی پاراستنی مافی ئاسایی و ڕەوای مرۆڤایەتی و پێوەندی ئاسایی و دۆستانەی ئابوری و ئاڵوگۆڕی زانست و تەكنۆلۆجیایان گرتۆتە بەرو كردویانە بەسەر مەشقی ڕەوتی پیرۆزی خۆیان، بەلاّم لەوەپێشیش ڕێكخراوی نەتەوەكان (عصبة الامم) و لەم بابەتە ڕێكخراوە هەر هەبووەو كەچی جەنگی یەكەمی جیهانی و هی دووەمیش هەڵگیرساون و چەند ملیۆن كەسێكیان تیا كوژراوەو وێرانكارییەكی زۆریشیان داوە بە كۆڵی گەلانی جیهاندا. دوای ئەم دوو جەنگە وێرانكەر و فرەكوژەش لەم كوچەو لەو كوچەیەی سەرزەمین تا ئەمڕۆژەی ئێستاشمان هەر جەنگی دووقۆڵی و چەند قۆڵی لەنێو دوو دەوڵەت و چەند دەوڵەتێكدا لەنێو دەوڵەتێك و گەلێكی بەشخوراوو زۆر لێكراودا هەر بەردەوامە.

بۆیە دەوڵەتە گەورە چاوبرسییەكان كە كشان بەسەر خاكی دەوڵەت و گەلانیان كردووە بە ڕێڕەوی سیاسەتی دەرەوەی خۆیان، بە چاوی جیۆپۆلیتیكانەوە سەیری دەوڵەتانی تر ئەكەن، هەر وەكو پێویستیشە ئەبێ دەوڵەتانی بچوك و مامناوەندی و زاناو سیاسەتمەدارانیان بە هەمان شێوە بڕواننە مەرجە سەرەكییەكانی هێزو توانای دەوڵەتەكانیان وە بە پێی ڕێبازی دواڕۆژ بیر لە نەخشەو پیلانەكانی دەوڵەتە تەماعكارەكانی تر بكەنەوە.

دوای ئەم پێشەكییە كورتە ئیتر باسی مەرجی دووەمی دامەزراندنی دەوڵەت ئەكەین واتە دوای خەڵك كە مەرجی یەكەمە زەوی ئەبێ بە مەرجی دووەمی سەرەكی.

نیاز لە زەوی ئەو پارچە زەوییەیە كە دەوڵەتێكی تایبەتی دەسەلاّتی بەسەردا ئەشكێت و تیایا فەرمانڕەوایی ئەكات، هەر دەوڵەتەش شێوازێكی تایبەتی خۆی هەیە كە لە هی دەوڵەتێكی تر ناچێت.

بەلاّم هەموو دەوڵەتان لەوەدا بەشدارن كە بناغەیان لەسەر دوو پایەی سەرەكی بەندە، خەڵك و زەوی.

ئەوی ڕاست بۆ شیكردنەوەی ئەم باسە بە پێی بیروڕای جیۆپۆلیتیكسی سێ خاڵی گرنگ دێنێتە كایەوە. یەكەمیان دەرفەتی بایەخدار (المجال الحیوی) دووەمیان كشان بەسەر زەوی خەڵكیدا (التوسع) سێیەمیان خۆپاراستن لە چاوبرسێتی بێگانەو تەماعكاران، ئەم سێ خاڵە دوانیان یەكەم و دووەم لە باسێكی سەربەخۆدا لە

پێشەوە باسکراون، خاڵی سێیەمیان خاڵێکی ناوکییە تا باسەکە تەواو ئەبێت جێگای دیارو گرنگی تیایا داگیر کردووەو ئەتوانین بڵێین گەوهەرو ناوەڕۆکی سەرجەمی باسەکەیە.

بێگومان باسی زەوی هەموو مەرجە سروشتییەکان ئەگرێتەوە کە هەر ئەتوانین لە بریتی زەوی و دەوڵەت بڵێین مەرجە سروشتییەکان و دەوڵەت، کە ئەم مەرجانەش لە جێگاو قەوارەو شێوەو ئاووهەواو پانایی و دەشتایی و شاخوداخی دەوڵەت و پیتوبەرەکەتی زەوی و کەرەسەی خاوو سنوور.. ئەدوێت. هەر خاڵێك لەم خاڵانە بە پێی سازو ناسازی و بایەخ و بێبایەخی هێزو توانای دەوڵەت ئەخەنە تای تەرازووەوە.

بۆ نمونە وڵاتێکی دوورەدەستی وەکو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەوە تێکەڵی دوو جەنگی گەورەی جیهانی ئەبێت کەچی لە هەر دوو جەنگەکەدا وەك بەرزەکی بانان بە سەلامەتی ڕزگاری ئەبێت، هەروەها پانوبەرینی وڵاتی چین ژاپۆنی لە جەنگی دووەمی جیهاندا نیوە ئیفلیج کردوو هەروەها ڕووبەری یەکێتی سۆڤییەت یارمەتییەکی گەورەی گەلی سۆڤیەتی ئەم دوایییەو ڕوسی پێشویدا کە ناپلیۆن و هیتلەر بشکێنن.

مەرجە سروشتییەکانیش پەیوەندییان بەم خاڵانەی خوارەوە هەیە کە یەکە یەکە باسیان ئەکەین.

### أ-جێگا (الموقع):

جێگای هەر دەوڵەتێك پارچە زەوی و ئاو و سنوورو هەوایەکی دیارو ئاشکرایە، بەڵام نرخ و بایەخی ئەم جێگایە بە پێی چەرخ و زەمان ئەکێشرێت و نرخی بۆ دائەنرێت، لەوانەیە لە کاتێکدا نرخدارو کاتێکی تر هەر هەمان جێگا کەم نرخ و ڕۆژێك بێت لە کۆڕی پێوەندییەکانی نێودەوڵەتاندا بێ نرخ ببێت. بۆ نمونە میسری دوای هەڵکەندنی کەنداوی سوێس پایەی سیاسی و ئابوری و عەسکەری بەرەو هەورازتر سەرکەوت، هەروەکو دوای داگیرکردنی ئەم کەنداوەو داخستنی لە ساڵی ١٩٦٧دا کە پاپۆرە گەورە نەوت کێشەکان ڕێگایان بەلای خوارووی ئەفەریقادا گواستەوە، پایەی هەمەجۆرەی میسر بەرەو لێژی خزا.

هەروەها ئەگەر نەوتی دورگەی عەرەبی وشك بكات یان هەر نەوت ئەو بایەخە ئابورییەی نەمێنێ بێگومان دورگەی عەرەبیش نرخی ستراتیجی خۆی ئەدۆڕێنێت.

دكتور صلاح الدین شامی كە باسی جێگا ئەكات دوو مەرجی لا گرنگەو بە پێویستیان ئەزانێت لە كۆڕی نرخاندنی جێگادا بخرێنە پێشچاو.

١-بە وردی لە هەر چەرخ و كاتێكدا بڕوانرێنە ئەو هەلومەرجانەی لەو كاتەدا ئەو جێگایە بایەخدار یان بێ بایەخ ئەكەن.

٢-بڕوانرێتە ئەو پێوەندییانەی نێوان ڕووبەری وڵات و ئاو و دەریاو ئۆقیانووس و ئەو پەلانەی كشاونەتە ناوو وشكاییەوە.

وەكو ئەوەی جیاوازییەكی زۆر لە نێوان قەوارەیەكی بە وشكایی دەورە دراوو یەكێكی تری سەردەیادا هەیە. ئەو دەوڵەتانەی مۆڵەتی چوونە دەریایان نەبێ سیاسەتی دەرەوەیان گەلێك جیاوازترە لەوانەی لەسەر دەریان و جێگاكانیان بۆتە مەڵبەندێكی گرنگی بازرگانی و هاتوچۆكردن لەگەڵ دەوڵەتانی تری جیهاندا.

هەروەها دوكتور صلاح الدین الشامی لەسەر باسەكەی ئەڕوات و بە پێویستی ئەزانێت خۆ لە وشكە لێكدانەوە دور بخەینەوەو ئەم سێ مەرجەی خوارەوە بكەین بەكێش و پێوانەی نرخاندنی جێگای جوگرافی و بەو پێیە شوێنی دەوڵەت بنرخێنین.

١-مەڵبەندی هاتوچۆكردنی ئابوری و شارستانێتی لە جیهانداو پەیوەندی بە دەوڵەتی باس لێكراوەوە.

٢-دەریاو ئۆقیانووس و هاتوچۆی كەشتییەوانی و بازرگانی نێودەوڵەتان لەو وڵاتەدا یان نزیك ئەو وڵاتە.

٣-دەوڵەتە هێزدارە گەورەكانی جیهان و ئەو پانایییە زەوییانەی دووبەرەكی چەكدارییان تێدایە و یان لێیان ئەوەشێتەوەو جۆری پێوەندییان بە دەوڵەتی باسلێكراوەوە.

ئەوی ڕاست بێت شارەزایانی جیۆپۆلیتیكس كە باسی هەر لایەنێكی دەوڵەت ئەكەن خێرا ڕوونەكەنە دوو لقی سەرەكی یەكەمیان باری ئابوری ئەو وڵاتەو دەرامەتی پیشەسازی و كشتوكاڵ و كەرەسەی خاوی ژێر خاك و قەوارەی خەزێنەی ئەو كەرەسە خاوانە، دووەمیان لێكۆڵینەوەی جێگای شوێنی ئەو وڵاتەو هەڵكەوتی خاكەكەی و گونجان و نەگونجانی لە كۆڕی هێرش بردن و خۆپاراستندا، واتە باری

عەسکەری ئەو وڵاتە. ئەم دوو مەرجەی سەریشەرە پەیوەندیان هەیە بە هەڵکەوتی ئەو وڵاتەوە کە ئەویش ئەم خاڵانەی خوارەوە سنوری بۆ ئەکێشن و نرخ و بایەخی ئەدەنێ یان بێنرخ و بێخێری ئەکەن.

١-هەڵکەوتی جێگاکەی بە پێی هێڵەکانی سەرزەمین:

دوورو نزیکی هەر جێگایە لە هێڵی ئاسایی یان کەمەرەی زەمین (خط الاستواء)ەوە کە بۆی ئەبێتە پیتوبەرەکەت یان دەست کورتی، بۆیە ئەو دەوڵەتانەی ئەکەونە ژووروی کەمەرەی زەمینەوەو ئاوهەوای خۆشیان هەیە، دەوڵەتی گەورەو خاوەن سامانیان تیا هەڵکەوتووە، بەڵام ئەو دەوڵەتانەی کەوتونەتە نیوەی خواروی سەرزەمینەوە دەوڵەتی گەورەیان تیا هەڵنەکەوتووە، چونکە ئاووهەوای ئەو ناوچانە ناسازن.

٢-هەڵکەوتی جێگاو ئەندازەی تەڕایی‌و وشکایی شوێنەکەی:

واتە ئاو چەندی تیا گرتۆتەوەو وشکایی چەند. ئەمە ئەوەمان نیشان ئەدات کە خەڵکی ئەو وڵاتە تا چ ڕادەیەك بە چالاکی دەریاییەوە خەریکن و چەندیش بە وشکانییەوە، ئەم زانستەش گەلێ باری هێزو تواناو ناتوانایی وڵاتێك دەرئەخات.

جگە لەوەی کێشەو بەرەی وڵاتە دەریاییەکان جیاوازییەکی دیارو ئاشکرایان هەیە لەگەڵ کێشەو بەرەی وڵاتە دوورە دەریاکان. هەروەها ئەندازەی درێژی سنوری وشکانی وڵاتێك لە چاو سنوری دەریاییدا ئەبێتە پێوانەیەکی تری ئەم باسە بەو مەرجەی سنورە دەریاییەکەی ئەو ڕاستییەی تیا رەچاو بکرێت کە تا چ ڕادەیەك بە کەڵکی هاتوچۆی دەریایی دێت و ئەسکەڵەی دەریایی بە کەڵکی تیا هەڵئەکەوێت و دراوسێکانی تری دڕو زۆردارن یان ئاسایش دۆست و هاوسێ پەروەرن، چونکە ئەم ڕاستییانە پەیوەندییان هەیە بە باری عەسکەری ئەو وڵاتەوەو ئەبنە بناغەیەکی پتەو یان بۆش لەکاتی هێرشبردن و پارێزگاریدا.

لە لایەکی تریشەوە هەندێ سنوری تر هەیە هەرچەندە کەوتۆتە سەر دەریاو ئۆقیانوس بەڵام بەشی زۆری ڕۆژانی ساڵ بەستەڵوکەو هاتوچۆی دەریایی تێدا ناکرێت وەکو سنورەکانی ژووروی کەنەداو یەکێتی سۆڤییەت کە بۆ هاتوچۆی دەریایی زۆر بێخێرن.

لەگەڵ ئەوەشدا وڵاتی بێ دەریا خۆ ئەگەر پان و بەرین بێت هەرچەندە بۆ پیتوبەرەکەت و هاتوچۆو دەرامەت بە ناتەواو ئەدرێنە قەڵەم، بەڵام دەربارەی جەنگ خاوەنانی ئەم وڵاتانە ئەتوانن دوژمنانیان بە هەندێ وریایی و چالاکییەوە لە مەیاندا ببەزێنن.. لەم بارەیەوە فردریك پاشای پروسیاو ناپلیون و شۆڕشگێڕانی ڕوسیا لە شۆڕشی بۆڵشەویکدا بە باشی کەڵکیان لە خاسییەتی جوگرافی وڵاتەکەی خۆیان بینی. جگە لەمە وڵاتی سنوور داخراوی بێ دەریا ئەبێ بۆ ئاڵوگۆڕی بازرگانی هەرچاوی لە یارمەتی دەوڵەتە دراوسێکانی بێت و پێوەندی خۆی لە گەڵیانا لەسەر بناغەی هاوکاری و دۆستانە دابمەزرێنێت تاکو بۆی ببێتە ڕێبازێ بۆ هاتوچۆکردنی هەمەچەشنە.

ئەمەش وە نەبێت هەموو جارێك و لە هەموو هەلومەرجێکدا بۆ هەموو دەوڵەتێك هەڵسوڕێت و بەم پێیە نەخشەی سیاسەتی دەرەوەی خۆی بکێشێت، بۆ نمونە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دووچاری ئەم کێشەیە نەبوون، چونکە لەگەڵ کەنەداو مەکسیکدا سنووری هەیەو ئەم سنوورەش هیچ کێشەو بەرەیەکی بۆ قوت نەکردتەوە.

بە پێچەوانەی ئەڵەمانیا کە لەگەڵ دراوسێکانیا هەمیشە گیرۆدەی کێشمەکێشی سنوور بووە تا کار گەیشتە ئەو ڕادەیەی هیتلەر هەموو یاساو ڕەوشت و پێوەندییەکانی نێو دەوڵەتان بخاتە لاوەو جەنگی دووەمی جیهانی بەرپا بکات و هەر ئەو سەرکەشییەش سەرەونگومی کرد.

هەندێ جار ناکۆکی و دووبەرەکی نێو دوو دەوڵەت بەرگێکی مێژوویی ئەکات بە بەری خۆیدا یان لایەکیان مەترسی دەستدرێژی ئەوی تریانی لێنەنیشێت تا کار ئەگاتە ئەو ڕادەیەی بیر لە دروستکردنی دەوڵەتێکی تر بکرێتەوە کە ئەو دوو دەوڵەتە لە یەکتری جیابکاتەوە، یان پارچەزەوییەکی دەوڵەتێکیان ئەخەنە سەر دەوڵەتێکی تر تاکو بەو جۆرە ئەو دەوڵەتە خاکی بگاتە ئاستێك کە دوو دەوڵەتە ناحەز بە یەکەکە لە یەکتری جوێ بکاتەوە.

وەکو ئەو پارچە زەوییە وەکو زمان خرایە سەر خاکی ئەفغانستان تا ڕوسیای قەیسەری لە هندستانی جاران و پاکستانی ئێستای جیاکردەوە، کە نیازی ڕاستەقینەی ئەم کارە جیاکردنەوەی ڕوسیاو بەریتانیا بوو.

ئەگەر ئەم جۆرە جیاکردنەوانە ڕەزامەندی دوو دەوڵەتە ناحەز بە یەکەکەی تێدا بوو ئەوا بێدەنگ ئەچێتە سەر دەنا ئەو دەوڵەتە جیاکەرەوانەش (الدول الحاجزه) ئەبنە گۆڕەپانی جەنگی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە.

جەنگیش ئەوکاتە هەڵئەگیرسێت کە دووبەرەکی گەیشتە پۆپەی ناخۆشی و چەك بەکارهێنان بوو بە پشکی نێوان هەردوولایان، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ئێران و ئەفغانستان و تایلاند بووبوون بە دەوڵەتی جیاکەرەوە، ئێران و ئەفغانستان لە نێوان ڕوسیاو بەریتانیاو تایلاندیش لە نێوان بەریتانیاو فەڕەنسادا.

جا ئەگەر دەوڵەتە جیاکەرەوەکان لاوازبوون، بەبێ پەیمانێکی نێودەوڵەتان ئەو دەوڵەتانە ناتوانن پارێزگاری دەسەڵات و سەربەخۆیی خۆیان بکەن وەکو ئێران کە لە ساڵی ۱۹۲۱دا پەیمانێك لە نێوان یەکێتی سۆڤییەت و ئێراندا بەسترا کە مافی نەوت هەڵهێنجان نەدرێت بە هیچ دەوڵەتێکی ڕۆژئاوا لە پێنج پارێزگار (استان)ی ژووری ئێراندا، هەرکاتێك هەر سەربازێکی دەوڵەتێکی ڕۆژئاوا بە نیازی داگیرکردن پێی نایە خاکی ئێرانەوە، یەکێتی سۆڤییەتیش ئەو مافەی ئەبێت لەشکری خۆی بنێرێتە ئێرانەوە، ئەمە جگە لە هەندێ بەندی ئاڵوگۆڕی بازرگانی و هاوکاری هونەری و زانستی. بەرامبەر ئەم ڕێککەوتننامەیەی نێوان ئێران و سۆڤییەت کە لە جەنگی دووەمی جیهانیدا لەشکری سووری سۆڤییەت ئازربایجان و کوردستانی ئێرانی داگیرکردو دوو دەوڵەتی دیموکراتی لەم دوو هەرێمەدا دامەزراند، کۆماری دیموکراتی ئازربایجان و کۆماری دیموکراتی کوردستان، ئیتر خێرا دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان هەڕەشەی داگیرکردنی بەشەکانی تری ئێرانیان لە یەکێتی سۆڤییەت کردو ناچاریان کرد کە لەشکرەکەی بکشێتەوە خاکی خۆی. ئەوەبوو حەمە ڕەزا شاش کشانەوەی لەشکری سووری سۆڤییەتی بە هەل زانی و پەلاماری هەردوو کۆمارەکەی داو بە زەبری ئاگرو ئاسن هەردووکیانی لەناوبرد. ئەمە نمونەیەکی ناوەڕۆکی جیۆپۆلیتیکسە.

بەڵام ئەگەر دەوڵەتە جیاکەرەوەکە (الدوله الحاجزة) خۆی بە هێزو خاوەن چەك و توانابێت ئەوا هۆی ناکەوێتە هیچ دەوڵەتێك و هەروەکو دەسەڵات و سەربەخۆیی خۆی ئەپارێزێت بە فرمانی جیاکەرەوەکاری خۆشی هەڵئەستێت. وەکو دەوڵەتی سویسرە.

ئەمە دەربارەی دەوڵەتی جیاکەرەوە بەڵام ئەو دەوڵەتانەی بەشی زۆری وڵاتەکەیان وشکانییە یان هەر هەمووی وشکانییە یان هەرێمی دەرگا لە پشتیان هەیە( Backdoor Areas) وەکو یەکێتی سۆڤییەت کە بەشی سەر دەریای جگە لەوەی بەستەڵۆکە گەلێکیش لە کان و دامەزراوە ئابوری و کشتوکاڵی و پیشەسازییە گەورەکانی ئەم وڵاتە دوورەدەستە.

ئەم دەوڵەتانە زۆر بە پەرۆش هەوڵئەدەن بگەنە دەریا چونکە ئەو دەوڵەتانەی سنوریان کەوتۆتە سەر دەریای بەرەڵا و بەکەڵك هەمیشە لەگەڵ زۆربەی زۆری دەوڵەتانی جیهاندا پەیوەندییان هەیە یان بە پێی پێویست ئەتوانن پەیوەندییان لەگەڵدا ببەستن جا هەندی لەم دەوڵەتانە ئەگەر بە زۆرو بە جەنگ خۆیان بۆ نەگەیەنرایە سەر دەریا یان ئەم رێبازەیان نەگرتە بەر ئەوا بەخۆشی و بە پێی رێککەوتننامەی تایبەتی لەگەڵ دەوڵەتانی تردا بەندەری ئازاد پەیدا ئەکەن و خۆیانی پێئەگەیەننە سەر دەریا وەکو چیکۆسلۆفاکیاو بەندەری ئازادی هەمبورگ لە ئەڵەمانیاو نەمسا لە بەندەری تریستدا.

ئەگەر سەیری مێژووی روسیا بکەین ئەبینین کە سیاسەتی دەرەوەی ئەم وڵاتە بریتی بووە لە خەباتێکی بێوچانی درێژخایەن لە پێناوی گەیشتن بە دەریادا ولە پێناوی گەیشتن بەم ئارەزووە ستراتیجییەدا دووچاری گەلێك ناکۆکی و دووبەرەکی و هەڵپژان بووەو هەمیشە دەوڵەتە رۆژئاواییەکان و دەوڵەتی عوسمانی بۆ بەربەستی ئەم ئارەزووە خۆیان بۆ خستۆتە سەنگەرەوە. ئێستاش یەکێتی سۆڤییەت ئەروانێتە سەر سێ دەریای ناوخۆیی وەکو دەریای بەڵتیك و رەش و قەزوێن. بەڵام سنووری سەر دەریای دوورە خەڵکە وەکو ئەو سنورەی ئەروانێتە سەر ئۆقیانوسی باسفێك خۆ ئەوەی ئەروانێتە سەر ئۆقیانوسی نیمچە قطبی لەبەر بەستەڵۆك و سەهۆڵبەندان هەر زۆر کەم بایەخ و کەم سوودە.

راستە یەکێتی سۆڤییەت لە ناوچەی دەریای بەڵتیك و دەریای رەش و دەریای قەزوێندا لە هەموو دەوڵەتانی ئەو ناوچانە لە هێزی دەریاییدا دەستڕۆیشتووترە، بەڵام دانیمارك کە ئەندامی پەیمانی ئەتڵەسییە دەرگای ئەو سەری لێگرتووەو تورکیا دەرگای ئەمسەری دەریای رەش و قەزوێنیش سەری بە هیچ دەریایەکی ترەوە بەند نییە.

بۆیە یەکێتی سۆڤییەت جارێ پەنای بردۆتە بەر تەکنۆلۆجیای نوێ و هەندێ نەخشەی تایبەتی کە خۆی لەم گەمارۆدراوییە ڕزگاربکات وەکو هەڵکەندنی نۆکەندی نوێ و بەکارهێنانی پاپۆڕی سەهۆڵ شکێنی ئەتۆمی و دروستکردنی هەندی پاپۆڕی زەلام و زەبەلاح کە زۆر درەنگ پێویستی بە سوتەمەنی ببێت. بەڵام وڵاتانی عەرەب بە گشتی بە پێچەوانەی یەکێتی سۆڤییەتەوە هەڵکەوتوون، بە درێژایی ساڵ هاتوچۆی دەریاییان بۆ ئەکرێت و سنوور کراوەو بەر بەرەڵڵان.

لە لایەکەوە ئەڕواننە سەر دەریای سپی ناوەڕاست و بەرێکی جەبەل تاریق-یان بە دەستەوەیەو لە لایەکی ترەوە بەشی هەرە زۆری دەریای سوور بەم سەرو ئەو سەریشیەوە، ئەمە جگە لە بەرەی ڕۆژئاوای هەموو دورگەی عەرەبی.

گەلێك لە زانا عەسکەری و پسپۆڕە جیۆپۆلیتیکسییەکان بەراوردێکی ئەم وڵاتە رووبەر فراوانە بێ دەریاو کەم دەریایانەیان لەگەڵ ئاسایشی نەتەوایەتی ئەو وڵاتانەدا کردووەو لە ڕووی پارێزگاری کردن و بەربەست کردنی هێرشی دوژمنان بایەخێکی زۆریان بەم جۆرە وڵاتانە داوە.

بۆ نمونە ئەڵێن یەکێتی سۆڤییەت لە جەنگی دووەمی جیهانیدا فابریقەو کارخانە گرنگەکانی هەموو گواستۆتەوە بۆ ئەو ناوچانەی کەوتوونەتە ڕۆژهەلاتی شاخی ئورال و ڕۆژئاوای سیبیریا تا چنگ هێزە داگیرکەرەکەی نازییەکان نەکەون.

ئەوی ڕاست بێت ئێستا پاش ئەوەی تەکنۆلۆجیای جەنگ گەیشتۆتە پایەیەکی بەرزو چەکی ئەتۆمی و فڕۆکەی تیژڕەوی دوورر ڕەوو ساروخی دوور ڕەو ئەگەنە هەموو شوێنێکی ئەم سەرزەمینە کەڵکی وڵاتانی پان و بەرین و سنوور داخراو لە ئاست و پلەی جارانیانا نەماون. لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەتانی دنیا ورەیان بەرنەداوەو خۆپارێزییان فەرامۆش نەکردووە. بۆ نمونە سوید پیشەسازییەکانی خۆی بە تایبەتی ستراتیجییەکانیانی خستۆتە ژێرزەمینەوە و شوێنی گەورە گەورەی ئامادە کردووە کە لەکاتی هێرشی ئەتۆمی‌دا بەشێکی زۆری خەڵکی سوید پەنایان بۆ بەرن و خۆیانیان تیا بپارێزن.

هەندێ لەم پەناگایانە وەکو ئەشکەوت لە شاخەکانی سویدا هەڵکەندراون و هەریەکەیان جێگای (٢٠٠) هەزار کەسیان تیا ئەبێتەوەو ئەتوانن بۆ ماوەیەکی زۆر تیایا بحەوێنەوەو پێویستیشیان بە هاتنەدەرەوە نەبێت.

## ولآتانی سەردەریا:

ولآتانی سەردەریا گەلێك جیاوازییان لەگەڵ ولآتانی وشکاییدا هەیە چ لە ڕووی ئاووهەواو چالاکی کارو گوزەرانی خەڵکەکەیەوەو چ دەربارەی سەرچاوەی دەرامەتیان.

ئەگەر سەرنجی مێژوو بدەین بۆمان دەرئەکەوێت کە داگیرکەرێتی و کۆلۆنیالی لە سەرەتاوە لە ولآتانی سەردەریاوە بلآوبۆتەوە وەکو بەریتانیا لە ئەوروپاو ژاپۆن لە ئاسیادا.

هەروەها دەوڵەتی خاوەن سامان و دەسەلآتیش هەر لە دەوڵەتانی سەردەریاوە دێنە پێشچاو، ولآتی نەرویج هەرچەندە بە ژمارە کەمەو پانابییەکی کەمیشی داگیر کردووە کەچی سێیەمین دەوڵەتی خاوەن کەشتی بازرگانییە لە جیهاندا، هەروەها دانیمارکیش لەم کۆڕەدا دەوڵەتێکی خاوەن سامان و کەشتی بازرگانییە.

گەر چاوێك بە مێژووی کۆن و نوێدا بخشێنین بۆمان دەرئەکەوێت کە زۆرجار دەوڵەتانی دەریا چاویان بڕیوەتە دەوڵەتانی وشکایی لە خۆیان گەورەتر. فینیقی و یۆنان و شارەکانی ئیتالیاو دوای ئەوان پورتوگال و هۆڵەندەیی و فەرەنسایی و ئینگلیزەکان هەموو ڕێبازی چونە سەر دەوڵەتی ترو سیاسەتی داگیرکەرانەیان گرتۆتە بەر. هەرچەندە ئێستا شوێنەواری ئەو داگیرکارییە لە چەند جێگایەکی بچوکدا ماوەتەوە وەکو هۆنگ کۆنگ و جەبەل تاریق.. هەروەها ئەم ولآتانە خۆشیان بونەتە نێچیری ولآتانی لە خۆیان گەورەو دەسەلآتدارتر یان دڕو تەماعکارتر. ولآتانی سەردەریا ئاسانتر داگیرئەکرێن لە ولآتانی دوورە دەریاو پان و بەرین چونکە ڕێگەی دابەزین و چونە ناوەوە لە دەریاوە ئاسانترە تا زەوی.

لەم بارەیەوە گەرووە دەریاییەکان ئەبنە ناوچەیەکی گرنگ و ستراتیجی و مایەی دووبەرەکی و کێشەو بەرەیەکی گەورە لە نێوان دەوڵەتە خاوەن سامان و دەسەلآتەکاندا.

ئەو ولآتانەی کە خاوەنی ئەم گەرووە دەریاییانەن لە لایەکەوە بۆیان ئەبێ بەخێرو سامان و پایەی دەرامەت و ستراتیجییان پێ بەرزئەبێتەوەو لە لایەکی تریشەوە دەوڵەتانی لە خۆیان بە دەسەلآتتر چاویان تێئەبڕن و گەلێك جار ناچار ئەبن

له گەڵ مافی ڕەوای خۆیان پاشەکشێیان بۆ بکەن و ھەندێ جاری تریش پەنا ئەبەنە بەر دەوڵەتی گەورە تا لە دەوڵەتانی تر خۆیان بپارێزن.

گەرووی بۆسفوڕ ودەردەنیل کە بەدەست تورکیاوەن گەرووی سەندیش کە بە دەست دانیمارکەوەیە ھەردوو دەوڵەتیان خستۆتە سەر ڕێگای ھاوکاری عەسکەری لەگەڵ دەوڵەتە ڕۆژئاواییە گەورەکاندا دژی یەکێتی سۆڤییەت، کە ڕێگایەکی ستراتیجی عەسکەری و بازرگانی و ھاتوچۆکردنی ئاسایی ئەم وڵاتەن.

ھەروەھا کاتی خۆی بەریتانیا دەستیگرت بەسەر گەرووی عەدەن و جەبەل تاریق و سەنغافورەدا، کە ئێستا ھەر جەبەل تاریقی بە دەستەوە ماوە تا ڕێگای ھاتوچۆی بازرگانی و عەسکەری بۆ خۆی لە ڕۆژھەڵاتی نزیك و ناوەڕاست بۆ ھند و خوارووی ڕۆژھەڵاتی ئاسیا مسۆگەر بکات.

خۆ کەنداوی سوێسیش چنگی ھەردوو دەوڵەتە کۆلۆنیالییە گەورەکەی بەریتانیاو فەرەنسای کێشایە وڵاتی میسرەوەو تا لە ساڵی ١٩٥٦دا ئەم دوو دەوڵەتەو ئیسرائیل سێ قۆڵی پەلاماری میسری عەبدولناسریان دا تاکو لە لایەکەوە کەنداوی سویس لە مەترسی ڕزگاربوون دوور بخەنەوەو لە لایەکی تریشەوە ڕژێمی پێشکەوتنخوازی عەرەب پەروەری عەبدولناسر لەناوبەرن.

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش تا ڕۆژھەڵات و ڕۆژئاوای خۆی بەیەکەوە ببەسێت و ھاتوچۆی دەریایی ئاسان بکات، دەستیگرت بەسەر کەنداوی پەنەمادا.

کەنداوی پەنەما نێوانی سان فرانسیسکۆو نیۆیۆرکی لە ١٢٦٠٠ میلی دەریایەوە ھانییە سەر تەنیا ٤٥٠٠ میل. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دوای بەکارھێنانی ئەم کەنداوە کەشتی جەنگی و بازرگانیان بە ئارەزووی خۆیان لە ھەردوو ئۆقیانوسی باسفیك و ئەتڵەسیدا گەشت ئەکەن.

ئنجا وەکو باسی گەرووی دەریایی ئەکەین ھەروەھا پێویستە باسی گەرووی وشکایش بکەین کە ئەمیش لە کاتی ئاشتی و جەنگدا بایەخ و شوێنی تایبەتی خۆی ھەیە.

بەڵام لەگەڵ گەرووی دەریاییدا ئەو جیاوازییەی ھەیە کە ئەمیان ئەبێ بنکەی عەسکەری پارێزەری لە پەنا خۆیا بۆ دابنرێت، بە پێچەوانەی گەرووی دەریاییەوە کە لە دوور خۆیەوە بۆی دائەمەزرێنرێت.

لە گەلییە وشکاییەکاندا گەلی (گەرووی) خەیبەر بەناوبانگە چونکە بووە بە سەرەڕێی وڵاتی هندستان و دەوڵەتە ئاسیاییەکانی ژوور خۆی.

لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا گەرووی سوریا -فەلەستین کەڵك و بایەخێکی گرنگی لە مێژووی ناوچەکەدا بووە، چونکە ئەم گەرووە بووە بە ڕێبازێك میسرو شاخەکانی ئاسیای بچوك و دەشتاییە بە پیتەکانی عێراق بە یەکەوە ئەبەستێت.

هەر لە چەرخەکانی پێش مێژووەوە ئەم گەرووە سەرەڕێی هاتوچۆی خەڵکی ناوچەکەو گەلێك سەرکردە بە خۆیان و لەشکرەکانیانەوە بەم گەرووەدا هاتوچۆیان کردووە. هەرلە ئەرمیس و فیرعەونی میسرەوە تا ئەسکەندەری گەورەو ناپلیۆن و لەنبی.

ئێستاش قەوارەی زایۆنیستەکان پەنای ئەم گەروەی گرتووەو بە تەمایە نەك هەر تا سەر تیایا بمێنێتەوە بەڵکو هەر بیکات بە بنکەیەك بۆ خۆکشاندن بەسەر بەشە ستراتیجییە بایەخدارەکانی دەورو پشتیدا.

شارەزایانی جیۆپۆلیتیکس لە گۆڕەپانی باسکردنی شوێنی وشکایی و سەردەریادا بایەخێکی تایبەتی ئەدەن بە دورگە چ بۆ خۆ تیاحەشاردان یان بۆ بنکەی عەسکەری تیاکردن.

ئەوی ڕاست بێت ڕابوردووی گەلێك دورگەو بەکارهێننای گەلێکی تر لە جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانیدا ئەم بۆچوونە ئەسەلمێنن. لە سەدەکانی ڕابوردوودا خەڵکی ئیرلەندە لە ئیرلەندەو خەڵکی کۆنی ژاپۆن لە ژاپۆن و دانیشتوانی ڕەسەنی دورگەی فورموزا و سەنگالییەکان لە سیلان لەم دورگانەدا حەسابونەوەو خۆیان لە پەلاماری داگیرکەران پاراستبو. بۆ نمونە زمانی پارێزراوی خەڵکی ئایسلەندە وەکو زمانی نەرویجی پێش هەزار ساڵ وایە چونکە ئەم کۆمەڵە خەڵکە لەم دورگەیەدا ڕەوشت و نەریتی کۆنی خۆیان پاراستووەو زمانەکەشیان ئامێتەی زمانی تر نەبووە.

هەروەها دورگەوی قوبرس هەرچەندە لە لایەن سوپای بەریتانیاوە داگیرکرابوو بەڵام شاخە سەختە چڕدارەکانی بۆ یۆنانییەکانی قوبرس بووبوو بە پەناگایەکی هەڵکەوتوو، کە لە لایەکەوە خۆیان لە گرتن و کوشتنی سوپای ئینگلیز بپارێزن و لە لایەکی تریشەوە بیکەن بە بنکەیەکی بایەخدار بۆ هێرشبردنە سەر هێزە داگیرکەرەکەی بەریتانیا.

لەگەڵ ئەمەشدا هەموو دورگەیەك نەبووە بە پەناگەی دانیشتوانی بەڵکو هەندێکیان لە لایەن کۆمەڵانی گەلانی ترەوە داگیرکراون و ئەو داگیرکەرانە وردە وردە دەسەڵاتی خۆیان بەسەردا سەپاندوون و دانیشتوانە کۆنەکانیان خزانۆتە کوچەیەکی وڵاتەکەیانەوە.

## بیابان و سنوور:

سەبارەت بەوەی بیابان رووتەنییەو کەم بارانە جگە لە چەند واحەیەك نەبێت، کە رێکئەکەوێتە ئەم لاو ئەولای هەندێ بیابانەوە ئیتر بەشەکانی تری بیابان بێ ئاوو بێ دەرامەتن. هەموو بیابانەکانی جیهان رووبەریان ئێجگار زۆرە چونکە ئەگەر وانەبوونایە هەر نە ئەبوون بە بیابان. ئەم خاسییەتە ئەبێتە هۆی ئەوەی بیابان ببێت بە سنوورێکی سروشتی و خواکرد لە نێوان وڵات و وڵاتێکی تردا یان گەل و گەلێکی تردا وە کەم وڵاتی گەورەش چاوی تەماعی تێببڕێت. ئەمە جگە لەو واحانەی کە هەندێ جار دوو دەوڵەت یان زیاتر لە سەریان لێیان بووە بە ناخۆشی وەکو واحەی بریمی کە کەوتۆتە چارەکە چۆل (الربع الخالی)ی دوورگەی عەرەبییەوەو تا ماوەیەکی زۆر شانشینی عەرەبی سعودی لەگەڵ عماندا کێشمەکێشیان لەسەر ئەکرد سەرەڕای ئەوەی نێوانی ئەم واحەیەو ئاوەدانییەکانی شانشینی سعودی سەدان میل بیابانی لمداره.

لە سەرەتای سەدەی بیستەم و لە هەندێ بیاباندا تا ئێستاش هۆزو تیرەی ئەم وڵات ئەو وڵات بە تایبەتی خاوەن حوشترەکانیان هەموو بیابانە نزیکەکانی خۆیان چ ئەو بەشەی موڵکی دەوڵەتەکانی خۆیان بێت یان ئەو بەشانەی هی دەوڵەتی تر بن هەر بە هی خۆیانیان زانیوەو بە سەربەستی بە دووی لەوەڕو ژیان و گوزەراندا هاتووچۆیان کردووەو کەسیش دەستی نەخستۆتە رێگایان، واتە چەشنی ژیان و گوزەرانی ئەو ناوچانە نەریت و رەوشتێکی تایبەتی نێو دەوڵەتی بەو جۆرەی بۆ هانیونەتە کایەوە.

بەڵام ئێستا کە تەکنۆلۆجیای هاتوچۆکردن بەسەر حوشتر و لە حوشتر خێراتریشدا بازی داوەو هێڵی شەمەندەفەرو فرۆکەی گەورەی مرۆڤ بەرو بار بەر

هاتونەتە کایەوە، بیابانیش وەکو هەموو بووەکانی تری ئەم سەرزەمینە نرخ و بایەخێکی تری پەیداکردووە ، لە گەلێك لەم بیابانانەدا کان و کانزای بە نرخی نەوت و ئاسن و فۆسفات .. دۆزراونەتەوە.

ئەم دیاردەیە بیابانی خستۆتە ئاستێکی نوێوە، لە لایەکەوە کەڵکی سنوور کێشانی خستۆتە ئاستێکی خوارترو دووەم بووە بە سەرچاوەیەکی نوێی دەرامەت و داهاتی دەوڵەتانی سەرو دەورو پشتی بیابانەکان، ئەوەتا بیابانی ڕۆژئاوای ژووروی ئەفەریقا بۆتە کۆڕی بەیەکا هەڵپژانی خەڵکی ئەم بیابانەو مەراکیش و موریتانیاو جەزائیرو لیبیا، جگە لەو دەوڵەتانەی لە پشت پەردەوە یارمەتی ئەم دەوڵەت و ئەو دەوڵەتی خاوەن ناکۆکییەکە ئەدەن و هانەهانەیان ئەدەن.

## چیاو سنوور:

هەروەکو هەندێ بیابان و ڕوبار بوون بە سنووری جیاکەرەوەی دوو دەوڵەت یان چەند دەوڵەتێك هەروەها چیاش لە زۆر هەرێمی جیهاندا بە هەمان فرمان هەڵئەستێت، بەڵام جیاوازییەکی سەرەکی لە نێوان چیاو بیاباندا هەیە کە چیاو دەورو پشتی چیا بە گشتی ئەبێتە مەڵبەندی ئاوەدانی و خەڵك کۆکردنەوە، جگە لەوەی دەربەندو گەرووەکانی ئەم چیایانە ئەبنە ڕێبازی هاتووچۆکەران.

زۆر کەس لای وایە کە چیا ئەبێتە سنووری سیاسی نێوان نەتەوەی جیاواز جیاواز لە یەکتری، چیای هیمالایە بە نمونەی ئەم بۆچوونە ئەهێننەوە کە هندستان و وڵاتی تبتی لە یەکتری جیاکردۆتەوەو چیای برانس فەرەنساو ئیسپانیاو چیای ئالپ لاتین و جەرمانی لە یەکتری جیاکردۆتەوە.

بەڵام ئەو دیاردانەی لە پێشچاومانە لە هەموو هەرێمە چیاییەکانا ئەم بۆچوونە ناسەلمێنن. چونکە هەرێمە چیاییەکان بوونەتە مەڵبەندی نیشتەجێبوونی نەتەوەیەك یان چەند نەتەوەیەکی جیاجیا. ئەوانەی یەك نەتەوەیان تیا کۆبۆتەوەو نیشتەجێبووە، ئەو نەتەوەیەی کۆکردۆتەوەو ئاوات و ئامانجی نەتەوایەتی ئەو نەتەوەیەی تیا خەملیوەو قازانج و سوودی بە یەکەوە بەستوون وەکو دوکتور محمد ریاض ئەڵێت "کوردەکان هەرێمە چیاویە سەختەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەنازۆڵ تا

زاگرۆسیان داگیرکردووەو تیا نیشتەجێبوون[1]، هەروەها کشمیرو بۆتان و نیپال-یش بە نمونە ئەهێنێتەوە کە سێ نارچەی جیاوازی خاوەن سروشت و نەریت و خاسییەتی نەتەوایەتی تایبەتی بەهۆی چیا سەختە سەرکەشەکانییەوە تیا پەیدابووە.

ئەوی ڕاست بێت چیا لە لایەکەوە وەکو جیاکەرەوەیەکی خوا کردو سروشتیانەو لە لایەکی ترەوە بە هۆی خاسییەتی تایبەتی نەتەوایەتی لە ڕووی یاساو نەریتی نێودەوڵەتانەوە ئەرکی شارەزایانی سنوورکێشی جیهانی ئاسان کردووە.

لە ساڵی ١٦٥٩وە کێشەی سنووری چیای برانس لە نێوان فەرەنساو ئیسپانیادا هەیە، تا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا هەردوو دەوڵەت ڕێکەوتن کە لە سەدەی سیانزەهەمیندا نێوانیان لەم هەرێمەدا چۆن بووە هەر لەسەر ئەو ڕێڕەوە لەگەڵ یەکتریدا ڕەفتار بکەن و هەردوولا دەرگا بۆ شوان و خاوەن ئاژەڵی یەکتری بخەنە سەرپشت.

دەربارەی چیا، دوکتور صلاح الدين علی الشامی بە سێ شێوە باسی ئەکات:

یەکەم: ئەو زنجیرە چیایانەی کە وەکو قوتبی موگناتیسی نەتەوەیەکی تایبەتییان لە خۆیان کۆکردۆتەوەو بونەتە مەڵبەندی ئەو نەتەوەیەو تیائەژین و ئامانج و ئاواتێکی گەلاڵە کراو یان سنووری ئاشکراو دیاری نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی و سیاسی بۆ کێشاون. وەکو زنجیرە چیای بەنین لە نیمچە دورگەی ئیتالیادا کە یەکێتییەکی سیاسی و کۆمەڵە خەڵکێکی دیاری بە دەوری خۆیا کۆکردۆتەوە.

دووەم: ئەو زنجیرە چیایانەی سنوورێکی سروشتییان دروستکردووەو بونەتە پشتیوانی سنووری سیاسی دەوڵەتێك و دوو زەوییان لە یەکتری جوێ کردۆتەوە. هەر کۆمەڵە خەڵکێك خاوەنی خاسییەت و سروشت و نەریت و ئاوات و ئامانجی تایبەتی خۆیەتی. دەربارەی ئەم جۆرە دیاردەیە چیای ئالپ بە نمونە ئەهێننەوە کە ئیتالیاو سویسرەی لە یەکتری جیاکردۆتەوە. هەرچەندە هەندێ دانیشتوانی سویسرە بە ڕەگەزو ڕەسەن ئیتالین و کەوتوشنەتە ئەودیو سنووری ئیتالیاوە.

سێیەم: ئەم نمونەیەی لە هی یەکەم و دووەم لا باشترە، ئەویش کە چیا ببێت بە پشتیوانێکی توندوتۆڵی سنووری سیاسی و هیچ کێشەو بەرەیەکی لێ نەکەوێتەوە.

هەر کۆمەڵە خەڵکێك ئازادانە لە هەرێمی خۆیاندا بێ دەست درێژی و بڕوبیانو پێگرتنی کۆمەڵە خەڵکێکی تر گوزەران بکەن. وەکو زنجیرە چیای ئەندیز کە وڵاتی شیلی لە ئەرجەنتین جیا کردۆتەوە. هەروەها زنجیرە چیای هیمالایە کە هندستان و چینی لە یەکتری جیاکردۆتەوە.

بێگومان وەکو هەموو بووەکانی تری ئەم سەرزەمینە چیا بە تاقی تەنیا نە ئەبێت بە مایەی کۆکردنەوەی گەلێك و نە ئەشبێت بە جیاکەرەوەیەکی تەواو و لە گۆڕان نەهاتوو، بەڵکو ئەم دیاردەیە بەندە بە هێزو توانای نێودەوڵەتانی هەرێمەکەو هێزو توانای نەتەوە نیشتەجێبووەکانی ئەم زنجیرە چیایانەوە.

هەروەکو دوکتور محمد ریاض ئەڵێت نەتەوەی کورد زۆر لە کۆنەوە نیشتەجێی زنجیرە چیاکانی هەرێمی هەر لە ڕۆژهەڵاتی ئەنازۆڵەوە تا زنجیرە چیاکانی زاگرۆس بووە، کەچی بە درێژایی مێژوو کوردستان دوای لەناوچوونی ئیمپراتۆریەتی میدیا بە دەست ئیمپراتۆرییەتە گەورەکانی ناوچەکە، عوسمانلی و سەفەوری و هی ئەوروپاش بەریتانیاو فەرەنساو قەیسەرییەکانەوە نالاندویەتی.

بە پێی قازانجی خۆیان کوردستانیان هەڵسوڕاندووەو ئەم پارچەو ئەو پارچەی کوردستانیان کردووە بە هەرێمی جیاکەرەوە (منطقة حاجزە) لە نێوان خۆیانداو ئیتر چارەنووسی کوردو کوردستان و ئامانج و ئاواتی نەتەوەی کورد بە پێی قازانجی جیۆپۆلیتیکسی خۆیان پێشێل کردووە.

بە کورتی چیاو ناوچە چیاییەکان وەکو هەموو بووەکانی تری سەرزەمین و گەردوون لای چاك و بایەخداریان هەیەو لای لاوازو کەم خێرو بێریشیان هەیە. لە ڕوی کشتوکاڵەوە ئەو ناوچانە زۆرتر بە کەڵکی میوەو دارو درەختی گەورە دێن، سەبارەت بەوەی کە کەم دەشتن دانەوێڵەیان کەم لێ بەرهەم دێت. بۆیە لە ناوچە شاخاوییەکانی ئەوروپا پیشەسازی میوە سازکردنیان تیا بە هێزو گەشەدارە. میوەی کەمپوت و مرەباو شەراب و ویسکی ئەو جۆرە خواردنەوە کحولییانەی کەرەسەی خاویان میوەیە.

له لایەکی ترەوە هەڵئەکەوێت کە لەم ناوچە شاخاوییانە ئاسن و خەڵوزو مس و نەوت و کانزای تریان تیا بدۆزرێتەوە جگە لە تاقگەی ئاو کە کارەبای پێ بەرهەم ئەهێنرێت. لە ڕووی عەسکەریشەوە هەمیشە ئەم ناوچە شاخاوییانە یارمەتی گەلەکانی داون کە بە هێزێکی کەم و چەکی سوکەوە بتوانن ڕووبەڕووی هێزێکی لە خۆیان گەورەترو چەکدارتر بوەستن و پاشەوپاش بەرەو دواوەیان بەرن، شەڕە پارتیزانییەکانی گەلەکانی ئەورووپای ڕۆژهەلات و یۆنان و فەرەنسا دژی نازییە داگیرکەرەکان بەڵگەی ڕاستی ئەم لێکدانەوەیەیە.

## ڕووبارو سنوور:

ڕووبار زۆر وڵاتی ئاوەدان کردۆتەوەو بۆتە هۆی دامەزراندنی شارستانێتی رەسەن و گەورە وەکو شارستانێتی کۆنی چینییەکان کە بەهۆی سێ ڕووبارە گەورەکەیەوە، هوانغهو و یانغتسی کیانغ و سیکیانغ دامەزراوە، هەروەها شارستانێتی سۆمەرو بابل بە هۆی دیجلەو فوراتەوەو، میسر بە هۆی ڕووباری نیلەوە.

ڕووبار بایەخێکی گەورەتری ئەبێت لەو دەوڵەتانەدا کە هیچ سنورێکیان ناگاتە دەریا تەنیا لە ڕووبارەکەیەوە نەبێت، ئەو ڕووبارەی ئەبێتە سەرچاوەی هاتوچۆکردنی دەریایی، ئەمە لە لایەك لە لایەکی ترەوە ڕووبار ئەبێت بە سنوور لەنێودوو دەوڵەت یان چەند دەوڵەتێکدا. ئەم بوون بە سنورەش گەلێك کێشەو بەرەو ناکۆکی لەنێو ئەم دەوڵەتانەدا هانیوەتە کایەوە. ئەمە جگە لە کێشەو بەرەی ئەو ڕوبارانەی کە سەرچاوەکەی لە دەوڵەتێکدایەو بەسەر چەند دەوڵەتێکی تردا ئەکشێت تا ئەڕژێتە دەریاوە. ئەم جۆرە ڕووبارانە لە لایەك ئەم دەوڵەتانە بە هاوبەشی و هاوسوودی بە یەکەوە ئەبەستێ لە لایەکی تریشەوە ئەبنە هۆی مەترسی پەیداکردن لە یەکتری وەکو ڕووباری نیل کە شادەماری گوزەران و ژیانی گەلی میسرن، لە سەدا نەوەدی خەڵکی میسری لەمبەرو لەوبەری کۆکردۆتەوە.

بۆیە هەموو جارێك کە مەترسی ڕوویکاتە سەرچاوەکەی خێرا کاربەدەستانی میسری، کاربەدەستنای حەبەشە کە سەرچاوەی نیلی لێ هەڵئەقوڵێت ئاگادار ئەکەن

که ناتوانن چاوپۆشی له دەستکاریکردنی ئەم روباره بکەن، چونکه ئەم سەرچاوەیه به ناوچەیەکی دەرفەتداری (منطقة حيوية) میسر له قەڵەم ئەدرێت.

دەربارەی سنوورکێشان دوکتورصلاح الدين علی شامی ئەرکی سنووری سیاسی ڕووبار بەم جۆرەی خوارەوە باسئەکات:

١-ناوەڕاستی ڕێڕەوی ڕووبارەکه ببێت به سنووری سیاسی.

٢-ناوەڕاستی ڕێڕەوی لاقوولاییەکەی ڕووبارەکه که کەشتیوانی تیا ئەکرێت بکرێت به سنووری سیاسی.

٣- قەراغی ئەو دیوی روبارەکه بکرێت بەسنوری سیاسی، بەم پێیه هەموو ڕووبارەکه ئەکەوێته ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتێکەوەو ئەوانی تری لێی بێبەش ئەکرێت.

بێگومان بۆ ئەوەی مرۆڤ به چاکی له پیت و بەرەکەت و بایەخی سیاسی و عەسکەری و جیۆپۆلیتیکسی ڕووبارێك تێبگات پێویسته هەموو لایەنەکانی ڕووبارەکه به باشی تێبگات، چونکه ڕووبار هەیه به ناوچەی تەنگ و سەخت و قوڵدا ئەڕوات، هی تر هەیه به ناوچەی دەشتایی و پان و ڕێڕەویشی هێمن و لەسەرخۆیه. هەروەکو هەندێك هەیه وەرزە ڕووباره واته ساڵ دوانزه مانگه نییەو ڕووباری تریش هەیه ئاوی وشك ناکات.

جگه لەوەی هەندێ ڕووبار دەستکاری نەکرێت له ماوەیەکی کەمدا ڕێگای خۆی ئەگۆڕێت که ئەم ڕێگاگۆڕینەش سەر له دانەرانی سنوور ئەشێوێنێت و بارودۆخێکی تر ئەهێنێته کایەوە، بەڵام به گشتی سەرچاوەی ڕووبارەکان سەبارەت بەوەی فره لقن و کەمن و بڵاون به کەڵکی سنوور نیشانه کردن نایەن.

بۆ نمونه ڕووباری ڕاین تا ئەگاته دەریاچەی بودن (کونستانزه) هیچ سنوورێکی پێ نیشانه ناکرێت بەڵام دوای ئەوه ئەبێته سنورێکی مێژوویی له نێوان سویسراو ئەڵەمانیه و ئەڵەمانیاو فەرەنسادا. خۆ ئەگەر لەگەڵ ڕووبارەکەدا وا ڕێککەوت زمانی دانیشتوانی ئەملاو ئەولای ڕووبارەکەو ڕەگەزو ڕەوشتیشیان جیاواز بوو وەکو سنووری بولغاریاو ڕۆمانیا لەمبەرو لەوبەری ڕووباری دانووب ئەوا سنوورێکی ڕێکوپێك ودامەزراو بۆ هەر دوو وڵات ئەکێشێت.

**ڕووبەر ( المساحە ):**

بۆ ئـەوەی ڕەوتـی سیاسـی هـەر دەوڵـەتێك بـە باشـی بزانـین پێویسـتە لەگـەڵ مەرجەكانی تری دامەزراندنی دەوڵەتدا سەیری پان و بەرینی ئەو دەوڵەتە بكەین.

وەكو هەموو ئەزانین سەرزەمین هەر ئەوەندەیە كە هەیە لەوە زیاتر ناكشێت و گەورەتر نابێت بۆیە هەرچەندە دەوڵەتانی جیهان كەم بن یان زۆر هەر ئەبێت لەسەر ڕووی ئەم سەرزەمینە جێگای خۆیان بكەنەوە. دیارە گەورەیی و بچووكی ڕووبەر یان ئەندازەی هەندەسی ئەو دەوڵەتە خاوەن ئەو پارچە زەوییە، خاوەن سامان یان نیوە سامان یان هەژار ئەكات. بەڵام بە تاقی تەنیا ڕووبەرەكەی ئەو دیاردەیەمان بۆ نیشانە ناكات.. بەڵكو چەند خاڵێك بە سەریەكەوە ئەبنە هۆی نیشانەكردنی ئەم لێكدانەودیە.

ئـەویش بریتـین لـە چڕی و شاشـی دانیشـتوانی ئـەو پارچـە زەوییـەو چۆنێتـی دابەش بوون بەسەر هەموو بەشەكانیا تا ئەم دابەشبوونە بگونجێت لە تەك بەروبومی ئابوری وڵاتەكەدا. هەروەها ئایا داهات و كەرەسـەی خاوو كشتوكاڵی لـەو ئاستەدایە كە بەشی ژیان و گوزەرانـی خەڵكەكەی بكات و لێشـی زیاد بێت و بازرگانی لەگـەڵ وڵاتانی دەرەوەدا پێوە بكرێت؟ هەروەها ئایا ڕێگای ئاسانی هاتوچۆكردنی ناوخۆو لەگەڵ دەوڵەتانی دەرەوەدا تیا مسۆگەر ئەكرێت؟ چونكە ئەم خاڵانە بەردی بناغەن تا كۆمەڵە خـەڵكێك لەسـەر پارچـە زەوییـەك بتوانـن كۆببنـەوەو ئـاوات و ئامـانجێك لـە پێناوی پێكەوە ژیاندا یەكیان بخات.

دوكتـۆر صـلاح الدیـن علـی الشـامی كـە باسـی نـاوك (النـواة) ئـەكات كـە بـۆ دامەزراندنی دەوڵەت لەسەر پارچە خاكێك زۆر پێویستە ئەڵێت "هەڵكـەوتی سروشت كـرد یـان هەلومـەرجی نەتەوایـەتی واتـە نەتەوەیـەكی خـاوەن خاسییەتی تایبـەتی ئـارەزووی پێكـەوە ژیـان بكـەن یـان قـازانجی نـاوكۆیی سـتراتیجی بـە یەكـەوە بیانبەستێتەوە، ئـەم مەرجانـە بۆ دامـەزراندنی ئـەو دەوڵەتـە ئـەبن بـە نـاوك وە ئەبنـە سەرە پردێك سوودو قازانجی ناوكۆیی دروستئەكەن".

سەرەڕای ئەمە هەر باسی ڕووبەری وڵاتێك گەورە یان بچوك هاتە پێشەوە شان بە شانی ئەمە خێرا باسی دەرفەت (المجال)یش دێت بە بیری زانایانی جیۆپۆلیتیكس یان ئەوانـەی لـە كلاورۆژنـەی جیۆپۆلیتیكسـەوە ئەڕواننـە زەویـوزاری وڵاتێـك. بـەڵام

ڕووبەر باسێکەو شتێکەو دەرفەتیش شتێکی ترە، هەندێ وڵات هەیە ڕووبەری خۆی لە چاو ئەو دەرفەتە (المجال)ی بە دەستییەوەیەتی زۆر بچوکە وەکو جارانی بەریتانیا کە بەلای کەمەوە چواریەکی هەموو سەرزەمین دەرفەتی دەسەڵاتی ئەو بوو. زانایەکی وەکو ریچارد هارتشرون بایەخێکی ئەوتۆ نادات بە پانایی کە باس لە هەلومەرجی دامەزراندنی دەوڵەت ئەکات.

سەبارەت بەوەی ئەڵەمانیا ڕووبەرێکی کەمی لەچاو دەسەڵاتی ئابوری و پیشەسازیدا هەبوو ڕوویکردبووە پەیداکردنی دەرفەت (المجال). بەڵام ئینگلیزو ئەمەریکاییەکان چونکە تیرە زەوی بوون بە ئەندازەی ئەڵەمانییەکان ئەو بایەخەیان بە پەیداکردنی دەرفەت نەئەدا.

لەگەڵ ئەوەشدا خاتوئیلن سی سیمپل جوگرافیازانی ئەمەریکایی بیروڕای خوی دەربارەی ئەم باسە لە بیروڕای فردریك راتزلی ئەڵەمانییەوە هەڵئەهێنجا و لە ئەنجاما بیروڕاکانی کوتومت وەکو بیروڕای قوتابخانەی هوسهوڤەری ئەڵەمانی وابوو. لە باسێکدا ئەم خاتونە ئەمەریکاییە ئەڵێت "ناکۆکی لە پێناوی بوون و ماندا لە نێوان گەلان و ڕەگەزە جۆربەجۆرەکاندا خۆی لە خۆیدا ناکۆکیە لە پێناوی دەستخستنی دەرفەت (المجال)دا" بۆیە ئەبێ لە کۆڕی ئەم باسەدا بە وردی ئەو جیاوازییەی نێوان ڕووبەرو دەرفەت تێبگەین.

دوکتور علی المیاح ئەڵێت "دەرفەتی جوگرافی مانای جێگایەکی دیاریکراو و ناوچەیەکی خاوەن ڕووبەرێکی نیشانەکراوە، کەچی واتای دەرفەت لە جیۆپۆلیتیکسدا ئاڵۆز ئەبێت و مانایەکی تر ئەدات بە دەستەوە".

دیارە دوکتۆر علی المیاح نیازی لەوەیە کە دەرفەت ئەو جێگایانەیە ڕەنگە بە پێی یاسایەکی باوەڕپێکراو وپەیمانێکی مۆرکراوی بە ڕاست زانراوی نێودەوڵەتان نەخرابێتە ژێر دەسەڵات و فەرمانڕەوایی دەوڵەتێکەوە، کەچی ئەو دەوڵەتە بە ئارەزووی خۆی کەڵکی لێوەرئەگرێت، بەڵام زەوی بە پێی هەموو هەلومەرجێکی نێودەوڵەتان موڵکی دەوڵەتێکەو بە سەربەستی مافی فەرمانڕەوایی تیاکردنی بە دەستەوەیە. دەرفەت لە گەوهەردا هەوڵی خۆگەورەکردن و کشان بەسەرخاکی گەلانی تردا ئەگەیەنێت. ئەویش کە دەوڵەتێك پایەی ئابووری و پیشەسازی گەیشتە ئاستێکی زۆر لە خۆی بەرزتر ئیتر بە دوای بازاڕو کەرەسەی خاوو چەوساننەوەی

گەلانی تردا ئەگەڕێت، بە تایبەتی ئەگەر بناغەی ئەو دەوڵەتە لەسەر ئایدۆلۆجییەتی سەرمایەداری دامەزرابێت.

سەبارەت بەوەی کە ئەم باسەمان بە دوور درێژی لە لاپەڕەکانی پێشوتردا شیکردۆتەوە لێرەدا باسی بایەخی ڕووبەر (المساحە) ئەکەین، باسی ئەو ڕووبەرانەی ئاسایشی وڵاتانیان پێئەپارێزرێت یان ئەبنە کۆمەك بۆ ئەم لایەنە.

لەم سەرزەمینەی کە تیایدا ئەژین و وڵاتی وەکو یەکێتی سۆڤییەت و چین و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای لەسەرە کە ڕووبەریان ٨/٣٨٦/٣٣٢ میلی چوار گۆشەو ٣/٧٥٦/١٠٢ میلی چوارگۆشەو ٣/٧٣٤/٠٠٠ میلی چوارگۆشەیە ودەوڵەتی وەکو مۆناکۆش هەیە ڕووبەری نیو میل چوارگشەیە. وڵاتی وەکو بەریتانیا کە لە کاتی خۆیدا حوکمڕانی چواریەکەی سەرزەمینی ئەکرد ئێستا تەنیا ٩٤/٢٧٨ میل چوارگۆشەی بە دەستەوە ماوە.

بەڵام بە هیچ جۆرێك دەوڵەتە زۆر بچکۆلەکان هەرچەندە پایەی شارستانێتی و تەکنەلۆجییان بەرز بێت هەر ناگەنە پلەی دەوڵەتی خاوەن ڕووبەری گەورەی بە پیتوبەرەکەت. چونکە ڕووبەری بچوك جێگای خەڵکی زۆری تێدا نابێتەوە بێ خەڵکێکی زۆریش نە بەرهەم زۆر ئەبێت و نە سوپای گەورە دائەمەزرێت، کە هەردووکیان پایەی بنچینەیی پێشکەوتن و شارستانێتی و خۆ لە دوژمن پاراستنن.

دیارە نیازیش لە ڕووبەر، زەویوزاری بێفەڕو بێبەرەکەت نییە، چونکە وڵاتێکی وەکو ئوسترالیا کە پانایی ٣ ملیۆن میلی چوارگۆشەیە هەر ئەتوانێت ٣٠ ملیۆن کەس بەخێوبکات سەبارەت بەوەی تەنیا ٨/١ی زەوییەکەی نیشتەجییە.

بەڵام فرە پانوبەرینی لە کاتی جەنگدا پایەیەکی بەرزو بایەخی گەورەی هەیە، عەسکەرییە ستراتیجییەکان و زانایانی جیۆپۆلیتیکس بەم جۆرە وڵاتانە ئەڵێن لە قوڵایی وڵاتدا خۆپاراستن (*DEFINCE DEPTH*) ئەم وتەیە ئەو وڵاتانەی سەر دەریاش ئەگرێتەوە کە بە هۆی هێزی دەریاییەوە ئەتوانن شەڕ لە خاکی خۆیان و سنووری ڕوو لە دەریا دووربخەنەوە، یەکێتی سۆڤییەت لە جەنگی دووەمی جیهانیدا بەشێك لە خاکی خۆی دا بەدەستەوە تا دوژمن بکەوێتە قوڵایی وڵاتەکەیەوەو ئەوسا پاش خۆئامادەکردن بە هێزێکی گەورەترو ڕێکوپێکترەوە پەلاماری بداتەوەو تەفروتونای بکات. ئەمە لە لایەك لە لایەکی ترەوە وڵاتی گەورە لە کاتی جەنگدا

بەشێکیشی دووچاری وێرانکاری بێت، بەشە زۆرەکەی تری بە سەلامەتی بۆ ئەمێنێتەوە بەڵام وڵاتی بچوك دوای سەرکەوتنیش وڵاتێکی وێرانکراوی ئەکەوێتەوە دەست.

سەرەڕای ئەمانە هەمووی، چەکی فرەکوژی نوێ چ ئەتۆمی و چ کیمیاوی و جۆرەکانی تریش ئەم بایەخانەیان لە ئاست و پلەی جارانیانا بەرەوخوار خلیسکانووە.

## شێوە (الشكل):

شێوەی دەوڵەت باسێکە ئەمیش وەکو هەموو لایەنە جوگرافیەکانی تری وڵات زانایانی جوگرافیای سیاسی و جیۆپۆلیتیکسی بە خۆیەوە خەریککردووە. نیازیش لە شێوە ئەوەیە کە ئایا نەخشەی جوگرافی ئەو دەوڵەتە شێوە خڕو چوارگۆشەیە یان درێژو کەمەر باریك یان دوو پارچەو سێ پارچەو چەند پارچەیە.

بێگومان ئەگەر دەوڵەتێك خاوەنی هەلومەرجە بایەخدارەکانی تر بێت شێوەی دەوڵەت بۆی ئەبێت بە پشتیوانێکی گەورە چونکە شێوە بە تاقی تەنیا کارێکی گرنگی ئەوتۆی پێ ئەنجام نادرێت.

دکتور علی المیاح ئەڵێت "ئەگەر درێژی سنووری وڵاتێك لە چاو پانایی وڵاتەکەدا تا کەمتر بێت ئەوە شێوەی ئەو وڵاتە پەسندتر ئەبێت". وڵاتێکی وەکو فەرەنسا یان هەنگاریاو ڕۆمانیا بۆ نمونەی باشی شێوەی دەوڵەت لە قەڵەم ئەدەن. بەڵام وڵاتێکی وەکو نەرویج ئەگەر دووچاری هێرشی دەوڵەتێکی تر بێت لە ماوەیەکی کەمدا بە ئاسانی پارچە پارچە ئەکرێت. وەکو لە جەنگی دووەمی جیهانیدا ئەڵەمانەکان پەلاماریان داو هێزەکانی خۆیان بە ئاسانی هەر لە شاری نارڤیك-ەوە لەوپەڕی ژووری نەرویجەوە تا شاری ئۆسلۆی پایتەختی لە بەشی خواروی ئەم وڵاتە دابەزاندو بەم کارە پەیوەندی نێوان ئەم شارانەو ناوەوەی نەرویجیان لە یەك ترازاند.

کەچی سەبارەت بە هەندێ هەلومەرجی تر وڵاتی شیلی کە خراپترین شێوەی هەیەو درێژی سنووری ئەگاتە ٢٦٠٠ میل دووچاری پەلامارو داگیرکردن نەهاتووەو بەسەرهاتی وەکو فەرەنساو نەرویجی بەسەرنەهاتووە.

بــە گشــتی شــێوە باشــی و خــاوەن مەرجــە جوگرافییــەکان بــە تــاقی تــەنیا هەڵکەوتێکی بایەخداری ڕێکوپێکی وڵاتێکی پێ جێبەێ ناکرێت، بەڵام خۆی وەکو هۆیـەك بارودۆخێکی باش بۆ ئەو وڵاتە دێنێتـە کایـەوە. ئـەم بارودۆخـەش لـە کـۆڕی پاراسـتنی ئاسایشـی نـاوخۆی وڵات و خۆپاراسـتن لـە هێرشـی دەرەوەدا کـەڵکێکی گەورەی ئەبێت.

بـۆ نمونـە پاکسـتانی جـاران کـە دوو پارچـە بـوو، پاکسـتانی ڕۆژهـەڵات (بەنگـەلادیش) و پاکستانی ڕۆژئاوا، سەبارەت بەوەی کە نێوانـی ئـەم دوو پارچەیـە نزیکـەی هەزار کیلۆمـەتر ئەبوو، زۆر بە ئاسانی ئـەم دوو پارچەیـە لـە یـەك ترازێـنراو پاکستانی ڕۆژهەڵات بەناوی بەنگلادیشـەوە وەکـو دەوڵـەتێکی سەربەخۆ هاتـە کـۆڕی دەوڵەتانی جیهانەوە.

وڵاتی تریش هەیە وەکو یۆنان چەند پارچەیەکە، بەڵام پارچەکانی ئەم وڵاتە زۆر دوورو بڵاو نین.

بێگومان لەم مەیانەدا یەکێتی نەتەوەو زمان گەلێك ناتەواوی شێوە دائەپۆشێت. لەوانە بوو ئەگەر خەڵکی بەنگلادیش و خەڵکی پاکستانی ئێستا لە تەك یەك ئاییندا یەك نەتەوەش بوونایە ئەم دوورییە نەبوایە بە هۆی لە یەك ترازانیان.

لـە پـاڵ ئـەم شێوانەشـدا شـێوەی پەرشـوبڵاویش هەیـە وەکـو ئیمپراتۆرییـەتی بەریتانیای جاران کە هەر پارچەیەکی لە کوچەیەکی جیهاندا بوو.

وڵاتـی کـۆ و پـڕ لـە هێڵـی هـاتوچۆکردن و یـەك نەتـەوە یـان خـاوەن یـەك قـازانج چاکتر ئاسایشی خۆی پێ ئەپارێزرێت چ هی ناوەوە یان هـی دەرەوە لـە وڵاتێکـی فـرە نەتەوەی شیرازە لاوازی بێ ڕێکاوبانی ئارەزوو جیاواز.

وڵاتێکی وەکو یەکێتی سۆڤییەت سەرەڕای ئەوەی فرە نەتەوەو فرە ئایین و فرە زمانـە بەڵام چونکـە هـەموو نەتـەوەکانی خۆیـان بـە ڕۆڵـەی خـاکی سـۆڤییەت ئـەزانی و وڵاتـی سـۆڤییەت بـە نیشـتمانی خۆشەویسـتی خۆیـان ئـەزانی، لـە جـەنگی جیهـانی دووەمــدا وەکــو یــەك گــەلی یــەککگرتوو قارەمانانــە چوونــەوە بــە گــژ ئەڵەمانــە داگیرکـەرەکانداو دەسـتیان لـە خـەباتی چەکدارانـەی دەوڵـەتی و میللـی هەڵنـەگرت تـا ڕژێمی هیتلەرییان لە بەرلیندا ڕمان.

## هەڵکەوتی پایتەخت:

کە دەوڵەتێك هێرش ئەباتە سەر دەوڵەتێکی تر یان تاقمە عەسکەرێك لە وڵاتێکدا بیر لە کودتایەك ئەکەنەوە یان هێزێکی شۆڕشگێڕی میللی دژی ڕژێمەکەی خۆی شۆڕش بەرپا ئەکات هەموویان وەکو ئامانجێکی سەرەکی بیر لە گرتنی پایتەخت ئەکەنەوە، چونکە کە پایتەخت کەوتە دەست هەرلایەك لەم لایانە بە دەگمەن نەبێت ئیتر ڕژێمی پایتەخت لە دەست سەندراو کۆتایی دێت.

بێگومان هەڵکەوتی پایتەختیش لە هەموو کات و زروفێکدا بەدەست دانیشتوانی یان فەرمانڕەوایانی ئەو وڵاتە نییە.

بەڵکو شێوەی وڵات دەستێکی گەورەی لە هەڵکەوتن و جێگا نیشانەکردنی پایتەختدا هەیە. ئەگەر شێوەی وڵات چوارگۆشەیی یان بازنەیی بێت ئەوا دامەزراندنی پایتەخت لە ناوەڕاستی وڵاتدا کارێکی ئاسان و گونجاو ئەبێت وەکو شاری مەدریدی ئیسپانیایی کە کراوە بە پایتەختی ئەو وڵاتە. ئەم هەڵکەوتنەی شاری مەدرید چ بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری بەڕێوەبردنی دەوڵەتی و چ بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوخۆ یان بۆ خۆپاراستن لە هێرشی دوژمن بایەخێکی زۆر شایستەی هەیە.

هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو سۆڤییەتییەکان ئەم ڕاستییەیان پێشبینی کردو پایتەختی خۆیان لە لەنینگرادەوە گواستەوە بۆ مۆسکۆ، لە جەنگی دووەمی جیهانیدا سودێکی زۆریان لەم پێشبینییە دی.

هەروەها تورکە کەمالییەکانیش پایتەختی خۆیان لە ئەستەموولەوە گواستەوە بۆ ئەنقەرە چونکە لەوەپێش وڵاتانی باڵقانیان بەدەستەوە بوو، نەئەبوو پایتەختی خۆیان زۆر لەم وڵاتە ژێردەستانەی خۆیان دووربخەنەوە، ئەڵەمانەکانی ڕۆژئاواش دوای جەگی دووەمی جیهانی شاری بون-یان کرد بە پایتەخت تا لە لەشکری سووری سۆڤییەتی دوور بکەوێتەوە.

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ساڵی ١٧٩٠دا ١٣ پارێزگا بوو، واشنتون-یان کرد بە پایتەختی خۆیان چونکە ئەوکاتە ئەکەوتە ناوەڕاستی ئەم وڵاتەوە.

بێگومان بە پێی گەورەبوون و بچوك بوونەوەی ولاتێك و کاروباری بازرگانی و پەیوەندی ئەو دەوڵەتە لەگەڵ دەوڵەتە دراوسێکانیدا، شارێك بایەخدار یان بێبایەخدار ئەبێت بۆ پایتەخت.

بۆیە ئیسپانییەکان پایتەختی خۆیان لە یورجوس بۆ نالدولیدو لەوێوە بۆ تولیدو ئنجا بۆ مەدرید گواستەوە.

هەروەها رووسەکان لە کییف-ەوە بو سوزداڵ ئینجا بۆ ڤلادیمیر لەپاشان بۆ مۆسکۆ ئنجا بۆ سان پترسبورگ جارێکی تر بۆ مۆسکۆ گواستەوە. هەروەها قبلای خان پایتەختی چینی لە کراکورمەوە گواستەوە بۆ خامپالیك (پەکین).

## داهاتی سروشتی و دەسەڵاتی پیشەسازی:

ئەگەر بە وردی سەیری مێژووی مرۆڤایەتی بکەین بۆمان دەرئەکەوێت کە باری ئابوری ناوخۆی دەوڵەتان ماکی هەموو ناکۆکی و دوو بەرەکییەکی ناوخۆ و دەرەوە بووە. ئێستاو بۆ لەمەودواش باری ئابوری هەر بەردی بناغەی ژیان و گوزەران و خۆشی و ناخۆشی کۆمەڵانی ئەم سەرزەمینەیە، سیاسەتی دەرەوەی هەموو دەوڵەتێك ئاوێنەی چۆنێتی ژیانی ئابورییەتی، ئەو دەوڵەتانەی ئابورییان پتەو بەهێزە ژیانی ناوخۆیان ئارام و لەسەرخۆیە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ دەوڵەتانی دەرەوەدا رێکوپێك و ناوبانگی دەرەوەیان بەهێزە ، بە پێچەوانەی ئەمانە دەوڵەتە بێهێزەکان و ئابوری لاوازەکان هەمیشە خانە بە جەنگ و نائارام و قەرزارو سوکەسەنگن لە نێو دەوڵەتانی دەرەوەدا، ئەم لاوازی ئابورییە ناچاریان ئەکات سەر بۆ دەوڵەتی خاوەن ئابوری بەهێز شۆڕ بکەن و بەشێك لە ئازادی و سەربەخۆیی نەتەوایەتی خۆیان لەدەستبدەن.

گەر بمانەوێت سیاسەتی دەرەوەی ولاتێك لە تای تەرازوو بدەین و کێش و تواناو خۆڕاگری پێوانە بکەین ئەبێ پێش هەموو شتێك لە ئابوری ناوخۆی ئەو ولاتە بکۆڵینەوە.

بۆیە ئەوانەی بە زانستی جیۆپۆلیتیکسەوە خەریکن پێش هەموو شتێك بیر لە جوگرافیای ئابوری ئەکەنەوە.

بەرهەمهێنانی کەرەسەی خاو و پیشەسازکردنی بۆتە محەکی جیاکەرەوەی دەوڵەتی هەژارو خاوەن سامان لەنێو دەوڵەتانی جیهاندا، چونکە ئەمە نەك هەر لەکاتی ئاشتیدا بە کەڵکی خۆشگوزەرانی گەلێك دێت و بەردی بناغەی سەرکەوتنەکانێتی بەڵکو لەکاتی جەنگیشدا کاروباری عەسکەری دەزگا پیشەسازییە عەسکەرییەکانیش هەر بە کەرەسەی خاو و پیشەسازکردنی کەرەستەی خاو هەڵئەسورێن.

لەبەرئەوە هەندی دەوڵەتی خاوەن سامان و خاوەن دەستگای پیشەسازی بەهێز کە بۆ هەندێ بابەتی کەرەسەی خاو دائەمێنن، بیر لە پەیداکردنی دەرفەتی بایەخداری ئابوری (المجال الحيوي الاقتصادي) یان بیر لە خۆکشان بەسەر خاکی دەوڵەتانی تردا ئەکەنەوە، یان دۆستایەتی لەگەڵ دەوڵەتانی خاوەن ئەو کەرەسانە ئەگرن و پشت بەو دراوەی بەدەستیانەوە یە کەرەسەی خاوی پێویست بۆ پیشەسازییەکانیان مسۆگەر ئەکەن.

لە چەرخەکانی پێشودا یان هەر ڕاستتر ٣٠٠٠ ساڵ پێش زایینی میسریەکان لە پێناوی دەستخستنی مس و بەردی بە نرخ و میتاڵی تردا هەرێمی سینایان خستە ناو سنووری خۆیانەوە، لە ساڵی ١٧ی پێش زایینیدا سویسراییەکان بڕیاریاندا دەشت و کێو بکەن بە دانەوێڵە تاکو لە مەترسی برسێتی ڕزگاریان ببێت. ئینگلیزەکانیش لە سەرەتاوە لە پێناوی دەستخستنی خوری ڕوویانکردە ئوستورالیاو ئەفەریقا.

لە ساڵی ١٩٠٧دا هەر هەمان مەبەست ژاپۆنی خستە سەر فاکوفیکی داگیرکردنی کۆریا.

دوکتور علي المياح کەرەسەی خاوئەکات بە چەند بەشێکەوە و ئەڵێت "هەر کەرەسەیەك بەرهەمی ناوخۆی کەم بوو و دەزگا عەسکەرییەکان پێویستیان پێ هەبوو کە لە دەرەوە بیکڕن و پەیدای بکەن بەو جۆرە کەرەسەیە ئەوترێت کەرەسەی خاوی ستراتیجی، بەڵام ئەو کەرەسەیەی کەڵکی تایبەتی هەیەو پێویستە هەر لە وڵاتی بێگانەوە پەیدا بکرێت ئەوا بەو کەرەسەیە ئەوترێت (کەرەسەی مولەق *Critical*) ئەمجا بۆ مسۆگەرکردنی ئەم جۆرە کەرەسانە بیروڕای "شادەماری ژیان" هاتۆتە نێودەوڵەتانەوە کە دەسەڵاتدارێتی سیاسی و ئابوری دێنێتە کۆڕی سیاسەتی

دەرەوەی ئەو وڵاتانەوە. هەر لەبەرئەمەش بوو کە ئەڵمانەکان پەلەی داگیرکردنی ڕۆمانیایان ئەکرد تا دەست بەسەر نەوتی ڕۆمانیادا بگرن، هەروەها ڕووکردنە هەرێمی قەفقاسیش لە جەنگی دووەمی جیهانیدا هەر بۆ پەیداکردنی نەوت بوو. کەرەسەی ستراتیجی چ کشتوکاڵی یان کانزایی بێت بە پێی جێگاو کات ئەگۆڕرێت، لە کاتی خۆیدا خێڵە ڕەوەندەکانی مەغۆل بە دووی لەوەڕگادا ئەگەڕان و هەردەستیان نەکەوتایە پەلاماری ئیمپراتۆرییەتی چینیان ئەدا. دیارە ئەوکاتە لەوەڕگا بۆ ئەم خێڵە ڕەوەندانە بە کەرەسەیەکی ستراتیجی لە قەڵەم ئەدرا چونکە ژیان و گوزەران و دەرامەتیان لە مەڕومالأت و ئاژەڵ دەستئەکەوت. بەڵام لە وڵاتێکی تردا ڕەنگە نەوت یان یورانیوم ببێت بە کەرەسەی ستراتیجی.

بێگومان سەرچاوە سروشتییەکان هەر بە تاقی تەنیا دەوڵەت بە هێزو بە توانا ناکەن، ئەبێ لە پاڵ ئەم سەرچاوانەشدا توانای پیشەسازکردنیان هەبێت. بۆ ئەوەی دەوڵەتێك لە شەڕو ئاشتیدا پشت بە خۆی ببەستێت ئەبێ پیشەسازییەکی دوولایەنەی هەبێت، لایەنێکی عەسکەری ئەوی تری ئاسایی، ئەم دەزگایانەش بە سەرمایەو کەرەسەی خاوو دەستی کرێکارو شارەزایی پیشەسازی و تەکنۆلۆجیای بەرزو هەمەڕەنگە هەلومەرجی سەرکەوتنی تەواو دێننە کایەوە.

دکتور علی المیاح بەرهەمهێنانی عەسکەریش ئەکات بە دوو بەشەوەو ئەڵێت "بەرهەمهێنانی عەسکەری مانای بەرهەمی عەسکەری و بەرهەمی مەرجداری عەسکەرییە.

بەشی یەکەم بەفڕۆکەو تانك و تۆپ و گوللەی ئاراستە کراوو پاپۆڕی جەنگی و هەموو بەرهەمێکی تری بۆ کاروباری عەسکەری تەرخانکراو ئەڵێت. بەڵام بەشی دووەم بەو بەرهەمانە ئەڵێت کە سەربازو خەڵکی ئاسایی وەکو یەك بەکاریان ئەهێنن. هەر لەسەر باسەکەی ئەڕوات و ئەڵێت "لە بەشی یەکەمدا کەرتی عەسکەری و کەرتی خەڵکی (القطاع الخاص) بین برکی لەگەڵ یەکتریدا ئەکەن تاکو هەریەکەیان باشتر سەرمایەو کەرەسەی خاوو دەستی کرێکاریان دەستکەوێت، بەڵام لە بەرهەمی مەرجداری عەسکەریدا (انتاج عسکری مشروط) بین برکی لە بەکارهێنان نەك لە بەرهەم هێناندا ئەکەوێتە نێوان عەسکەرو خەڵکەوە.

له کۆتایی باسەکەدا ئەبێ ئەو ڕاستییە بخرێتە بەرچاو هەر دەوڵەتێك هەرچەندە پانوبەرین و خاوەنی کەرەسەی خاو بێت هێشتا هەر هۆی ئەکەوێتە کەرەسەی خاوی وڵاتانی ترەوە.

بۆیە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نزیکەی بای حەوت ملیار دۆلار مس و توتیاو فافۆن و تەنجستن و جیوەو مەنغەنیزو کرۆم و کەرەسەی خاوی تری کڕیوەو لە گەنجینەدا بە یەدەگ هەڵیگرتووە.

هەروەها ئەڵمانەکان نەخشەیەکیان بۆ دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتێکی ئەڵەمانی کێشابوو کە هەموو ئەورووپاو بەشێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفەریقای ئەگرتەوە. بەو نیازەی لە بەروبوومی ئەم وڵاتانە کەڵکوەرگرن و هەموو کەرەسەیەکی کشتوکاڵیو پیشەسازی بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن.

# بەکارهێنانی هێزی چەکدار لە پێناوی دەستڕۆیشتوویی لە جیهاندا

## هێزی دەریایی و زەمینی و ئاسمانی و جەنگە ئەستێرە کامیان ئەم فرمانەیان پێ جێبەجێدەکرێت؟

جیۆپۆلیتیکس کە زانستی پەیوەندی زەوییە بەکارو کردەوەی سیاسییەوە، یان وەکو پێی دەڵێن سیاسەتی زەمین (علم سياسه الكرة الارضية) چەند زاناو پسپۆڕێك لەم چەند دە ساڵەی دواییدا گەوهەرەکەیان بۆ خەڵکی جیهان خستۆتە ڕوو کە ئۆتۆماوڵ *Otto Maull* بەم جۆرەی خوارەوە لێیدەدوێت[١].

"جیۆپۆلیتیکس دەوڵەت بە بیروباوەڕێکی وشکی ڕاوەستاو نازانێت، بەڵکو بە بوونەوەرێکی زیندووی دەزانێت کە بەهۆی جوگرافیاوە دەوڵەت گەورەتر دەکرێت. ئیتر جیۆپۆلیتیکس نەخشەی دواڕۆژ دەکێشێت و وەڵامی ئەم پرسیارانە دەداتە پێشچاو. ئایا دەوڵەت دەرفەتی پێویستی بە تەواوی کەوتۆتە دەست؟ ئەم دەرفەتانە لە چ لایەکەوە کە لەگەڵ زروفی جوگرافیدا بگونجێت دەستپێدەکات و دەبێت ڕووبکرێتە چ لایەك؟".

بەلام (جون کیفەر) ئەڵێت[٢] "ئەم تیۆرییە لە ئەنجامی شارستانێتییەکی پیشەسازییانەی بالآبەرزوە تەشەنە دەکات".

هەروەها (قەشە ئەدوموندویلش) لای وایەکە[٣] "باس و لێکۆڵینەوەیەکە، دەربارەی جوگرافیای ئادەمیزادو زانستی سیاسەت جێبەجێکردن".

ئەو زاناو پسپۆڕانەی کەوتونەتە کۆڕی باسکردنی جیۆپۆلیتیکسەوە، هەموو چاویان بڕیوەتە ئەو بەشەی زەمین کە لە ڕووی ئابوری و بەرهەم و کەرەسەی خاوو دانیشتوانییەوە نرخ و بایەخێکی گەورەو شایستەیان هەیە، هەروەکو زیندەوەرێك باسی زەمین و دەوڵەتیان کردووە، ناوجەرگەی جیهان و دەوروپشتی ناوجەرگەو دەست و پەلی ناوجەرگەیان دەستنیشان کردووە.

جیۆپۆلیتیکسەکانی ئەڵمانی، ئەڵمانیایان بە ناوجەرگەی جیهان دادەنا (*Heart Land*) و دورگەی جیهان کە ئەڵمانیا ناوەندەکەی بوو بەو ڕووبەرە پان و بەرینەی لە قارەی ئاسیاو ئەوروپاو ئەفەریقا پێکهاتبوو لە نزیك ڕۆخەکانی ئەم دورگەیەوە قارەو دورگەکانی تر هەڵکەوتبوون وەکو ئەمەریکاو ئوستراليا و گرینلاند.. (سیر هالفورد ماکدەر)ی ئینگلیزی کە جێگری سەرۆکی کۆمەڵەی جوگرافی شاهانەی بەریتانیا بوو، لای وابوو ئەڵمانیاو ڕوسیا ناوجەرگەی جیهانن ئەوروپاو ئاسیاو ئەفەریقا دورگەکەین، بۆیە ئەیوت[٤] "هەر لایەك ڕۆژهەڵاتی ئەوروپای بە دەستەوە بێت ناوجەرگەی جیهانی دەستدەکەوێت.. هەرلایەك دورگەی جیهانی بەدەستەوەبێت هەموو جیهانی دەستدەکەوێت". بەڵام نیکۆلاس سپك مان *Nicolas. J. Spykman* پرۆفیسۆر لە زانکۆی یاڵ *Yale* لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە پێچەوانەی ماکیندەر دەیوت[٥] "ئەوەی دەست و پەلی (الاطراف) جیهانی بەدەستەوە بێت ئوراسیای دەکەوێتە دەست، ئەوەی ئوراسیای بە دەستەوە بێت چارەنووسی جیهانی دەکەوێت ژێردەست".

هەروەها ئەم ئایدیۆلۆجییەتە لەسەر چەند ڕەوڕەوەیەك ئەڕۆیشت بەڕێوە تاکو بە هۆی ئەم ڕەوڕەوانەوە بگات بە ئامانجی تەواوی کە دەستخستنی هەموو جیهانەو ژێردەستکردنی هەموو دانیشتوانێتی. بە پێی ئەم ئایدیۆلۆجییەتە، دەوڵەت بووەیەکی زیندووە، خاوەن هەست و کردەوەیە، وەکو مرۆڤ لە دایکدەبێت و گەورە دەبێت و پێدەگات و پیردەبێت و دەمرێت. مان و ژیانی دەوڵەتان بەندە بە دوو یاساوە، یاسای گەشەکردن و یاسای لەناوچوون، یاسای گەشەکردنیش، بەسەر زەوی گەلاندا کشان و "دەرفەتی بایەخدار"یان "ناوچەکانی ژیان" (*Lebens Raum*) ئەگرێتەوە. "ماهان" لەو بڕوایەدابوو کە دەوڵەت یان دەبێت گەشە بکات یان

بپوکێتەوە، چونکە لایوابوو هیچ دەوڵەتێك بێجوڵان و بزوتنەوە ناتوانێت دەست بەخاك و قەوارەی خۆیەوە بگرێت.

کە ئەمە مەبەست و ئامانجی خاوەنانی ئایدیۆلۆجییەتی جیۆپۆلیتیکس بێت دیارە ئەم مەبەست و ئامانجانەش جێبەجێکردنیان گەرەکە، بێگومان بەدیهێنانیشیان تەنیا دوو ڕێگایان هەیە، یەکەم ڕێگای سیاسی و دیبلۆماسی دووەم ڕێگای جەنگ، واتا بەکارهێنانی جەنگ لە پێناوی دەستخستنی ڕووبەری نوێ لە هەلومەرجێکدا کە ڕێگای سیاسیو دیبلۆماسی دەسەلاتی جێبەجێکردنی ئەم ئامانجەی نەبێت. بەلای لێنین-ەوە وا بوو، کە جەنگ لەنێو دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان خۆیانداو لەنێو ئیمپریالیستەکان تاکە تاکەو بە جووتەو بە کۆمەڵ و دەوڵەتە سۆشیالیستەکاندا دوای هەر تەنگوچەڵەمەیەکی ئابوری، کە دەکەوێتە نێو جیهانی سەرمایەدارییەوە یاسایەکی ئاسایی و ناچارییە. هەروەها بارون فون بلەف لە ساڵی ١٧٩٩دا لە کتێبی "گیانی سیستەمی تازەی جەنگ"دا دەڵێت[٦] "سەبارەت بەوەی لەم جیهانەدا شت هەیە بەشدەکرێت و شت هەیە وەردەگیرێت کە واتا دەبێ جەنگ ڕووبدات، جەنگ کۆتایی نایەت تاکو ئەو دەوڵەتانەی هەن بە سنووری پێویستی خۆیان شاد نەبن"!.

هەروەها "راتزل" دەڵێت[٧] "لەسەر ئەم ئەستێرە بچکۆلەیە هەر جێگای یەك دەوڵەتی مەزنی تیادەبێتەوە".

هەر بە پێی ئەم بیرباوەڕە هیتلەر لە کتێبی "کفاحی"دا دەربارەی سیاسەتی دەرەوەی ئەڵەمانیا دەڵێت[٨] "نابێت دوو هێزی گەورە لە ئەوروپادا بێنە کایەوە، چونکە هەوڵدان لە پێناوی پێکهێنانی هێزێکی عەسکەری تر لەسەر سنووری ئەڵەمانیا وەکو هێرشبردنە سەر ئەڵەمانیا وایە".

کە پسپۆڕی جیۆپۆلیتیکس و سەرکردەو عەسکەرییە گەورە بڕیاربەدەستەکانی (صناع القرار) دەوڵەتە گەورە چاوبرسییەکان ئەم ڕێبازە بگرنە بەر و هیچ دەوڵەتێکی سەرزەمینیش بە ئارەزووی خۆی دەست لە ئازادی و سەربەخۆیی خۆی هەڵنەگرێت، کە واتا ڕێبازی سیاسی و دیبلۆماسی بەربەست دەبێت و ئیتر دەرگا بۆ بەکارهێنانی هێزو هەڵگیرساندنی جەنگ دەکەوێتە سەرگازی پشت. بەم جۆرەش لە دوای هەرەسهێنانی سیستەمی کۆمۆنیستی سەرەتایی لەنێو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا واتە

لە پەیدابوونی ڕژێمی کۆیلەییەوە ئیتر جەنگ بووە بە ڕێبازی هەڵبژاردەی چینە خاوەن دەسەڵات و کاربەدەستکانیانەوە دژی گەلان و چینە چەوساوەکان و دەوڵەتە بچوك و مامناوەندییەکان و هەروەها دەوڵەتە زۆردارەکان لەناو خۆشیاندا، واتا جەنگ بووە بە ڕەفتارێکی ئاسایی نێو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و بە زۆر جێگای خۆی لەم سەرزەمینەدا کردۆتەوە.

دەربارەی سیاسەت و جەنگ، ماوتسی تۆنگ بە باشی ئەم بابەتەی ڕوونکردۆتەوەو دەڵێت[٩] "جەنگ درێژەی سیاسەتە بۆیە جەنگ خودی سیاسەتەو کارێکی سیاسەت پۆشە، لە کۆنەوە هیچ جەنگێك بەرپا نەبووە سیمای سیاسی نەبووبێت. جەنگی ئێمە دژی ژاپۆن جەنگێکی شۆڕشگێڕانەیە، ئامانجی دەرکردنی ئیمپریالیی ژاپۆن و دامەزراندنی چینی تازەی خاوەن ئازادی و یەکسانییە" هەروەها لەسەر باسەکەی ئەڕوات و دەڵێت "بەڵام جەنگ خاسییەتی تایبەتی خۆی هەیە بۆیە بەم واتەیە جەنگ بە پێی واتا گشتییەکەی لە ئاستی سیاسەتدا نییە. جەنگ بە ڕێگایەکی تر درێژەی سیاسەتە، لە کاتێکدا سیاسەت دەگاتە قۆناغێك کە ئیتر ناتوانێت بە ڕێگای ئاسایی بەرەو پێش بڕوات، لە پێناوی لەناوبردنی کۆسپی ڕێگاگریی سیاسەت، جەنگ هەڵدەگیرسێت. بۆ نمونە کە ڕەوتی نیوە سەربەخۆیانەی چین ڕێگای پێشکەوتنی سیاسی لە ئیمپریالییەتی ژاپۆن داخست، ئیتر ژاپۆن ڕێبازی جەنگی گرتە بەر تا ئەو کۆسپانە لابەرێت. هەروەها ژاپۆنیش کۆسپ بوو لە پێناوی سەرکەوتنی شۆڕشی دیموکراسی لە چیندا، بۆیە لە چینش شۆڕش بەرپابوو تا ئەو کۆسپە لابەرێت. بەم پێیە ئەتوانین بڵێین سیاسەت جەنگێکی سپی کارەو جەنگیش سیاسەتێکی خوێناوییە.

جەنگ خاسییەتی تایبەتی خۆی هەیە، کۆمەڵێك ڕێکخراوی جەنگی و کۆمەڵێك شێوەی جەنگ و کرداری تایبەتی جەنگی لێدەوەشێتەوە. ڕێکخراوەکان هێزە چەکدارەکان و هەموو شتێکی بەو ڕێکخراوە بەستراوانەن، شێوەکانیش تاکتیك و ستراتیجییەتی سەرکردایەتی جەنگن. بەڵام کردار شێوەی تایبەتی چالاکی کۆمەڵایەتییە کە هەر سوپایەك لە کاتی جەنگدا تاکتیك و ستراتیجییەتی تایبەتی لە هی خۆی و دژی دوژمنەکەی بەکاردەهێنێت. بۆیە تاقیکردنەوەکانی جەنگ، تاقیکردنەوەی تایبەتین. پێویستە هەموو

بەشداربووانی جەنگ لە پێناوی سەرکەوتنیدا خۆیان لەگەڵ جەنگدا بگونجێنن و دەست لە ڕەوشتی ڕۆژانی ئاشتی هەڵگرن".

پێش ماوتسی تۆنگ، کلاوزڤیتز بە هەمان شێوە کە جەنگ بە شێوەیەکی تر درێژەی سیاسەتە- لە جەنگ دوواوەو دەربارەی پەیوەندی نێوان جەنگ و سیاسەت کلاوز فیتز دەڵێت[١٠] "ئێمە وا تێدەگەین کە جەنگ لە هەموو هەلومەرجێکدا ئامرازی سیاسەتە، نەك شتێکی سەربەخۆ.. ئێمە ئەوە دەزانین کە پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان حکومەتەکان و نەتەوەکان جەنگ پەیدا دەکەن.. بەڵام دڵنیاین لەوەی کە جەنگ هیچ شتێك نییە ئەوە نەبێت کە بە یارمەتی چەند هۆیەکی تازەی ترەوە درێژەدانە بە پەیوەندییە سیاسییەکان.. ئەو شیرازە سەرەکییانەی لە کۆڕی ڕووداوەکانی جەنگدا دێنە کایەوەو پێوەی بەستراون ئەو شیرازە سیاسییانەن کە لە کاتی جەنگدا لەسەر ڕەوتی خۆیان دەڕۆن بەرێوە تا هێنانەدی ئاشتی..".

بۆیە لەگەڵ دروستبوون و پێکهاتنی دەوڵەتەوە هێزی چەکدار پەیدابووە، ئەم هێزە چەکدارانە دوو فەرمانیان خراوەتە ئەستۆ، پارستنی ئاسایشی ناوخۆ و پارێزگاری وڵات لە پەلاماری دەرەوە، بەڵام فەرمانڕەوا زۆرداره چەوسێنەرەوەکان هێزی چەکداریان بۆ داگیرکردنی وڵاتان و گەشەکردنی ڕووبەری خاکەکەی خۆشیان بەکارهێناوە. ئنجا کە هێزی چەکدار بخرێتە ژێرباری داگیرکردنی وڵاتانی ترەوە دەبێت بیریش لەوە بکرێتەوە کە چ جۆرە هێزێکی چەکدار یان چەند جۆر هێزی چەکدار ئەم فەرمانەی پێ جێبەجێدەکرێت.

بێگومان لە سەرەتای پەیدابوونی دەوڵەتدا تا ماوەیەکی زۆریش تەنیا هێزی پیادەو چەکی سەرەتایی زۆر ئاسایی هەبووە، وەکو شیرو تیرو رم و گورزو گۆپاڵە.. دوای ئەوەی پاپۆڕی (باگیڕ) پەردەدار (شراع) پەیدابووە ئنجا هێزی دەریایش هاتۆتە کایەوە. ئیتر لەگەڵ پێشکەوتنی پیشەسازی و تەکنەلۆجیادا و بەکارهێنانی خەڵوزی بەرد دوای ئەو نەوت و پەیدابوونی هێزی هەڵم و داهاتنی چەکی تەقەدار حاڵ و باڵی هەردوو هێز، هێزی زەمینی و هێزی دەریایی، بازی گەورە گەورەی سەر سوڕمێنەری بەرەوپێشناوە، ئنجا لە دوای ساڵی ١٩٠٠ەوە هێزی ئاسمانیش هاتە کۆڕەوەو تا ئەمڕۆ کە ڕۆکێت و جەنگی ئەستێرەش بۆتە مەترسییەکی گەورەو ڕووی کردۆتە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی.

بێگومان فەرمانڕەواکانی دەوڵەتە گەورەکان بە تایبەتی ئەوانەی چاویان لە خاك و سامانی دەوڵەتانی ترە، خۆیان و شارەزاو پسپۆرو دەزگا کاریگەرەکانیان شەوو ڕۆژ بیریان لەوە کردۆتەوە بە چ ڕێگایەك و بە چ هێزێك و پەنابەرنە بەر چ ڕێبازێك تا بە ئەنجامی داگیرخوازی خۆیان بگەن.

هەر دەوڵەتێك ئەم ڕێبازەی گرتبێت، بیری لەوە کردۆتەوە کە دەبێت هێزو توانای عەسکەری بالادەستی هێزو توانای هەموو دەوڵەتێکی تری سەرزەمین بێت، یان بیری لەوە کردۆتەوە کە جۆرە هێزێك و جۆرە چەکێکی بە دەستەوە بێت بە هێزترو کاریگەرتر لە هەموو هێزو چەکێکی تری دەست دەوڵەتانی دیکەی سەرزەمین. ئەم فەرمانڕەوایانە لە سیاسەت کاریشدا هەر بیریان لە سەرکەوتن کردۆتەوەو بەس! سەرکەوتنیش بۆ داگیرکردن و خۆ گەورەکردن و دەسەلات پەیداکردن لەنێو دەوڵەتانی تردا. هیتلەر دەڵێت "دەربارەی سیاسەت بڕوا بە هیچ یاسایەکی ڕەوشتکارانە ناکەم، سیاسەت یارییەکە هەموو فڕوفێڵێکی تیا ڕەوایە، یاسای یارییەکەش بەدەست یاریکەرەکانەوەیە تا لەگەڵ ئارەزووی خۆیانا دەیگونجێنن ئاڵوگۆڕ دەکرێت".

هەروەها دەربارەی هەمان جۆرە سیاسەت، سیاسەتی دەوڵەتە گەورە داگیرکەرەکان ونستون چەرچل سەرەك وەزیرانی پێشووی بەریتانیا لە دیدەنی گۆڕستانێکدا کە چاوی بەم ڕستە نوسینە دەکەوێت. دەڵێت ".. لێرەدا سیاسەت مەداری مەزن و پیاوی ڕاست ئارامی گرتووە.. جێگای سەرسامبوونە یەکەمجارە لە ژیانما دوو پیاو دەبینم لە گۆڕێکدا پێکەوە نێژرابن..".

هەروەها چەرچڵ پاش شکستی ئەڵەمانیا لە جەنگی دووەمی جیهاندا دەربارەی یەکێتی سۆڤییەت کە ئەرکی هەرە گەورەی جەنگی کەوتە ئەستۆو ٢٠ ملیۆن کەسی لەو جەنگەدا کوژراو سوپای سوور بەرلینی پایتەختی ئەڵەمانیای لە نازییەکان ڕزگارکرد دەڵێت "بە رازە دەست نیشانکراوەکەمان نەکوشت!" واتە نەمانتوانی یەکێتی سۆڤییەت لەناوبەرین.

جارێکیش لە فەرەنسیسی یەکەم شای فەرەنسا دەپرسن بۆچی هەمیشە دەچیت بەگژ شارلی پێنجەم شای نەمسادا؟ لە وەلامدا دەڵێت "چونکە هەردووکمان یەك ئامانجمان هەیە، ئەویش داگیرکردنی ئیتالیایە".

ئیتر بەم کورتە پێشەکییە دەچینە سەر خودی بابەتەکە. کە جیۆپۆلیتیکس یان ئایدیۆلۆجییەتی ئەم زانستە ڕێنیشاندەری فەرمانڕەواکانی دەوڵەتە گەورە تەماع لە خاك و سامانی گەلانی تر کردووبێت و هۆکانی سیاسی و دیبلۆماسی لە ئاستێکی تایبەتیدا لە چارەسەرکردنی کێشەو بەرەی نێوان دەوڵەتان دەستەوسان ڕابوەستن، ئیتر جەنگ دەبێت بە تاقە ڕێبازی چارەسەرکردنی هەموو تەنگوچەڵەمەیەکی نێودەوڵەتان کە خودی خۆشی درێژەی سیاسەتە یان هەر سیاسەتێکی خوێناوییە. لەبەرئەوە پێویستە لەسەر هەموو کەسێکی ئەم سەرزەمینە هیچ نەبێت شارەزاییەکی گشتی دەربارەی ئەم بابەتە بووەی ناو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی هەبێت بە تایبەتی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد کە مێژووەکەمان بە خوێن لاپەڕەکانی نووسراوەتەوە چ ئەو خوێنەی لە شەڕی نێوان دەوڵەتە گەورەکاندا ڕژابێت و ڕژێنرابێت چ ئەوەی لە پێناوی پاراستنی کورستان و دەستخستنی مافی نەتەوایەتی کرابێت بە قوربانی.

بێگومان جەنگ زانست و یاسای تایبەتی هەیەو ئامرازو دەزگای جۆراوجۆریشی تیا بەکاردەهێنرێت کە ناوەرۆك و ئامانجی هەڵگیرساندنی لەناوبردنی هێزی چەکداری دوژمنە بە کوشتن و گرتن و پەککخستنی، واتە لە کۆڕی جەنگ دوورخستنەوەی.

ئامرازو دەزگای جەنگیش لە سەرەتاوە وەکو هەموو ئامرازو دەزگاکانی تری دەست کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ئاسایی و بێ ئەرك و کەم زیان بووە، بەڵام لەگەڵ پێشکەوتنی ڕەوڕەوەی زانست و تەکنۆلۆجیادا ئەمیش شانبەشانی ئەوانی تر پێشکەوتووەو بەرەو هەورازتر ڕۆشتووە، تەنانەت گەلێ جار پیشەسازی جەنگ ئەوانی تری بەجێهێشتووە وەکو ئێستا ڕوون و ئاشکرا لەبەر چاوماندایە، هەموو پسپۆڕو پزیشکە پێشکەوتووەکانی سەرزەمین بەدەست نەخۆشی شێرپەنجەوە تووشی سەرەخوڵێ بوون، کەچی لە کۆڕی ئاسمانەوانیدا هیچ نەبێت یەکێتی سۆڤییەت و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا گەیشتوونەتە پایەو ئەندازەیەکی باوەڕنەکردەنی.

ئەم دەزگا و ئامرازانەش لە سەرەتاوە هەر لە هێزی زەمینیدا دەبینراو دوای ئەوە لە هێزی دەریاییداو لە پاشان لە هێزی ئاسمانیداو وا ئێستا لە هێزی بۆشایی

ئاسمانیشدا تارماییەکی ڕەشی بەسەر کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا کێشاوە کە پێی دەڵێن جەنگە ئەستێرە.

هێزی زەمینی و دەریایی زۆر کۆنن، هەریەکەیان یان هەردووکیان بە پێی هەڵکەوتی زەوی و دوورو نزیکییەوە لە دەریا بچوك و گەورە، بێهێزو بەهێز دروستکراون و کەوتوونەتە دەست دەوڵەتان.

بەڵام هێزی ئاسمانی کە فڕۆکەی جەنگی بڕبڕەی پشتێتی هێزێکی نوێیەو لە دوای ساڵی ١٩٠٠-ەوە کەوتۆتە دەست دەوڵەتە گەورەکانی سەرزەمین و وردە وردە نرخ و بایەخی دراوەتێ.

سەبارەت بە هێزی زەمینی، پێکەوەنانی لەوانی تر ئاسانتر بووە بە تایبەتی لەنێو ئەو دەوڵەتانەی ڕووبەری فراوانیان بە دەستەوەیەو دانیشتوانیان زۆرەو پیتوبەرەکەت و سامانی خاکەکەیان ئەم لایەنەی ژیانی بۆ مسۆگەر کردوون، یان بە هی وڵات و گەلانی تر جێبەجێیان کردووە. بەڵام هێزی دەریایی کە نوێترە لە هێزی زەمینی و تەکنۆلۆجیای پێشکەوتووتری گەرەکە، لە وڵاتی سەردەریاشدا نەبێت پێکنایەت، جا هەندێ وڵات هەبووە هەر بە هێزی دەرياييیەوە ناوبانگی دەرکردووەو هەندێ وڵاتی تر هەردوو هێزەکەی هەبووە بەڵام لە هێزێکیاندا دەستڕۆیشتووتر بووە وەکو بەریتانیا و ڕوسیای قەیسەری.

هەر هێزێك لەم هێزە باسکراوانە کەوتە گەشەکردن و بایەخپێدان نرخ و بایەخی هێزەکانی تر لەنگ دەکات، هەرچەندە هەندێ وڵاتی دەستنەڕۆیشتوو کە هێزە چەکدارەکانیان هەر بۆ خۆپاراستن تەرخانکردووەو ئەوەندە تەماعکاران چاویان تێنەبڕیون، ئەوەندە لەم کۆڕەدا بین بڕکێیان نەکردووە، لە لایەکی تریشەوە کە نیازی داگکیرکردن و مسۆگەر کردنی دەرفەتی بایەخدار (المجال الحیوی) و کشان بەسەر خاکی وڵاتانیان نەبووبێت. گەلێ دەوڵەتی سەرزەمین وەك یەك بایەخیان بە هەر سێ جۆرە هێزە چەکدارەکە داوەو هەموویان بەیەك دەزگاو پشتیوانی یەکتری لە قەڵەم داوە.

سەبارەت بەوەی دەوڵەتە گەورەکان و داگیرکردن دوای پەیدابوونی هێزی دەریایی بە شێوەیەکی فراوان بوون بە دیاردەیەکی ڕوون و ئاشکرای ئەم سەرزەمینە، هێزی دەریایی گەلێك جار تەقەللای داوە هەر بەوەی دەستی لە قەراغ ئاوێك یان

دورگەیەك گیربێت دەسەڵاتی خۆی بەسەر ناوچەو وشكاییە پان و بەرینەكاندا بسەپێنێت وەكو فینیقییەكان و یۆنان و دەوڵەتی شارەكانی ئیتالیا لە سەدەكانی ناوەڕاستداو پورتوگال و هۆڵەندییەكان و فەرەنسایی و ئینگلیزەكانیش یەك لە دوای یەك ملی ئەم بەربەرەكانی و ڕێبازی چاو لە خاك و سامانی وڵاتان و گەلانی تریان گرتبووە بەر. بۆیە یەكەم جار بە باسی هێزی دەریایی بابەتەكە دەستپێدەكەین.

ئەمە جگە لەوەی كە باسكردنی هێزی دەریایی دەبێتە بەراوردكردنێكیش لە نێوان هێزی دەریایی و هێزی زەمینیدا.

## هێزی زەریایی

نیاز لەم باسە ئەو لایەنەی هێزی دەرياييە كە توندوتۆڵ بە ئایدیۆلۆجییەتی جیۆپۆلیتیكسییەكانەوە بەستراوە كە بیر لە هێزی دەریایی دەوڵەتێك دەكەنەوە تاكو بیگەیەننە ئاستێكی ئەوتۆ، دەوڵەتەكەی پێبكەن بە گەورەترین دەوڵەتی سەرزەمین و سەری دەوڵەتانی تری لە ئاستی ئەو دەوڵەتەدا پێدابنەوێنن، ئەمە لە لایەك، لە لایەكی تریشەوە لایانوابووە كە هێزی دەریایی بۆ جێبەجێكردنی ئەم نیازە لە هێزی زەمینی بە كەڵك و بایەخدارترە چونكە بە ئاسانی و بێ هیچ كۆسپ و تەگەرەیەكی ئەوتۆ دەتوانێت بگاتە هەموو سووچو كوچەیەكی زەمین.

ئەوی ڕاست بێت ئەلفرید ثایەر ماهان ئەدیمراڵی ئەمەریكایی لە هەموو پسپۆڕو ئایدیۆلۆجیستە دەرياييەكانی تری جیهان زیاتر لە باسی هێزی زەرياييدا دەستڕۆیشتو و بەناوبانگترە.

لە ساڵی ١٨٩٠دا كتێبێكی بەناوی (هێزی زەریایی مێژوو بەرەو كوێ دەبات) بڵاوكردەوە، بوو بە یەكێك لە سەرچاوە گەورەكانی جیۆپۆلیتیكسی زەریایی. بیروباوەڕی ماهان نەك هەر لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكادا جێگایەكی دیارو شایستەی هەبوو بەڵكو فەرەنساو ئیتالیاو ڕوسیاو ژاپۆن و گەلێ دەوڵەتی بچوكی دەریایش دوایكەوتن و كەڵكیان لێوەرگرت.

هۆی پێشکەوتنی ماهان-یش لەم کۆڕەدا ئەوەبوو لە وڵاتێکی گەورەی خاوەن سامانی سەر دوو ئۆقیانووسی ئەتڵەنتی و باسفیکدا وەکو ئەفسەرێکی زەریایی کاری دەکردو بیروباوەڕی خۆی بڵاودەکردەوە، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بە هۆی برادەرێتی لەگەڵ تیۆدۆر روزفلت و هەنری کابوت لوجدا، هەمیشە کاربەدەستە دەست ڕۆیشتوەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای هاندەدا کە لە قاوغی ئەوسایان بچنە دەرەوەو ڕووبکەنە ئەودیو دەریا واتا ئەو وڵاتانەی لەوبەر دەریاوەن.

لە پێش ماهاندا دەوڵەتی ئەمەریکا ئامانجێکی دوولایەنەی بە هێزی دەریایی سپاردبوو، یەکەم پاراستنی سنوورە دەریاییەکانی ئەمەریکا دووەم هەڵکوتانە سەر پاپۆڕی بازرگانی وڵاتانی ناحەز بە ئەمەریکا، ئەم دوو فەرمانە هێزی دەریایی ئەمەریکای خستبووە قەوارەیەکی تەنگ و ئامانجی پەلهاویشتن بۆ ناو وڵاتانی تری ئیفلیج کردبوو. چونکە بەلای جیۆپۆلیتیکسەکانی ئەمەریکاوە پێویستە بە هێزی دەریایی دەست بەسەر وڵاتانی تردا بکێشن.

لە ساڵی ١٨٨٤دا سەرەکی کۆلێجی زەریایی لەنیوپۆرت ئەمیرال ستیڤن -ب- لوس داوای لە ماهان کرد دەربارەی مێژووی تاکتیکی دەریایی بیروباوەڕی خۆی بۆ خوێندکارانی کۆلیجەکە باسبکات ئیتر دوای ئەمە ناوبانگی شارەزایی دەریایی لە جیهاندا بڵاوبووەوە.

ماهان لە ساڵی ١٨٥٩وە ئەفسەرێکی دەریاییە، لە ساڵی ١٨٧٨دا کتێبی "ئەفسەرو سەرباز لە کاروباری زەریایی فێرکردن" بڵاوکردۆتەوە لە ساڵی ١٨٨٣ دا کتێبی "ئاوی کەنداوو دورگەی" بڵاوکردۆتەوەو لە ساڵانی ١٨٩٠ و ١٨٩٢و ١٩٠٥دا سێ بەرگی گەورە کتێبی بڵاوکردۆتەوە کە بە پایەی مێژووی دەریایی و سیاسەت و تاکتیك و ستراتیجییەتی زەریایی دەژمێردرێن.

ئەدوارد میدئیرل دانەری کتێبی "پێشەنگەکانی ستراتیجییەتی نوێ" دەربارەی ماهان دەڵێت[١١] "ماهان دەربارەی ستراتیجییەتی نوێ ئەم بایەخانەی خوارەی هەبووە:

١-فەلسەفەیەکی بۆ هێزی دەریایی داناوە، نەك هەر لەناو دامەزراوە دەریاییەکان بەڵکو لە دەرەوەی ئەوانیشدا ڕێزی لێگیراوەو خۆی گەیاندۆتە ناو دەزگاو ڕێکخراوە حکومەتییەکانی زۆر وڵاتانی جیهانەوە.

٢-تیۆرییەکی نوێی بۆ ستراتیجییەتی زەریایی دانا.

٣-سەرکەوتووانە تاکتیکی دەریایی دەنرخاند.

سەبارەت بەوەی ماهان ئەوەندەی بە هێزی زەریایی ڕەوانە ئەبینی کە تەنیا بەشێك بێت لە قەوارەی گشتی هێزی چەکدارو فرمانی پارێزگاری پاپۆڕی بازرگانی وڵات و یاریدەدانی هێزی چەکداری پارێزەری وڵاتی پێبسپێردرێت، ئەم شەش خاڵەی خوارەوەی بە مەرجی گرنگ و پێویست دەزانی کە هێزێکی دەریایی مەزنی پێدابمەزرێت لە ئۆقیانووسەکانەوە بەرەو وڵاتانی تر ببرێت و ببێت بە دەزگایەکی کاریگەری سیاسی پایەی وڵاتی پێبەرز بکاتەوە:

١-هەڵکەوتی جوگرافی.

٢-گونجاوی سروشتکار.

٣-گەورەبوون و کشانی هەرێم.

٤-دانیشتوان.

٥-ڕەوتی بیروباوەڕی خەڵکی وڵات واتا ڕەوتی نەفسییان.

٦-ڕژێمی سیاسی دەوڵەت و ئاراستەکردنی خەڵکەکەی.

بەلای ماهانەوە هەڵکەوتێکی جوگرافی نایابی بەریتانیا هێڵە دەریاییەکانی لە بەریتانیاوە بۆ ژووری ئەورووپاو بە پێچەوانەشەوە خستۆتە ژێر دەسەڵاتییەوە، هەروەها سەبارەت بەوەی دوورگەی گرنگ و بنکەی ستراتیجی وەکو جەبەل تاریقی بە دەستەوەیە دەریای سپی ناوەڕاستی کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتەوە، کە بەم دەسەڵاتدارێتییە لە کۆڕی بازرگانی و جەنگ-ی جیهاندا دەوڵەتێکی زۆر دەستڕۆیشتووە.

دەربارەی گونجاوی سروشتکار دەڵێت ئەمیش خەڵکی ئەخاتە سەر ئەو بارەی شوێنێکی شایستە بۆ وڵاتەکەیان دابمەزرێنن، چونکە سەردەریایی هاتووچۆی خەڵکەکەی لە دەریای پان و بەریندا ئاسان دەکات و بەندەری ڕێکوپێکیش دەبێت بە

پشتیوان و چۆنێتی خاکەکەش یان خەڵکەکە لە زەریا دوور دەخاتەوە یان بۆ مسۆگەرکردنی باری ژیان و گوزەرانیان بەرەو زەریا ڕایان دەکێشێت.

دەربارەی ئەم خاڵانە ماهان لایوایە، کە گەل پێویستە ئەو ڕاستییە بزانێت کە "ئەو هێزەی پێویستە هەبێت لەگەڵ ئەو هێزەی کە خۆی هەیە دوو شتی چوونیەك نین بۆیە پێویستە ئاستێکی لەنگەرگرتوو لە نێوانیاندا هەبێت".

واتە پێویستە هەموو نەتەوەیەك بایی ئەوەندەی کەڵکی لێدەبینێت هێزی بە دەستەوە بێت.

دەربارەی بەریتانیا دەڵێت ئەو بازرگانییە زەرياییە فراوانە دەسەڵاتی دامەزراندنی دامەزراوی زەریایی بەریتانیایان کرد بە دەوڵەتێکی خاوەن هێزی زەریایی مەزن.

لە بەشەکانی پێشوودا بە دوورو درێژی باسی خەڵك و هەرێم و گەورە بوونی هەرێم و کشان بەسەر خاکی وڵاتاندا کراوە لێرەدا بە کورتی باسی خاڵە باس نەکراوەکان دەکەین.

دەربارەی خاڵی پێنجەمیش بە پێویستی دەزانێت کە خەڵکی ئەو وڵاتەی هێزی دەریاییان هەیە بەبێ ئارەزوویەکی نەفسی تایبەتی ناتوانن هێزێکی دەریایی گەورە دابمەزرێنن، چونکە دەبێت ئارەزووی دەریاوانی بکەن و حەز بە دەستەڵاتداری بکەن تا ئەو شتە بەرهەمبهێنن کە بازرگانی پێشدەخات. جا لێهاتوویی حکومەت بە مەرجی گەورەی سەرکەوتنی ئەم فەرمانە لە قەڵەم دەدات چونکە هێزی دەریایی و ژمارەی کەشتی و تفاق و چەکی دەریایی و دەریاییەکان بە دەست حکومەتەوەیە.

دامەزراوە دەریاییەکان دەبێت لە ئاستێکدابن کە لە کاتی جەنگدا بە پەلە گەشە بکەن. ئەوانە دەتوانن دەریاوانەکان بۆ جەنگ و خۆڕاگرتن بەرامبەر دوژمن سازبدەن.

هەروەها بیروباوەڕی ستراتیجی، کە لە لایەن حکومەتەوە نەخشەی دەکێشرێت هێزی دەریایی دەخاتە سەر ڕێبازی سەرکەوتن یان دەستەوسان وەستانن.

فەرەنسا بە نمونە ئەهێنێتەوە کە هەمیشە میرە دەریاوانەکانی خۆی هاندەدا بە پانایی ئۆقیانووسەکانا گەشت و گوزار بکەن بێئەوەی ئارەزووی پێکا هەڵبژانێکی ئەوتۆ لەگەل هێزی دەریایی وڵاتانی تردا بکەن کە پاپۆڕەکانیان دووچاری زەرەرو زیان بکەن.

بەم جۆرە بیروباوەڕە هەمیشە هێزی دەریایی فەرەنسا دەستەوسان بەرامبەر هێزی دەریایی بەریتانیا ئەوەستا.

ئەوی ڕاست بێت ئەلفرید ماهان لە سەرەتای ژیانییەوە دوژمنی ئیمپریالیزم بوو، بەڵام دوای ئەوەی تێکەڵی هێزەکانی دەریایی ئەمەریکا بوو کەوتە نەخشەکێشانی دامەزراندنی هێزێکی زەریایی گەورە، گەیشتە ئەو بڕوایەی کە پەیوەندییەکی زۆر توند لە نێوان وڵاتان داگیرکردن و هێزی دەریاییدا هەیەو لەم بارەیەوە دەڵێت[١٢] "دەوڵەتی دەریایی بەژێر دەستەکردنی وڵاتان جێپێی خۆی لە خاکی بێگانەدا دەکاتەوەو، دەرگا بۆ بازرگانی خۆی دەخاتە سەرپشت و ناوچەیەکی نوێ بۆ پاپۆڕەکانی دەدۆزێتەوەو کاری زیاتر بۆ خەڵکەکەی پەیدادەکات و بەمە سامانیان دەخاتە بەردەست".

بۆیە ماهان دوو خاڵی زۆر لا گرنگ بوو، یەکەم هێزی دەریایی دەربارەی چارەنووسی جیهان چی پێدەکرێت، دووەم هێزی دەریایی و هێزی زەمینی کامیان گرەوی سەرکەوتن دەبەنەوە.

بۆیە ماهان دەرپەڕاندنی هێزی دەریایی دوژمنی لە دەریاو ئۆقیانووسەکاندا بە گەوهەری بیروباوەڕی ستراتیجی ڕاست دەزانی. لەم بارەیەوە دەڵێت[١٣] "دەست بەسەر چەند پاپۆڕێکدا گرتن، ژمارەیان زۆر بێت یان کەم سامان و دەرامەتی میللەتەکەی لەبن ناهێنێت، بەڵکو ئەم فەرمانە بەوە جێبەجێی دەکرێت ئاڵای ئەو میللەتە لە دەریاکانا نەشەکێتەوە، بە هێزێك دەکرێت ڕێگای هاتوچۆی بازرگانی لە پاپۆڕەکانی دوژمن ببەستێت، ئەمەش بە هێزی دەریایی گەورە نەبێت نایەتەدی".

بێگومان کە ماهان دەربارەی دەریاو دەریاوانی و هێزی دەریایی و ئنجا بیرکردنەوە لەدەست بەسەر دەریاو ئۆقیانووسەکانی جیهاندا گرتن تا دەست بەسەر زەمیندا بگیرێت، دەستیکرد بە نووسین.

ئەوساکە ئەوروپا کەوتبووە کۆڕی شۆڕشی پیشەسازییەوە و چینی بۆرجوازی وەکو چینێکی شۆڕشگێڕی حەز بە چوونە کۆڕی کشتووکاڵ و پیشەسازییەوە کەوتبووە چالاکی و جوڵانەوە، هەروەها بەرە بەرە چینی دەرەبەگ و پارێزگارخوازەکان ڕێگایان بۆ ئەم چینەو زانست و پیشەسازی نوێ و هێزی چەکداری خاوەن تەکنۆلۆجیای بەرز چۆڵ دەکردو هێزی دەریایی چ هی بازرگانی یان

هـــی عەســـکەری وەکـــو لاوێکـــی چـــالاکی خوێـــن گـــەرمی تاقەســـواری مـــەیدان بـــەرەوپێش دەڕۆیشـــتبەرێوە، بـــەلاّم لەگـــەڵ پێگەیشـــتنی چینـــی بۆرجـــوازی و پێشـــکەوتنی پیشەســـازی و تـــەکنۆلۆجیا لـــە هـــەموو کـــۆڕو مەڵبـــەندێکی ژیـــاندا هـــێزی زەریـــاییش پێدەگەیشـــت و کـــامڵ دەبـــوو، بۆیـــە ئایدیۆلۆجییـــەتی ماهـــانیش پابـــەندی ئـــەم یاســـایە بـــوو، لـــە زۆر ڕووەوە بیروبـــاوەڕی ڕاســـت و بایـــەخداری دەربـــارەی هـــێزی دەریـــایی بلاّوکردۆتـــەوەو لـــە هـــەندێ ڕووشـــەوە ســـەبارەت بـــەوەی ڕەوڕەوەی پێشـــکەوتن، بیروباوەڕەکـــانی بەجێهێشـــتووە، دووچاری ڕەخنەو هێرش بووە.

لـــە ســـەرەتای نووســـینەکانیدا نـــە فڕۆکـــەو نـــە ژێردەریـــایی (غواصـــە) دەســـتیان هـــەبووە لـــە کـــۆڕی جـــەنگی دەریـــاییدا بۆیـــە کـــە ئـــەم دوو ئـــامرازە چەکدارە هاتنەکایـەوە هـەندێ تیـۆری جـەنگی دەریـایی لـە ئاستیانا پاشەکشێیان کرد. وە ئـەم لێکۆڵینەوەیـە کەوتـە نێـو ئایدیۆلۆجیسـتە عەسـکەرییە گـەورەکانی ولاّتە گەورەکانەوە.

کە لە جەنگی یەکەمی جیهاندا هەندێ پاپۆڕی ئەڵەمانی لە ئاسمانەوە درانە بەر بۆمبـاو ناچـاربوون خۆیـان بدەنـە دەسـت دەوڵەتـە هاوپەیمانـەکان (الحلفـاء)، تاقیکردنەوەیەکی نوێ کەوتە کۆڕی جەنگی دەریاییەوەو عەسکەرییەکان کە تا ئێستا ەر لەم جۆرە دیاردەیە ئەکۆڵنەوە وەکو ئەدوارد میـد ئێرل دەڵێت[١٤] "مرۆڤ لـە دوو ڕای لە گومان بە دوور نزیك دەکاتەوە":

١-پاپۆڕی جـەنگی بـەبێ پارێزگاریکـەرێکی ئاسمانـی ناتوانێت لـە دەریـای تـەنگدا دەریاوانی بکات، چونکە فڕۆکەی دوژمن لە بنکەی زەمینییەوە هەڵدەکوتێتە سەری.

٢-دەبێت پاپۆڕی جەنگی لە دەریای سەر بەتاڵدا لـە دوو چەك بپارێزرێت، فڕۆکـەو ژێردەریایی.

بۆیە لە جەنگی دووەمی جیهاندا پەنابرایە بەر ستراتیجییەتێکی دەریایی نوێ و پاپۆڕی فڕۆکەهەڵگر لە ڕێگا زەریاییـەکاندا وەکـو هـێزێکی پارێزەرو هێرشبـەر خرایـە کۆڕی جەنگەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا ماهان هەر بە ئایدیۆلۆجیستی ولاّتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا دەزنراو لەسەر نەخشەی ئەو دەڕۆیشتنبەرێوە.

بە پێی لێکۆڵینەوە مێژووییەکانی ماهان لە ساڵی ١٨٩٠دا لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا یاسای دەریایی لە کۆنگریسی ئەمەریکادا بڕیاری لەسەر درا.

ئیتر شانبەشانی دروستکردنی پاپۆڕی جەنگی هەمەجۆرە، دەستکرا بە دروستکردنی (باریجە)ش. مستەر هەربەرت وەزیری دەریایی ئەمەریکا بە پێی بیروباوەڕی ماهان کە لە کتێبی "هێزی دەریایی لە ساڵی ١٧٩٣-١٨١٢دا چی لە شۆڕشی فەرەنساو ئیمپراتۆرییەتی فەرەنسا کردووە" بڕیاریدا کە پاپۆڕی جەنگی گەورە پارێزگاری سنووری دەریایی پێبسپێردرێت. هەربەرت بڕوای بەوە هەبوو کە هێزی دەریایی سوودی نیشتمانی لە دەرەوەی ولات پێدەپارێزرێت و لەکاتی ئاشتیشدا دەبێت بە پشتیوانی دیبلۆماسییەت.

ئیتر ئەمەریکا بە پێی بیروباوەڕی ماهان کەوتە دەستدرێژیکردن، کوبای لە ئیسپانیا سەندوەو دەستیگرت بەسەر دەریای کاریبیداو پۆرتۆریکۆی خستە سەر ولاتەکەی خۆی، هەروەها لە ساڵی ١٨٩٨دا دەستی بەسەر فلیپین-یشدا گرت، لەسەر سیاسەتی خۆگەورەکردن و داگیرکردن ڕۆیشت بەرێوە تا لە ساڵی ١٨٩٩دا ئەرخەبیلی ساموا-شی کەوتە ژێردەستەوە، لە ساڵی ١٩٠١دا دوای کوشتنی ماك کینلی، تیۆدۆر روزفلت سەرکۆماری ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای کەوتە دەست ئیتر بە تەواوی فەلسەفەی ماهان دەربارەی هێزی دەریایی لە کۆشکی سپیدا جێپێی قایمکردو ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە هۆی سیاسەتی دەریاخوازی روزفلت-ەوە بوو بە دەوڵەتێکی دەریایی گەورەی جیهان.

ئەدوارمید ئیرڵ دەڵێت[١٥] ئەگەر ئەلفرید ماهان لە ساڵی ١٩١٤دا نەمردایە لە ساڵی ١٩١٥ چەپڵەی بۆ سەرەك ویلسون لێدەدا، کە داوای لە کۆنگریسی ئەمەریکا کرد هێزی دەریایی ئەمەریکا بگەیەنێتە ئاستی بەهێزترین هێزی دەریایی لە جیهاندا".

هەر بە کردەوە یاسای دەریایی ساڵی ١٩١٦ هێزی دەریایی ئەمەریکای گەیاندە بەهێزترین هێز لە جیهاندا.

پرۆفیسۆر جەنەراڵ کارل هوسهوفەری ئەڵمانی بە ماهان دەڵێت[١٦] "ماهان جیۆپۆلیتیکسێکی هەڵکەوتوو بووە بە ڕێگایەکی ڕاست ولاتە یەکگرتوودکانی

ئەمەریکای خستۆتە سەر ڕێگای مەزنێتییەوە، ئەو سیاسەتمەدارەکانی ئەمەریکای فێرکردووە وەك هێزێکی جیهان گەردی خاوەن ڕووبەرێکی پان و بەرین بیر لەخۆیان بکەنەوە".

ماهان ئەوەندە ناوبانگی دەرکرد کە لە ساڵی ١٨٩٣-١٨٩٥دا چوو بۆ بەریتانیا شێوی ئێوارەی لەسەر خوانی شاژنی بەریتانیا خواردو سەرەك وەزیرانیشیان لەگەڵدا بەشداربوو جگە لەو ڕێزو نازناوەی لە هەردوو زانکۆی ئۆکسفۆردو کێمبرج-ەوە لێینراوە، کرا بە میوانی یانەی دەریایی شایانەی بەریتانیا کە هەر بۆ هاووڵاتی خۆیان تەرخانکرابوو.

ئەمیراڵ ڕاوول کاستکس-ی فەرەنسایی دەڵێت[١٧] "بیروباوەڕی ماهان دەربارەی پێویستی سەردەستەیی هێزی دەریایی و دامەزراندنی هێزێکی ڕێکخراوی کاریگەر پایەیەکی بەهێزی تیۆری ستراتیجی عەسکەرییە.

دەربارەی بیروباوەڕی ماهان سەبارەت بە هێزی دەریایی کە دەبێ پەیداکەری وڵاتانی ژێردەستە بێت و بازرگانی لەوبەر دەریاوە پەیدابکات لە ساڵی ١٨٩٤دا ئیمپراتۆری ئەڵمانیا نامەیەك بۆ برادەرێکی خۆی دەنێرێت و دەڵێت[١٨] "من ناخوێنمەوە، بەڵام لە کتێبەکەی ماهان تێگەیشتووم و هەوڵدەدەم هەمووی لەبەربکەم، چونکە لە کتێبە هەرە بەنرخەکانە، ئەم کتێبە لە هەموو پاپۆڕێکماندا هەیە، هەموو ئەفسەرە دەریاییەکانم شتی لێفێردەبن".

ئەلفرید ڤۆن تیربتز کە ئاراستەکەری سیاسەتی دەریایی ئەڵەمانیا بوو دەیوت کە ماهان باسی ئەم دوو وشەیە (هێزی جیهانی) دەکات نیاز لەو هێزەیە کە دەستکەوتی لە هەموو سەرزەمیندا هەبێت.

هەرچەندە ئەڵەمانەکان پشتیان بە هێزی زەمینی لە هێزی دەریایی زیاتر دەبەست و بەربەرەکانییان لەگەڵ هێزە دەریاییە دوژمنەکانی خۆیاندا بە فڕۆکەو ژێردەریایی دەکرد، بەڵام هەر شوێنێکی شایستەیان بۆ بیروباوەڕی ماهان لە کۆڕی ستراتیجییەتی دەریاییدا دانابوو.

ئایدیۆلۆجیستەکانی ئەڵەمانی سەر بە هێزی زەمینی دەیانوت هێزی دەریایی بەرامبەر پێشکەوتنی هێزی زەمینی و تەکنەلۆجیای چەکی زەمینی نوێ لە پاشەکشێدایە.

بێگومان پەیدابوونی لوغم و طوربیدو فڕۆکەی جەنگاوەرو بۆمباهاوێژ گەلێك لە بۆچوونەکانی ماهان و هاوبیرەکانی لە گرێژەنە برد، ئەو هەوڵ و تەقەللایەی ڕۆژئاواییەکان دوای ساڵی ١٩١٧ دایان بۆ زیندە بەچاڵکردنی شۆڕشی بۆڵشەویکی نەونەمام، بەلام گەشەکردنی هێزی زەمینی یەکێتی سۆڤییەت بۆ هەموو جیۆپۆلیتیکسەکانی سەلماند کە هێزی زەمینی هێزێکە بەرەو هەوراز دەکشێت و سەردەکەوێت.

لە هەمووی خۆشتر بیروباوەڕی ئەمیراڵ رائۆل کاستکسی فەرەنسایی بوو کە پێنج بەرگی گەورەی لەسەر ستراتیجییەتی دەریایی نووسیوە، لەو بڕوایەدا بوو کە پایەی دەریایی بەریتانیا وردە وردە هەرەسدەهێنێت و بەهۆی ئەم هێزەوە دەستکەوتێکی کەمتری لە چەرخی پاپۆڕی چارۆکەدار (السفن الشراعیە) دەستدەکەوێت کەچی لەم دواییەدا مارگرێت تاتشەر، سەرەك وەزیرانی ئێستای بەریتانیا دورگەی فۆکلاندی هەر بە هێزی دەریایی لە جەنەڕاڵەکانی ئەرجەنتین سەندەوە.

دیسان کاستکس وەکو گەلێك خاوەن تیۆری ئیتالیایی و فەرەنسایی بڕوای بەوە هەبوو کە هێزی دەریایی هێرشبەر کات و ڕێگایەکی زۆری دەوێت تاکو جێگایەکی نیشانەکراو گەمارۆ بدات ژێردەریایی و هێرشبەرنی ئاسمانی کاروکردەوەی هێزی دەریاییان لاوازکردووەو بڕوای بەوە هەبوو کە یەکێتی سۆڤییەت و چین خۆیان لە مەترسی هێزی دەریایی ڕزگارکردووە.

هەروەها بەرگێك کتێبی بۆ بەربەرەکانی هێزی زەمینی و هێزی دەریایی تەرخانکردو بەراوردی چەرخی جەنگیزخان و هی ستالینی تیاکرد، یەکێك لە ئەمیراڵە فەرەنساییەکان کە هاوبیری کاستکس بوو بڕوای بەوە بوو کە ستالین -دیارە ستالین وەکو فەرماندەی هێزێکی گەورەی زەمینی- لە دواڕۆژدا فەرەنسا لە تەنگوچەڵەمە ڕزگاردەکات، پەیکەرێکی نیو بالای بۆ ستالین دروستکردبوو، ئەوەبوو پێشبینییەکەشی لە جەنگی دووەمی جیهاندا هاتەدی.

بەڵام وڵاتی ژاپۆن کە لە دورگەیەکی گەورەو چەند دورگەیەکی تر پێکهاتووەو ئەبوایە لە هەموو هێزێك زیاتر پشتی بە هێزی دەریایی ببەستایە کەچی ئایدیۆلۆجییەتی دەریایی و ستراتیجییەتی جەنگی، جیاوازییەکی دیارو ئاشکرای هەیە لەگەڵ دەوڵەتە دەرياييەكانی سەرزەمیندا.

ژاپۆن کە لە ساڵی (١٨٩٤-١٨٩٥)دا جەنگی دژی چین هەڵگیرساندو لە ساڵی (١٩٠٤-١٩٠٥) دژی ڕوسیا لە هەردوو جەنگەکەدا بە تەمای ئەوەبوو جەنگێکی بین بڕی سەرکەوتووبێت. هەوڵی دا ڕێبەست لەو دوو وڵاتە بکات کەچی لە ساڵی ١٩٤١دا لە جەنگی دووەمی جیهانیدا لەسەر ئەم ڕێبازە نەڕۆیشتبەڕێوە. لەگەڵ ئەوەشدا شارەزابوون لە تاکتیك و ستراتیجییەتی ژاپۆن کارێکی دژوارو گرانە چونکە ژاپۆنییەکان هەر شتە لەکاتی خۆیدا باسیدەکەن و لێی دەکۆڵنەوە، گوێش نادەنە ئەو باس و لێکۆڵینەوانەی ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە خۆیانەوە نەبێت. ئەمە جگە لەوەی کە بە پێی سیاسەتی حکومەتانی ژاپۆن کەس نابێت بیروباوەڕو ڕێبازی ژاپۆن لەناو گەلاندا بڵاوبکاتەوە بەڵکو هەر باسکردن و لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی کاروباری عەسکەری هەبێت دەبێت لە شوێنی نهێنیدا بپارێزرێت، بۆیە لە ژاپۆن ئایدیۆلۆجیستی وەکو ماهان و کۆربێ و کاستکس پەیدا نەبووە.

بێگومان ڕەوشت و ڕەفتاری ژاپۆنییەکان چ لە کۆڕی تیۆری و بڵاوکردنەوەداو چ لە کۆڕی تەماعکاری و داگیرکرندا پەیوەندییەکی توندو تۆڵی بەهۆیە مێژوویی و ئایدیۆلۆجییەکانی خۆیانەوە هەیە کە هەر لە سەرەتای کۆچکردنیانەوە بۆ ئەم پارچە زەوییەی ئێستا تیایا دەژین تا ئەمڕۆژەی ئێستایان خۆی گرتووەو ڕاستبۆتەوە.

هەڵکەوتی ژاپۆن لە ئاسیادا وەك هەڵکەوتی بەریتانیا لە ئەوروپادا وابوو، بەڵام بەریتانیا کەوتبووە تەك چەند دەوڵەتێکی ئەوروپایی بەهێزو ژاپۆن کەوتبۆوە نزیك دەوڵەتانی بێهێزەوە. ئەمە جگە لەوەی کە چەند هۆیەکی تر یارمەتی دەستدرێژی ژاپۆنییەکانی داو ڕێگای جەنگخوازی بۆ خۆشکردن وەکو نەبوونی هێزێکی چەکداری گەورە لە ناوچەکەیاندا، واتە لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و هەڵکەوتی دوورەدەستی وڵاتی ژاپۆن و هەڵکەوتی دورگەکانی ژاپۆن لەناو ئۆقیانوسی باسفیکدا. لەگەڵ ئەم هەموو هەلومەرجە لە بارەداو گەلێ هەلومەرجی لەباری تر کە باسکردنی هەموویان لەم نووسینەدا جێگای نابێتەوە، ژاپۆنییەکان هێزی دەرياييان

بۆ گواستنەوەی سەربازو پاراستنی پاپۆری سەربازهەڵگر بەکاردەهانی هەرچۆن لە کاتی خۆیدا لە خاکی پێشووی خۆیانەوە بە هەمان ڕێگا لە نیشتمانی ئیسپانیا، دابەزیون و داگیریان کردووە. خەڵکی ئێستای ژاپۆن سەدەیەکی ڕەبەق جەنگ و کوشتاریان لەگەڵ خەڵکە ڕەسەنەکەی ژاپۆندا کردووە تا بە زۆر بەرەو ژووړووی ژاپۆن ڕاویاننناون و خۆیان لە شوێنی ئەواندا دامەزراندووە. هەر لەوکاتەوە وەکو لە جەنگی دووەمی جیهانیشدا بە پاپۆڕەکانیان سەربازیان گواستۆتەوە سەر وشکانی و بە هێزی زەمینی سنووره سەر زەریاییەکانیان لە شوێنەکانی تر داماڵیوەو ئەم شان و ئەوشانی هێزەکانی دوژمنیان بە هێزی زەمینی تەنیوە.

بەم شێوەیە چیموتینو، کە یەکەم ئیمپراتۆری ژاپۆن بووەو لە نێوان ساڵی ٦٦٠ تا ٥٨٥ی پێش زایینی فەرمانڕەوابووە، لە دورگەی کیۆشۆوە کە کەوتۆتە خوارووی ژاپۆنەوە لە دەریاکانی ناوخۆوە خۆی گەیاندۆتە شاری ئوساکا لەسەر ڕۆخی خوارووی دورگەی هونشو.

بەڵام هەوڵ و تەقەللای قوبلای خان ئیمپراتۆری مەغۆل کە لە ساڵی ١٢٧٤ و ١٢٨١ زایینیدا ژاپۆن داگیربکات ژاپۆنییەکانی ڕاچڵەکاند. مەغۆلییەکان دورگەی تسوشیمایان داگیرکردو سەربازێکی زۆریان لە ڕۆخی کیوشودا دابەزان و زەرەو زیانێکی زۆریان لە پاپۆڕەکانی ژاپۆن دا. ژاپۆنییەکان گورج و گۆڵییان کرد بە دەستکەلای خۆیان بەڵام مەغۆلییەکان پاپۆڕەکانیان بە کۆکۆیی بۆ خۆیان دەکرد بە قەڵای خۆپاراستن.

هەر لەسەر ئەم ڕەوتە ژاپۆنییەکان لە دوای جەنگی ژاپۆن و ڕوسەوە تا سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهان پاپۆڕە جەنگییەکانی خۆیان بە شێوەیەك دروستدەکرد کە تیژڕەوو فرە ئاگرهاوێژ بێت، پاپۆڕەکانیان لە یەك کاتدا دەیانتوانی هەموو چەکە دامەزراوەکانیان بەکاربهێنن، جگە لەوەی بە هۆی تەکنۆلۆجیای هایدرۆلیکی و کارەباوە درەنگ لەکار دەکەوتن، بەرگەی زەرەرو زیانی دوژمنیان لە پاپۆڕی هاوشانی خۆیان زیاتر دەگرت.

لە ساڵی ١٩٣٧دا کە ژاپۆن لە ناکاو جەنگی دژی چین هەڵگیرساند ژاپۆنییەکان پشتیان بە هێزی زەمینی بەست و پاپۆڕیان هەر بۆ سەرباز گواستنەوە بەکارهانی، تەنانەت نەیانوێرا بارجەکانیان بخەنە کۆڕی جەنگەوە، بە پاپۆڕە کۆنەکانیان

سەربازەکانیان لە ڕۆخی خاکی چیندا دادەبەزان و هەر بەو پاپۆڕانەش دابەزینەکەیان پارێزگاری دەکرد.

هەرچەندە ئەمیراڵ یۆنای وەزیری زەریایی ژاپۆن لە ساڵی ١٩٣٧دا دەیوت[١٩] "سیاسەتی هێزی دەریایی ئێمە تێکدانی بنکەی فڕۆکەو فڕۆکەخانەکەی دوژمنە، تاکو فڕۆکەکانی دوژمن نەگەنە خاکی سەرەکی ژاپۆن" بەلام هەر نیازی لەوە بۆ گەلانی ناوچەکەو ئەوروپا بەم قسانە فریو بدات گوایە نیازی خۆپاراستنە نەك داگیرکردن" کەچی بە کردەوە ڕۆخەکانی کۆریاو فڕۆکەخانەو بەندەرو بنکە عەسکەرییە گرنگەکانی چینیان داگیرکرد. هەر دوای ئەوە ڕوویانکردە هندی چینی هەر لە کۆریاوە تا تایلاندو سنوری مەلایو.

ئەوی ڕاست بێت تیۆری و نەخشەکانی ئەمیراڵ توجوی سەرەك وەزیران هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ هی پێشینیانی ژاپۆنیدا نەبوو.

واتە ئەرکی گەورەی جەنگ نەخرێتە سەر هێزی دەریایی. بێگومان بەشداربوونی ژاپۆن لە جەنگی دووەمی جیهانی و لەگەڵ دوژمنێکی گەورەی خاوەن هێزێکی دەریایی سامدار هێزی ئەمەریکا کەوتنە جەنگەوە، ناچاری کردن کە چاوێك بە نەخشەی جەنگی ڕابوردوویانا بخشێننەوە. چونکە ژاپۆن شوێنە ستراتیجییەکانی لە کیسچووە گەلێ شوێنی بایەخدارو گرنگ لە نزیك خاکی ژاپۆنەوە کەوتنە دەست دوژمنانی ژاپۆنەوە جگە لەوەی دوژمنەکانی ژاپۆن پڕ بەدڵ حەزیان بە پەلاماردانی ژاپۆن دەکرد.

لەگەڵ ئەمانەشدا هەموو، ئەدوارد میدئیرل دەربارەی ئەم باسە دەڵێت[٢٠] "هێزی زەریایی ژاپۆن، پشتیوانی سوپای ژاپۆنی پێسپێردراوەو هەروا دەگونجێت کە لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو بەریتانیا جیاوازی هەبێت، چونکە لای ئەوان هێزی دەریایی هێزە گەورەکەیەو پشت بە هێزێکی زەمینی بچوك دەبەستێت. هەروەها لەگەڵ بیروڕای فەرەنسایی و ئەڵەمانیشدا جیاوازی هەیە چونکە ژاپۆن هەموو ئامانجەکانی لەسەر زەمین و بە هۆی هێزی زەمینییەوە دەستدەکەون".

بە کورتی ئایدیۆلۆجییەتی هێزی دەریایی بە پێی بۆچوونی جیۆپۆلیتیکسی لەسەر دوو پایەی سەرەکی دامەزراوە، یەکەمیان لای خاوەنانی ئەم ئایدیۆلۆجییەتە لە هەموو هێزەکانی تر گرنگ و بایەخدارتر بووەو هێزی سەرەکی بووە بۆ

جێبەجێکردنی ئاوات و ئامانجەکانیان نەك وەك ئاسایی بەشێك بێت لە هێزی گشتی وڵات و لایەنێکی فرمانی هێزی چەکداری پێبسپێردرێت، دووەم ئەم هێزە فرمانی لە سنووری وڵات پاراستن ڕەتدەبێت و دەبێت بگەیەنرێتە ئاستێك بە ئارەزووی فەرمانڕەواکانی بە زەریاو ئۆقیانووسەکانی جیهاندا بسوڕێتەوە واتە ببێت بە دەزگایەك ئیمپراتۆرییەتی پێدابمەزرێت و جیهانی پێبخرێتە ژێر دەسەڵاتەوە.

بۆیە فردریك راتزڵ بە چاولێکەری لە ماهان کتێبی "دەریا سەرچاوەی مەزنێتی نەتەوەیە"ی بلاوکردەوەو هەر لەم بارەیەوە ریچارد هینینگ لە بەراوردکردنی هێزی زەمینی و دەریاییدا دەڵێت[21] ".. ئەو دەوڵەتە مەزنانەی لە مێژووی نوێدا هاتوونەتە کایەوە، هەموو دەوڵەتی دەریایین و پشتیان بە هێزی دەریایی بەستووەو دەستیان بەسەر ڕێگای دەریاییدا گرتووە".

## هێزی زەمینی

هێزی زەمینی هەروەکو هێزی دەریایی و ئاسمانی و بۆشایی ئاسمان ڕاستەوخۆ بەستراوە بە جیۆپۆلیتیکسەوە، نیازیش لە هێزی زەمینی ئەو هێزەیە کە دەستڕۆیشتوو بێت لە ئاستی هێزەکانی تردا. دەربارەی ناوەڕۆکی جیۆپۆلیتیکسی جیمس فیرجریف لە کتێبی (جوگرافیاو هێزی جیهانیدا *Geography and World Power*).

دەڵێت[22] "سێ هەزار ساڵ لەمەوپێش مەڵبەندە هێزدارەکانی جیهانی بریتی بوون لە ناوجەرگەی بچوك بچوك جارێك لەملاو لەولای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جارێك لەملاو لەولای ئەوروپا لە –میسرو عێراق و فارسی ڕۆژئاوا (نیازی میدیایە) و گریكو ڕۆماو بێزەنتییەکان و بەغدای عەباسییەکان و قاهیرەی فاتمییەکان و مەمالیك و ئەستەموولی عوسمانللی و ئیسپانیاو پورتوگال و فەرەنساو ئینگلتەرەو هۆڵەندە. ئەم مەڵبەندە سیاسیانە لە ئەنجامی دووبەرەکییەکی درێژخایەندا یەك بە دوای یەکدا دەهاتن و ئەمانە (جیهانی بایەخدار بوون)، هەروەها جیمس فیرجریف درێژە بە باسەکەی دەدات و دەڵێت "ئەم جیهانە پشتبەستوو بە هەلومەرجی جوگرافی تایبەتی خۆی توانی گەل و دانیشتوانی خۆی پێشبخات و داهاتی خۆی گەشە

پێبدات ئنجا دوای ئەوە ڕووبکاتە هەرێم و داهاتی بێگانە لەو ناوچانەدا کە پێگەیشتن و پێشکەوتنیان لەمان لەدواتر بووە".

بێگومان لە خوێندنەوەی ئەم بەشە بچوکەی کتێبەکەیدا بۆمان دەردەکەوێت کە زۆر بە وردی لە ناوەڕۆکی جیۆپۆلیتیکس گەیشتووەو سیاسەتی جیۆپۆلیتیکسی ئەو دەوڵەتانەشی ڕوونکردۆتەوە، پێش ئەوەی ئەم جۆرە سیاسەتە ئەم ناوە نوێیەشی لێبنرێت.

ئنجا ماکیندەر دەڵێت[٢٣] "هەموو سەدەیەك جیۆپۆلیتیکسی خۆی هەیە". ئێمەش لەم چەند لاپەڕەیەدا باسی هێزی زەمینی دەکەین. لەبەر تیشکی زانستی جیۆپۆلیتیکسی ئەوکاتەی هێزی زەمینی لە هێزی تر لە هەندێ لای سەرزەمیندا گرنگ و دەستڕۆیشتووتر بوو.

هالفورد ماکیندەر جێگری سەرەکی کۆمەڵەی جوگرافیای شاهانەی بەریتانیا لە وتارێکدا کە لە ساڵی ١٩٠٤ خوێندویەتییەوە دەڵێت[٢٤] "ئەوانەی مێژووی جیهانیان دروستکردووە لەمەولاش دروستیدەکەن، دانیشتوانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپاو دەشتەکانی ڕۆژهەڵات و ناوەڕاستی ئاسیان، تەنگیان بە دانیشتوانی کەنار دەریاکانی ئاسیاو ئەوروپا هەڵچنیوە". ئینجا دەڵێت "ڕاستە هێزی دەریایی پایەیەکی گەورە بوو، کە هێزێکی جیهانی پێدابمەزرێنرێت، بەڵام لە سەدەی بیستەمدا لە چاو سەدەی نۆزدەهەمدا بنکەی زەمینی زیاتری پێویستە لەبەرئەوە هەر بە هێزێکی زەمینی دوورگەی جیهانی (ئەوروپاو ئاسیاو ئەفەریقا)ی دەخرێتە ژێردەستەوە ئەم دورگەیەش هەر لە ڕێگای زەمینییەوە دەبێت بۆیبچیت".

بەلای ماکیندەرەوە، ئەڵەمانەکان دووچاری هەڵەیەکی گەورە بوون کە نیوەی وڵاتی خۆیان لەناو ناوچەرگەدایە "*Heart Land*" وە نیوەکەی تری لە ئەوروپای کەنار دەریادایە، هێرشیان بردە سەر ناوچەرگە -ڕوسیا- بە تایبەتی لە کاتێکدا کە بە جەنگی بەریتانیاشەوە هێزێکی گەورەی دەریاییەوە خەریکبوون.

شارەزا عەسکەرییەکان لایان وایە کە تەنانەت فڕۆکەخانەو بنکە جەنگییە زەمینییەکانی تر پارێزگارییان لە ناوچە جەنگییە دەریاییەکان ئاسانترە.

له ساڵی ۱۹٤۳دا هەروەکو دەیان ساڵ لەوەپێش یەکێتی سۆڤییەت بەڵگەی سەرکەوتنی یەك لە دوای یەکی دەخستە پێشچاوی دەوڵەتان، ئەوەندەی تر پشتی ئەو جیۆپۆلیتیکسانەی بڕوایان بە سەرەتای (هەرێمی ناوجەرگە) هەبوو قایمتر کرد.

هەر لەبەرئەم هۆیەش بوو جەنەراڵ هۆسهوفەر زۆر بە وردی نووسینەکانی هالفورد ماکیندەری دەخوێندەوەو دەبوو بەهاوبیری و بەپێی دەستکەوتی ئەڵمانیا داوای جێبەجێکردنیانی دەکرد. لای هۆسهوفەر وابوو ئەگەر یەکێتی سۆڤییەت و ئەڵمانیا کە بە ناوجەرگەی جیهانی دەزانین یەکبگرن کە خاوەنی هەموو هەلومەرجێکی ستراتیجین، بەمە ئەڵمانیا دەگاتە پایەی هێزێکی جیهانی. بە قەڵایەکی گەورەی دەزانی کە لە (ڕووباری ئالپەوە لە ڕۆژئاوای ئەورووپاوە تا ڕووباری ئامور لە ڕۆژهەلاتی ئاسیادا دەگرێتەوە)، ئەمە دەبێت بە بنکەیەکی ناوەکی هێزە ئەڵمانییەکان دەتوانن بۆ هێرشبردنە سەر هەموو لایەك بەکاریبهێنن. پیشەسازییە بایەخدارەکانی لە هەرێمە ناوەکییە دوورەکانن، سامانی ئوکرانیاو قەفاس و ئوراڵ دەکات بەیەك.

ئەڵمانیا دەکات بەو دەوڵەتە بێهاوتایەی کە ئابوورییەکی پڕ بە پێستی خۆی لەبەردەستابێت.

هەروەها دەربارەی هێزی جیهانی گەورە فەردریك راتزل دەڵێت[٢٥] "پەیوەندییەکی توند لە نێوان هێزی زەمینی و هێزی سیاسیدا هەیە، ڕووبەری گەورەو داهاتی ئەم ڕووبەرە گەورەیە هەر لە دەوڵەتی زەمین فراواندا دەستدەکەوێت، وەکو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ڕوسیاو ئوستراليا، کە بەراورد ناکرێن لەگەڵ دەوڵەتەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوای خاوەن زەوی بچوك و داهاتی کەم".

لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی کە ئەمەریکاو دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکانی ئەورووپا پەیمانە عەسکەرییەکانیان دامەزراند، بەلای عەسکەرییە ستراتیجییە ڕۆژئاواییەکانەوە هەر بۆ ئەوە بوو بەهێزی دەست و پەل (الاطراف) هێزی ناوجەرگە (*Heart Land*) گەمارۆ بدەن. ئیتر ڕەنگە ئەم پێشەکییە کورتە بەس بێت بۆ هاتنە سەر گەوهەری باسی هێزی زەمینی.

گەلێك زانایانی عەسکەری لایانوایە، کە هێزگەیاندنە گۆڕەپانی مەبەست و جەنگ، مۆڵەتی دەستپێشکەری دەداتە دەست و ئەم دەست پێشکەرییەش گرەوی جەنگی زۆر جار پێ دەبڕێتەوە.

بێگومان هێزگەیاندنیش لە کاتی پێویستدا هۆی ڕاگەیاندنی تایبەتی دەوێت کە بەو جێگاو کاتەوە بەستراوە.

ڕۆمانییەکان لە لایەکەوە پاپۆڕیان دروستدەکردو لە لایەکی ترەوە ڕێگایان دەکردەوە بەمجۆرە لەچاو گەلانی تری جیهانی کۆندا پێشترکەوتن. هەروەها سوپای ئیسلام بە هۆی وڵاخ و ئەسپ و سوارچاکییەوە لە جموجوڵ و هاتوچۆدا سوپاکانی دوژمنانی ئیسلامیان بەزاندو بۆیان بو بە هەلومەرجێکی لەبار کە گرەوی جەنگی پێبەرنەوە.

هەروەها پروسیا لە ساڵی ١٨٧٠دا لە کاتی جەنگی پروسیاو فەرەنسادا بە شەمەندەفەر هێزەکانی خۆی گەیاندە ناوچەکانی جەنگ، کەچی فەرەنساییەکان سەربازەکانی خۆیان بە پێ دەخستە ڕێگا کە ئەمە دەستپێشکەری خستە تەك لەشکری پروسیا.

ئەوی ڕاست بێت لەوەتەی پاپۆڕی چارۆکەدار (السفن الشراعیه) کەوتۆتە ناو ئاوەوە تا ساڵی ١٨٣٠ هێزی دەریایی بووبوو بە هێزێکی بایەخداری گرنگ، بەڵام دوای پەیدابوونی شەمەندەفەر ئیتر وردە وردە هێزی دەریایی تا دەهات بەرەو کزی دەڕۆیشت و هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو ستراتیجییەتی بە هێڵی ئاسن سەربازو تفاقی عەسکەری گواستنەوە باری هێزی دەریایی لەنگ کردو بوو بە پایەیەکی گەورە بۆ سەرخستنی هێزی زەمینی بەسەر هێزی دەریاییدا.

پشت بەستوو بە بایەخی ئەم ستراتیجییەتە ڕوسیای قەیسەری بەشێکی ئاسیای، واتە تاشقەندومەرۆی و کۆشکاو ئەشخابادی لەگەڵ روسیای ئەوروپاییدا بەست بەیەکەوەو ڕێگای خستە سەر سنوری ئەفغانستان و ئێران کە دوو دەوڵەتی جیاکەرەوەن (الدول الحاجزة) خاکی ڕوسیایان لە هندستان و خلیج جیادەکردەوەو بەست بوون بەرامبەر هێزەکانی ڕووس.

لە لایەکی تریشەوە ڕێگایەکی تری زەمینییان گەیاندە کەنارەکانی دەریای ژاپۆن و دەریای چین و ئۆقیانووسی باسفیك، بەمپێیە بەکارهێنانی هێڵی ستراتیجی

ئاسن هێزێکی زەمینی ڕوسی بایەخداری هانییە کایەوە کە ئەم هێزە هەڕەشەی لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاست و دووری سەر بە بەریتانیای مەزن دەکرد.

سەبارەت بەوەی کە بەریتانیا دووچاری هەڕەشەیەکی تریش بووبوو بە ناچاری بۆ ئەوەی هێزێکی گەورەی زەمینی ڕوسی و هێزێکی دەریایی گەورەی بەریتانیا بە یەکا هەڵنەپژێن، ڕێککەوتننامەیەکی لە ساڵی ١٩٠٧دا لەگەڵ ڕوسیای قەیسەریدا مۆرکرد.

ئەم مەترسییەش هەر هێڵی ئاسن (سکك الحدید) دەسکەلاکەی بوو، ئەڵەمانییەکان هێڵێکی ئاسنیان تا ئەنادۆڵ ڕاکێشاو پرۆژەی هێڵێکی تریشیان لە بەرلین-ەوە تا بەغدا خستە ناوناوانەوە تاکو بەم ڕێگا زەمینییە گورجەدا هێزی زەمینی بگەیەننە -دوورگەی عەرەبی- و ئەو هێڵە ئاسنانەی تورکەکان ئەنازۆڵیان بە ڕۆژهەڵاتی نزیك و نیمچە دورگەی عەرەبەوە بەست هەموو بە سەرمایەی ئەڵەمان و شارەزایی ئەندازیارە ئەڵەمانیەکان دروستدکرا، ئەم هێڵە ئاسنانە هێزە زەمینییەکانی ئەڵەمانیاو تورکیای ئەگەیاندە کەنار کەنداوی سوێس. ئیتر ئەم هەڕەشە دوولایەنە یەکێکیان دژی هندستان و ئەویتریان دژی میسر بەریتانیای ناچارکرد پەنا بەرێتە بەر هێزی زەمینی و پارەیەکی زۆری تیا خەرجبکات.

هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو ژاپۆنییەکان لە ساڵی ١٩٤١دا لە چەند لایەکەوە بە ئاسانی بەسەر هێزی بەریتانیادا سەرکەوتن. ئەوەی ڕاست بێت هێزی بەریتانیا لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، لەچاو جەنگی دووەمی جیهانیدا باش و لەبارتربوو، ڕەنگە ئەوەش لەبەر ئەوە بێت لە لایەکەوە سامان و دەرامەتی ئەوسای باشتر بوو وە لە لایەکی ترەوە لە جەنگی دووەمدا قورسایی هێزە زەمینییەکانی زیاتر بە سەرەوە بوو. ئەوەبوو لە شەڕی دەنکەرك و مەندەلای‌یدا زەرەرو زیانێکی زۆری لێکەوت. بەڵام تێکەڵبوونی هێزێکی زەمینی مەزنی یەکێتی سۆڤییەت و هێزێکی دەریایی مەزنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە پاڵ بەریتانیادا لە جەنگی دووەمی جیهانی باری بەریتانیای لە دۆڕاندنەوە خستە سەر سەرکەوتن.

زۆر دەمێکە کۆمەڵێك لە شارەزایانی عەسکەری سەر بە جەنەراڵ هوسهوڤەر کە لە ناوچەی زەریای ناوەڕاستدا بەم جۆرە کاروبارانەوە خەریکبوون لایان وابوو کە بە ئاسانی لە زەمینەوە هێرش دەبرێتە سەر بنکە دەریاییەکانی بەریتانیا. هەر جۆزیف مایزەر دەیوت ئەم تۆپە دووربڕە تازانە هەموو دەزگاو دامەزراوە دەریاییەکانی ئینگلیزی لە جەبەل تاریقدا بێبایەخ کردووە، چونکە لە ناوچە نزیکەکانی ئیسپانیاو لە ناوچەی مەراکیشی ئیسپانیاییەوە بە ئاسانی دەیانتوانی تۆپ بارانیان بکەن.

هۆسهوڤەر خۆشی دەربارەی لاوازی بنکە دەریاییەکانی ئینگلیز لە ئاست بنکەی چەکی زەمیندا دەیوت[٢٦] "هەرچەندە بنکە دەریاییەکانی ئینگلیز لە هۆنگ کۆنگ و سەنغافوورەدا بۆ خزمەتگوزاری هێزی دەریایی بە کەڵکن بەڵام قەڵای بەرگری ئەوتۆیان نییە لە ئاست هێرشی زەمینی و هێزێکی چەکداری نوێدا خۆیان پێڕابگیرێت". ئەوی ڕاست بێت پێشبینییەکەی هۆسهوڤەر لە جەنگی دووەمی جیهانیدا هاتەدی و ژاپۆنییەکان سەنغافورەیان گرت.

هەروەها دورگەی کریت بە هۆی سەربازی پەڕەشووتی ئەڵەمانییەکانەوە گیرا کە ئەبوو لە دەریاوە بۆی بچونایە دوای ئەمەش فڕۆکە جەنگییەکانی ئەڵەمان بە بۆردومانکردن هێزە زەریاییەکانی ئینگلیزیان لە دەریای ناوەڕاست و دوورگەی ماڵتەدا بە جۆرێك شپرزە کرد پێیان نەکرا دەست بخەنە ڕێگای دابەزاندنی چارەکە ملیۆنێك سەربازی ئەڵەمانی لە ئەفەریقادا.

بە کورتی بەلای عەسکەری جیۆپۆلیتیکسییەکانەوە ئاستی جوڵانەوەی لەشکرو چەك و تفاقی جەنگیو هۆو پایەی ئەم جوڵانەوانە هەردووکیان بایەخێکی ئێجگار گەورەیان هەیە.. بۆیە دەڵێن لە سەرەتاوە ئەسپ و وڵاخ بایەخیان بە هێزی زەمینی داوە ئینجا پاپۆری باگێڕ (پەردەدار) بایەخی بە هێزی دەریایی و دوای ئەم جارێکی تر هێزی زەمینی بە هۆی شەمەندەفەرو ماشێنی مرۆڤ هەڵگرو بار بەرەوە کەوتۆتەوە برەو.

بەڵام گەوهەری ئەم بابەتە هەر دێتەوە سەر ئەو ڕێبازەی کە لە چ جێگایەك و لە چ چەرخ و زەمانێکدا چ هێزێك دەبێت بە هێزی جیهان گیرو ئامانجی دەوڵەتێکی گەورەی تەماع لە خاکی دەوڵەتان و سامانی دەوڵەتان کردوو جێبەجێی دەکات.

## هێزی ئاسمانی

هەروەکو ماهان سەر دەستەی هەموو ئایدیۆلۆجیستەکانی هێزی دەریایەو کلاوزفتز هی هێزی زەمینییە هەروەها سیڤیریسکی لە ئایدیۆلۆجیستە بەناوبانگەکانی هێزی ئاسمانییە. هێزی ئاسمانیش هەروەکو هێزی دەریایی وردە وردە دوای پەیدابوونی پێگەیشتووەو گەورەو دەسەڵاتدار بووە تا گەیشتۆتە ئەو پایەی کەسانی وا هەڵکەون بە شاهێزی بزانن و ئومێدی دەسەڵاتداریێتی جیهانی پێبسپێرن.

ئەوی ڕاست بێت ئەو گیروگرفت و کۆسپ و تەگەرانەی دێنە ڕێگای هێزە زەمینی و زەرياييەکانی دەوڵەتان لە ئاستی هێزی ئاسمانیدا زۆر بێبایەخ و بێدەستەڵات دەبن. فڕۆکەوان کە هەزاران پێ لەسەر زەمین بەرزدەبێتەوە ئنجا گرەێتی زەمینی بە تەواوی دێتە بەرچاو، نە شاخ و کێوو نە دەریاو نە دارستان و جەنگەڵ و نە سەرماو گەرماو نە ڕێگەوبانی دوورو درێژ دەبن بە کۆسپی سەرەڕێگە.

بۆیە نووسەرانی گۆڤاری *Fortunet* فۆرچونێت" لە ساڵی ١٩٤٣دا لایان وابوو ئەوانەی بتوانن دەستبەسەر بنکە ستراتیجییە ئاسمانییەکاندا بگرن دەبن بە گەورەترین هێزی سەرزەمین.

ئەم لێکۆڵینەوەیە هەروەکو لێکۆڵینەوەی هێزی زەریایی دۆست و ناحەزی هەبووە، بەڵام نیاز لە لێکۆڵینەوەکە بە پێی بیروباوەڕی جیۆپۆلیتیکسی ئەوەیە کە ئایا دەوڵەتێکی خاوەن هێزێکی ئاسمانی کاریگەرو دەست ڕۆیشتو و بە سام دەتوانێت بگاتە پایەی یەکەم دەوڵەتی مەزن لە جیهاندا؟ ئایا بەم هێزە جیهانی بۆ ئارام دەکرێتودەستی بەسەر هێزەکانی تردا دەگیرێت؟

ئەگەر نیازم لەم لێکۆڵینەوەیە ئەوە نەبێت کە بۆ ئەم نیازە باسی هێزی ئاسمانی بکرێت خۆ هەموو ئەفسەرێکی هێزی ئاسمانی یان فڕۆکەوانێکی عەسکەری ئەو سەرەتایە دەزانێت کە هێزی ئاسمانی و فڕۆکەی جەنگی چەکێکە لە تەك چەکە زەمینی و دەریاییەکاندا فرمانی پاراستنی وڵاتی پێسپێراوە. یان لەکاتی جەنگدا پێش هێرشبردنی پیادەو بەشەکانی تری هێزی زەمینی بنکەو لەشکرو سەنگەرەکانی دوژمن بوردومان دەکات و لەکاتی کشانەوەی هێزیشدا پەلاماری دوژمن دەدات و

سەر لە لەشکرە هێرش بەرەکە دەشێوێنێت، کە بە ئاسانی نەتوانێت هەڵبکوتێتە سەر هێزە کشاوەکەو زیانی زۆری لێبدات.

تا زیاتر باسەکەمان ڕوونبکەینەوە، پەنا دەبینە بەر ئەو تیۆرییانەی دەربارەی هێزی ئاسمانی بڵاوکراونەتەوە.

بێگومان کە باسی هێزی ئاسمانی دەکرێت پێویستە پێش هەموو شتێك بیر لە فڕۆکە بکرێتەوە، چییەو چی پێدەکرێت.

یەکێك لەو کەسانەی بەشداری تیۆری دانانی هێزی ئاسمانی بوون "دۆهێ" بوو دوای دۆهێ ئنجا "میتشل" ئەم دووانە وتوێژێکیان خستە ناوناوانەوە نزیکەی بیست ساڵی خایاندو لەگەڵ تەواوبوونی جەنگی دووەمی جیهاندا کۆتایی پێهات.

بناغەی سەرەکی ئەم بیروباوەڕەش بەوە دامەزرابوو کە فڕۆکە لە هەموو چەکێکی تر خێراو بەرزڕەو وێرانکەرترە، بۆیە شا چەکی جیهانە، دیارە ئەوانەی کلاسیکیانە دەیانڕوانییە هێزی ئاسمانی وەك بەشێکی تر جێگایان بۆ تەرخانکردبوو، بە پێچەوانەی ئەم بیروباوەڕە تازەیە فڕۆکەیان دەخستە خانەی چەکێکی هاوکاری چەکەکانی ترەوە.

ئەگەر بڕێك لە سەرەتاوە چاو بە بایەخی هێزی ئاسمانیدا بخشێنین بە تایبەتی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی کە نەخشەدانان بۆ هێزو دەسەڵاتی فڕۆکەی جەنگی هەر لە خانەی پێشبینیدا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە ساڵی ١٩٢١دا بە چەکی ئاسمانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە نزیك ڤێرجینیاوە کۆنە باریجەیەکی ئەڵەمانی ئوستفریزلاند-یان نوقمی بن دەریا کرد، نیازیان لەم کردەوەیە ئەوەبوو کە بە ناحەزانی دەسەڵاتی جیۆپۆلیتیکسانەی هێزی ئاسمانی بسەلمێنن کە هێزی ئاسمانی دەسەڵاتێکە لەوکاتەوەی کەوتۆتە کایەوە نەك هێزێکی دەسەڵاتداری دواڕۆژ بێت.

ئایدیۆلۆجیستی هێزی ئاسمانی جیلیودۆهێ لە ساڵی ١٨٦٩ هاتۆتە جیهانەوەو لە ساڵی ١٩٣٠دا لە تەمەنی شەست و یەك ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە. لە سەرەتای ژیانی عەسکەرییەوە ئەفسەری تۆپخانە بووەو لە ساڵی ١٩٠٩دا باسێکی دەربارەی هێزی ئاسمانی نووسیوەو لە ساڵی ١٩١٥دا بڕوای بەوە هەبووە کە بە جەنگێکی فراوان بە هێزی ئاسمانی ورەی هاووڵاتیانی دوژمن لە ڕەگوڕیشە

هەڵدەکەندرێت. لەو بڕوایەدا بوو هێزی ئاسمانی دەتوانێت نەتەوە دوژمنەکان تەفروتونا بکات.

ئەوەندەش بە ڕقوکینەوە بیروڕای خۆی دژی سەرکردە عەسکەریە ئیتالیەکان بڵاودەکردەوەو قسەی دەکرد تا دایان بە دادگاو بە ساڵێك زیندانیان گەیاندن، بەڵام لە ساڵی ١٩٢٠ زیندانییەکەیان لەسەر لابردو لە ساڵی ١٩٢١دا گەیاندیانە پلەی جەنەراڵ.

ئیتر لەم ساڵەدا نووسینە گرنگەکانی ئەکەونە پێشچاو، لەکاتی سەرکەوتنی فاشستەکانا لە ڕۆما کرا بە قۆمیسێری ئاسمانی بەڵام دوای ئەوە خۆی دەستی لەکارکێشایەوەو خۆی بۆ کاروباری ئایدیۆلۆجی تەرخانکرد.

بەڵام ولیم میتشل پاش دۆهێ بە دە ساڵ هاتۆتە دنیاوەو لە ساڵی ١٩٣٦دا کۆچی دوایی کردووە، لە ساڵی ١٨٩٨دا لە هێزی پیادەدا بووە دوای ئەوە ئەفسەرێکی بچوك بووە لە ئالاسکا، بایەخی ستراتیجی ئالاسکاو ناوچەی "قطبی" سەرنجی ڕاکێشاوە لە ساڵی ١٩١٦دا فێری فڕۆکەوانی بووەو لە ساڵی ١٩١٧دا لە هێزی ئاسمانی ئەمەریکادا کاریکردووە. ئیتر وردە وردە لە هێزی ئاسمانیدا پلەی بەرزبۆتەوە تاکو چەند هەفتەیەك پێش تەواوبوونی جەنگی یەکەم بووە بە سەرکردەی ئەم هێزە.

سەبارەت بەوەی بە پێویستی دەزانی کە هێزی ئاسمانی بەشێك نەبێت لە سوپاو هێزی زەریایی بەڵکو هێزێکی یەکگرتووی سەربەخۆ بێت، کەوتە ناحەزیکردن لەگەڵ بەڕێوەبەرانی ئەو دو هێزە تا دایان بە دادگای عەسکەری و پێنج ساڵ نیشانی عەسکەرییان لێداملی، لە ساڵی ١٩٢٦ دەستی لە کار کێشایەوەو ئەو دە ساڵەی لە ژیانا مابووی بۆ کاروباری نووسینو دامەزراندنی هێزێکی ئاسمانی سەربەخۆی تەرخانکرد.

بەڵام بیروباوەڕی دۆهێ لە دوای ساڵی ١٩٢١ دەربارەی هێزی ئاسمانی گەڵاڵە بوو بە تایبەتی دوای ئەو نووسینەی بە خەیاڵیا هاتبوو دەربارەی ئەو جەنگە چاوەڕوان کراوەی لە نێوان ئەڵەمانیاو فەرەنسادا ڕوودەدات. ئەوی ڕاست بێت پایە سەرەکییەکانی تیۆری دۆهێ دەربارەی هێزی ئاسمانی ئەمانەی خوارەوە بوون:

١-فرۆکە چەکێکی هێرشبەرە، خاسییەتی بەراوردنەکردنی هەیە، ئەو پێشبینییەش ناکرێت کە بتوانرێت بە باشی بەربەرەکانی بکرێت.

٢-بە وێرانبوونی ناوچە ئاوەدانەکان ورەی خەڵکەکەی هەرەسدەهێنێت.

بە پێی ئەم دوو پایەیە بیری لەم خاڵانەی خوارەوە کردەوە:

أ-تا بە باشی پارێزگاری وڵات بکرێت، پێویستە لە کاتی جەنگدا ئاسمانمان لەژێر دەسەڵاتدا بێت.

ب-دەبێت لە سەرەتای جەنگدا بیر لە وێرانکردنی پیشەسازی و ناوچە ئاوەدانە پڕ خەڵکەکانی دوژمن بکەینەوە نەك لە دامەزراوە عەسکەرییەکان.

ج-نابێت بە جەنگی ئاسمانی بیر لە لەناوبردنی هێزی ئاسمانی دوژمن بکەینەوە بەڵکو پێویستە ئەو دەزگاو فابریقەو دامەزراوانە تێکوپێك بدەین کە دەبنە سەرچاوەی بوون و چالاکیان.

د-دەبێت هێزی زەمینی بەشی پارێزگاریکردنی پێبسپێردرێت و نەیەڵێت دوژمن لە زەمینەوە پێشڕەوی بکات و دەست بەسەر ڕێگاوبان و پیشەسازییەکان و دەزگاکانی هێزی ئاسمانیاندا بگرێت. تاکو هێزی ئاسمانیمان فەرمانی ئیفلیجکردنی تفاق و کەلوپەل بە هێزەکانی دوژمن گەیاندنی پێبسپێردرێت و کارێك بە گەلی دوژمن بکات بیر لە درێژەدان بە جەنگ نەکاتەوەو ورەو توانای بڕوخێنێت.

ه-دەبێت فرۆکەی جەنگی ئەوتۆ دروستبکرێت، کە فرۆکە بۆمباهاوێژەکانی دوژمنی پێ لەناوببرێت و لە هەمان کاتدا بە کاروباری خۆپاراستن و وێرانکاریش هەڵسێت.

دەربارەی خاڵی سێیەم دۆهێ خەیاڵی لەوە دەکردەوە کە پێشەکی پێویستە بنکەو تۆپە تەیارە شکێنەکانی دوژمن لەناوببرێت تا هێزی ئاسمانی بە سەربەستی دەستی کوشندە لە دوژمن بوەشێنێت و زەمینەی هاتوچۆو چالاکی ئاسمانی بۆ تەخت ببێت.. بەڵام چ دەوڵەتێکی گەورە هەیە بیر لەوە نەکاتەوە کە ئەم بنکەو تۆپی تەیارە شکێنی خۆی بە جۆرێك نەپارێزێت، کە نەیەڵێت بگات بەومەرەیە.

هەرچەندە لەناو دەوڵەتانی بچوك و مامناوەندیدا دوور نییە کارەساتی وا ڕووبدات وەکو "ئیسرائیل"ییەکان لە جەنگی ١٩٦٧دا بە میسریان کردو هێزی ئاسمانییان فرۆکەخانە جەنگییەکانی میسریان غافڵگیر کردو هێزی ئاسمانی

میسریان ئیفلیج کردو ئاسمانی میسرو بیابانی سیناوکۆرەکانی جەنگیان بۆ چالاکی ئاسمانی خۆیان خستە سەرپشت و بە پێی نەخشەیەکی ترو بە یارمەتی دەزگا ئەلکترۆنییە سەرلێشێوێنەکانیان هەمان مەبەستیان لە ئاسمانی لوبناندا لە پەلامارەکەی ئەم دواییەیانە دووپات کردەوە.

سەبارەت بە وێرانکردنی شارەکانی دوژمن دەیوت ئەگەر ناوچەیەکی بچوك بە ٢٠ تەن بۆمبای فڕۆکە وێران ببێت ئیتر بە پێی ڕووبەری هەر شارێك چەند ئەوەندە بۆمبای پیا بماڵیت هەمووی وێراندەکەیت و خەڵکەکەی دوای چەند جارێك هەموو ئەوشارە یان ئەو شارانە چۆڵدەکەن و ڕوودەکەنە دەشت و دێهات و هاوار بۆ حکومەتەکەیان دەبەن کە ئیتر دەست لە جەگ هەڵگرێت.. هەروەها لە بەکارهێنانی بۆمبای هەمەجۆردا، سوتێنەرو کیمیایی و جۆرەکانی تر بیری لە گیانی مرۆڤایەتی و یاسای نێودەوڵەتان نەدەکردەوەو بەکارهێنانی هەموو چەکێکی لە پێناوی دەستگرتن بەسەر ولاتان و سەرکەوتندا بە ڕەوا دەزانێت، بۆیە دەڵێت "لە پێناوی دەسکەوتی تایبەتی و مانەوەدا نرخی هیچ بیروباوەڕێك نامێنێت و هیچ پەیوەندییەك خۆی بۆ ڕاناگیرێت، تەرازووی مرۆڤایەتی تێکدەچێت و یەك سەرەتا بە دەستەوە دەمێنێت، ئەویش لە بریتی ئەوەی بتکوژن تۆ بەرامبەرەکەت بکوژە!!".

بەلام ئەدوارد میدئیرل لایوایە کە دۆهێ دەربارەی فەرمانی وێرانکاری فڕۆکە ئەم خالانەی خوارەوەی فەرامۆش کردووە.

١-هەندێ خانەو بینا هەیە بەرگەی وێران کاری دەگرێت و فڕۆکە زیانێکی ئەوتۆی پێناگەیەنێت.

٢-هەموو جارێك فڕۆکەکان نیشانەکانی خۆیان ناپێکن.

٣-زۆر جێگای وێرانکراو هەیە لە جیاتی جارێك چەند جارێکی تر بە فیڕۆ بۆردومان دەکرێتەوە.

وە نەبێ دۆهێ وەکو بەرزەکی بانان ڕزگاری بووبێت و بیروڕا نامرۆڤایەتییەکانی بێگیروگرفت بلاوبووبێتەوە، گەلێك کەسانی مرۆڤ پەروەرو ئازادیخواز لێی ڕاپەڕیون و بیروباوەڕە دوژمن بە مرۆڤایەتییەکانیان ڕسوا کردووە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دۆهێ پیاوێکی بە سەبرو لەسەرخۆ بووەو هێمنانە وەلامی ئەوانەی داوەتەوە. کە وەلامی جەنەراڵ باستیکو دەداتەوە دەڵێت[٢٧] ".. ئەگەرچەکی ئاسمانی

کیمیایی له جەنگی داهاتوودا چەکێکی کاریگەری لەناو بەربێت ئەوە دەستکردی من نییه، لەبەرئەوە له پێناوی ئەمەدا من نه شایستەی ستایشم و نه هی بەدناوی".

دەربارەی وێرانکاری شارو دامەزراوه پیشەسازی و ئابوورییەکان بیروڕای میتشڵ له بیروڕای دۆهێ وه زۆر نزیك بوو، جیاوازییه ئاشکراو دیارەکانی نێوانیان ئەوەیه میتشڵ تورەو قسه ڕەق بووه لەگەڵ ڕەخنەگران و ناحەزانیا، دۆهێ هێمن و لەسەرخۆ بووه.

میتشل دەربارەی وێرانکاری شارەکانی دوژمن دەڵێت[٢٨] "پێویست ناکا بۆ وێرانکردنی شارێك هەمو خانووەکانی بەسەر یەکدا بڕوخێنرێن و بکرێن به کەلاوە، بەڵکو خەڵك و دانیشتوانەکەی ناچار بکرێن کاروباری ڕۆژانەیان پێنەکرێت و خانەکانیان بەجێبهێڵن. به چەند بۆمبایەکی به گاز داگیراوه ئەم ئامانجه جێبەجێدەکرێت..".

هەر به پێی ئەم ڕەوتە ئامانجەکانی هێزی ئاسمانی بەم جۆرەی خوارەوه دەستنیشاندەکرد "وێرانکردنی فابریقەکان، دەزگاکانی هاتوچۆکردن، ئەو ناوچانەی خواردەمەنییان تیایە، کێڵگەکانی کشتوکاڵ، ئەو ناوچانەی سووتەمەنییان لێوه دێت، ناوچه ئاوەدانەکان..".

هەروەها به پێویستی دەزانی هێزی ئاسمانی هێزە زەمینی و دەریاییەکانی دوژمن تێکوپێکبدات.

دیاره هاری ترومان سەرەك کۆماری پێشوی ولاته یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەم ڕێبازەی سەرەوەی میتشل-ی به ڕاست دەزانی بۆیه چل ساڵ لەمەوپێش دوو بۆمبای ئەتۆمیدا بەدوو شاری ژاپۆنداو چارەکه ملیۆنێك ژاپۆنی بێتاوانی کوشت.

بێگومان میتشل ئاوێکی باشی بۆ کاربەدەستانی دواڕۆژی ولاته یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ڕشتووەو ئامانجی جیۆپۆلیتیسکانەی بۆ بەڕێوەبەری پشت پەردەکانی ئەم ولاته ڕوونکردۆتەوە، بۆ مۆنۆپۆلی و ملیاردێره خاوەن پیشەسازی دەزگا ئابوورییه گەورەکانی ئەم ولاته. ئەمیش وەکو هەموو خاوەن بیروباوەڕێکی نوێ دووچاری دووبەرەکی و ناکۆکی بووه به تایبەتی لەگەڵ عەسکەرییه کلاسیکییەکانی ئەمەریکادا، چونکه ئەم هێزی ئاسمانی به پێشەنگ له قەڵەمدەداو هێزی زەریایی و زەمینی به دەستکەلاو یاریدەدەر.

دوابەدوای میتشل، ئەلکسەندەر سیڤریسکی، کە فڕۆکەوانێکی عەسکەری بوو، بەرەگەز ڕوسەو خۆی کردووە بەئەمەریکایی لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا بەشداربووەو ئیتر خوی داوەتە فڕۆکە دروستکردن و لەم مەیدانەدا جێدەستی دیارە.

کە کتێبی "بەهۆی چەکی ئاسمانییەوە سەرکەوتن"ی دانا وتی بیروباوەڕەکانی میتشل دەربارەی چەکی ئاسمانی هانیداوم ئەم کتێبە دابنێم.

بڕوای زۆر بەوە بووە کە چەکی ئاسمانی نابێت بەشێك بێت لە هێزی زەمینی چونکە چەکی سەرەکی دواڕۆژە.

لە کاتی خۆیدا لایوابوو کە دوای پێنج ساڵ بێوچان گرتن فڕۆکە دەتوانێت ٢٥ هەزار میل بە دەوری زەمیندا بسوڕێتەوە بۆیە گەیشتە ئەو بڕوایەی کە ئیتر کەشتییە گەورە فڕۆکە هەڵگرەکان بە کەڵکی بەکارهێنان نایەن، چونکە فڕۆکەی وا دێتە کۆڕی کارکردنەوە لە بنکەو فڕۆکەخانەکانی کەنار دەریاوە ئەگەنە هەموو شوێنێکی پێویست.

بێگومان ئەوە باشترە لە خاکی نیشتمانەوە فڕۆکەی جەنگی بفڕێت و پەلاماری دوژمن و شوێنە ستراتیجییەکانی بدات تا ئەوەی مشوری بنکەو فڕۆکەخانەی لەم وڵات و لەو وڵاتی بۆ بخورێت. بەلام ئایا فڕۆکەی وا دێتە کایەوە بێ فڕۆکەخانەی دوورە وڵات ئەم فەرمانەی پێ جێبەجێ بکرێت و کەم مەسرەف تریش بکەوێت لەسەر دەوڵەت.

بۆیە گەلێك فەرماندەی ئاسمانی و زەمینی و دەریایی سوپای ئەمەریکا بیروڕاکانی سیڤێریسکییان بە هیچ دەزانی و داهاتنی ئەو جۆرە چەك و فڕۆکانەشیان بە خەیاڵ پلاو لە قەڵەم دەدا.

سیڤێریسکی کە هێزی ئاسمانی ئەمەریکاو یەکێتی سۆڤییەتی بەراورد دەکرد دەیوت[٢٩] "دەرفەتی دەسەلاتی ئاسمانی سۆڤییەتی شێوە هێلکەییەو هەموو کەرتەی ئەفەریقاو خوارووی رۆژهەلاتی ئاسیا دەگرێتەوە، بەلام دەرفەتی دەسەلاتی هێزی ئاسمانی ئەمەریکا شێوە بازنەییە، ئەو ناوچە ناوکۆییەی دەکەوێتە ژێر دەسەلاتی هەردوولایانەوە بە هۆی هێزی ئاسمانییەوە ئەنجامی چارەنووسی تیا دێتەدی "*Area of Decision*" مەڵبەندی ئەو ناوچەیەش دەوروپشتی قوتبی ژووروو یان پێیدەڵێن ناوچەی ناوەڕاستی نیمچە قوتبی (*the Arctic Mediteranean*).

هەروەها سیڤێرسکی کە دەیویست ئەمەریکا دەوڵەتێکی گەورەی جیهانی بێت، بە پێویستی دەزانی ئۆباڵی پاراستنی ڕۆژئاوای جیهان بگرێتە ئەستۆ. سەرچاوەی هێزی نیشتمانی بەم دوو پایەیەی خوارەوە دەزانی:

١-ئەوەی دەوڵەت خاوەنێتی.

٢-چۆن وە بە چ شێوەیەك کەڵکی لێوەردەگریت.

بەشی یەکەمی بریتییە لە خەڵك و شارستانێتی و زانست و بنکەی مادی و ئابوری. بەشی دووەمیش، دەرفەتی ئاسمانی، ئۆقیانووس و دەریاو دوورگە، بەشەکانی وشکانی و کەنار دەریاکان و هەرێمی ژووروو کە بە ناوچەیەکی ستراتیجی هێزی ئاسمانی دەزانی.

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەپێی ئەم بۆچوونەی سیڤێریسکی هەرێمی قوتبی ژووروی کرد بە سەنگەری پێشەوەی خۆی و بە دەزگای ڕادارو فڕۆکەخانەو دەزگای ئاوهەوا ناسین قایمی کرد، لەبەری ئەوبەری قوتبی ژووروشەوە سۆڤییەتییەکان بە هەمان شێوە وڵاتی خۆیان قایمکرد.

نیاز لە ناوچەی ناوەڕاستی نیمچە قوتبی دەریای قوتبی و دەشتاییە کەنار دەریاکانێتی، دەکەوێتە نێوان ئەمەریکای ژوورو و ئاسیاو ئەوروپاوە. چەند دەوڵەتێك خاوەنێتی، بەڵام ٤٩٪ی ڕووبەری ئەم ناوچەیە بەر یەکێتی سۆڤییەت کەوتووە. بەشەکانی تری بەر ئەمەریکاو کەنەدەو دانیمارك و نەرویج و فینلەندە کەوتووە.

ئەم ناوچەیە دوای پێشکەوتنی بە ئاسمانا فڕین بایەخی پەیداکرد چونکە فڕۆکەی بازرگانی بەسەر قوتبدا بە ٢٤ سەعات لە ئۆسلۆوە دەگاتە تۆکیو کەچی هەر بە ڕێگای پێشودا ٥٣ سەعات دەخایەنێت.

ڕێگای ئاسمانی لە نێوان نیویۆرك و مۆسکۆدا ٤٦٧٥ میلەو لە نێوان پەکین و سان فرانسیسکو ٦٦٠٠ میلە هەردوو ڕێگا کە بەسەر ناوچەی نیمچە قوتبیدا پیابڕۆن ٣٠٠٠ میل کورت دەبێتەوە.

جارێك جۆرج مارشاڵ وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەمەریکا دەربارەی بایەخی ستراتیجی ئەم ناوچەیە وتی "گرنیلاند وەك ئەڵقەیەکی بایەخداری سیستەمی پارێزگاری عەسکەری دەمێنێتەوە، کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ڕۆژئاوای

جیهانی پێبپارێزین". هەروەها، کە دانیمارك لە ئایاری ساڵی ١٩٤٧دا یاداشتێکی پێشکەش کردو تیایدا داوای کشانەوەی هێزە ئەمەریکاییەکانی لە گرنیلاندا کرد، لە وەڵامدا وتی[٣٠] "لە پێناوی ڕێکەوتننامەیەکی نوێ ولاتە یەکگرتووەکان ئارەزوی گفتوگۆکردنی هەیە بەڵام ئەم ڕێکەوتننامەیەی ئێستای پێلانابرێت و هێزەکانیشی لە گرنیلاند ناکشێتەوە".

هەروەها جەنەراڵ ئارنۆڵد وتی[٣١] "ئەگەر جەنگی سێیەم هەڵبگیرسێت قوتبی ژورو دەبێتە مەڵبەندە ستراتیجییەکەی". هەروەها واستن لە وتارێکدا بەناوی "کەنەدە ناوچەی دامەزراندنە" دەڵێت[٣٢] "لە ناوچەی ناوەڕاستی نیمچە قوتبییەوە دەستی ئاسمانی لە ولاتە یەکگرتووەکان ئەوەشێنرێت، هەروەها هەر لەم ڕێگایەوە بەرپەرچدەدرێتەوە، سەبارەت بەوەی بازنە گەورەی نیمچە قوتبی پاراستنی گرانە شەرە ڕۆکێتیش (الصواریخ) هەر ئەم ڕێگایە دەگرێت و بەسەر ئەم ناوچەیەدا ڕەتدەبێت".

دەربارەی هێزی ئاسمانی و خووڕەوشتی دیکتاتۆریانەی هێتلەریش مێجەر جورج فیلدنج ئەلیوت لە ساڵی ١٩٣٩دا لە وتارێکدا دەڵێت[٣٣] "ڕازی دەروونی دیکتاتۆر نادیارەو ئامانجەکانی تارمایی دایدەپۆشێت و ناوی تۆقاندنی لێدەبارێت، ئەمڕۆ دزی و داگیرکردن باڵی بەسەر ئەوروپادا کێشاوە، داگیرکردنیش بەبێ هێزی چەکداری ئاسمانی جێبەجێناکرێت".

بە کورتی لەو بینبڕکێیەی دەکەوێتە نێوان دەوڵەتە گەورەکانی جیهانەوە چ لە پێناوی داگیرکەریدا بێت یان لە پێناوی خۆ پاراستندا یاسایەکی دێرین و لە گۆڕان نەهاتوو لە نێواندا فەرمانڕەوایە کە هەر لایەك هەموو هێزو توانای زانیاری و ئابووری و عەسکەری دەخاتە کار بۆ دەستخستنی چەکێکی کاریگەر، ئامانجە تایبەتییەکانی خۆی پێدەستەبەر بکات. دوای سازکردنی ئەم چەکە دوژمن و ناحەزانی ئەولای خاوەن چەك تەقەللا دەدەن چەکێك بدۆزنەوە مەترسی ئەم چەکە تازەیەی پێ لەناوبەرن و ئامانجی پێ پوچەڵ بکەنەوە. ئینجا چەك و هێزێکی چەکداری نوێ بهێننە کایەوە بالادەستی هەموو هێزێکی چەکداری پێشو بێت وەکو ئێستا ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە سەرۆکایەتی ڕۆناڵدریگن دەستی داوەتە چەکدارکردنی بۆشایی ئاسمان کە بە جەنگە ئەستێرە ناوبانگی دەرکردووە.

## جەنگە ئەستێرە Spaee War

هەر زانستی تەکنۆلۆجیا بە تایبەتی عەسکەری پێش دەکەوێت خێرا پێبەپێی ئەم پێشکەوتنە نەخشەی دەزگا عەسکەرییە گەورەکانی دەوڵەتە هەرە گەورەکانی جیهانیش لەگەڵیا دەگۆڕێت.

هەرچەندە نیازو ئامانج هەر لە جێگای خۆیاندا دەمێننەوە واتا دەوڵەتانی گەورەی چاوبرسی و تەماعکار دەبێت هەر دەسەڵاتدارو دەستڕۆیشتووبن (هیمنة) بەسەر جیهاندا بکەن، بەڵام لەهەر کات و جێگایەکدا پەنا دەبەنە بەر جۆرە شێوەو تاکتیکێك. ئەمە جگە لەوەی کە داهاتی ئابوری و کەرەسەی خاوی ستراتیجی نرخ و بایەخی ناوچەیەك بەرزدەکاتەوەو هی ناوچەیەکی تر دێنێتە خوارەوە، وەکو هەموو دەزانین ڕۆژێك لە ڕۆژان ئاڵەت و حێل و زەردەچەوە (بهارات) سەربەسەری خۆیان ئاڵتونیان دەکردو هندستانیان کردبوو بە دووی تاجی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا کەچی ئێستا نیمچە دورگەی عەرەبی ئەو شوێنەی هندستان و بگرە زیاتریش بۆ دەوڵەتانی ڕۆژئاوا بە تایبەتی بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا گرتۆتەوە. هەر لەم ڕۆژانەدا رۆناڵدریگن وتی ئەم ناوچەیە، دەرفەتێکی بایەخدار (مجال حیوی)ی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایەو پارێزگاریکردنی پەیوەندیەکی توندوتۆڵی بە ئاشتی و ئاسایشی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە هەیە.

ئەمە لە لایەك لە لایەکی تریشەوە دەوڵەتە گەورەکان بە پێی هێزو توانای خۆیان جێگاگۆڕکێ لەگەڵ یەکتریدا دەکەن چ ئەوانەی دۆستی یەکترین یان ئەوانەی دوژمن و ناحەز بە یەکتری بوون. کاتێك ئیمپراتۆرییەتی بەریتانیا ڕۆژ لە خاکێکدا ئاوا نەئەبوو ئۆباڵی پاراستنی دەوڵەتانی ڕۆژئاوای هاوپەیمانی گرتبووە ئەستۆ کەچی هەر خۆی دوای ئەوەی دەوڵەت و میللەتە ژێردەستەکانی بە شۆڕش و بە ئاشتی یەك لە دوای یەك لێی داماڵران و ئەو داهات و دەرامەت و سامانەی جارانی بە دەستەوە نەما ئۆباڵی ئەم پارێزگاریەی پێهەڵسوڕێنێت، خۆی داوای لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کرد کە فەرمانی جیهانی ڕۆژئاوا گوایە جیهانی ئازاد! بگرێتە ئەستۆ، لە پاش ئەوەی سەردەمێك بینبڕکێ و ناکۆکی گەورەو دەستڕۆیشتوویی لە نێوان بەریتانیاو فەرەنساداو لە نێوان بەریتانیاو ئەڵەمانیادا بوو

وا ئێستا کەوتۆتە نێوان دوو دەوڵـەتی زۆر گـەورەوە، یـان دوو بـەرەی گـەورەوە بـە سـەرۆکایەتی ئەمەریکاو یەکێتی سۆڤییەت. بۆیـە هـەر لایـەکیان باسـی دەسـەلات و دەسـتکەوت و دەستڕۆیشـتوویی خۆیـان دەکـەن خێرا مەترسـی لاکـەی تـر دەخەنـە پێشچاو.

هەرچەندە گەوهەرو ناوەڕۆکی ناکۆکی نێوان ئەم دوو دەوڵەت و بەرەیـە لەگەڵ هـی دەوڵەتانی باسکراوی پیشودا زۆر جیاوازە، ئەوسا ناکۆکی بـوو لـە نێـوان دوو دەوڵەتی داگیرکەری ئیمپریالی و ئێستا ناکۆکییە لە نێوان ئیمپریالی و سۆشیالیزمدا. بەلام شێوەو قەوارەی ناکۆکییەکە لە چاو جاراندا ئەم جیاوازییـەی هەیـە سەرکـەوتنی سـتراتیجی و پێشـکەوتنی دەزگاکـانی عەسـکەری یـەکێتی سـۆڤییەت بـەرەی سۆشیالیستی و بزوتنەوەی ئازادی خوازانـەی گـەلان بـەرەو پێشـدەبات و دەسـەلاتی ڕۆژئاوا لە جیهانی سێیەمدا بەرەو لێژی دەبات و ئـەمریکا و ڕۆژئـاوا دەتۆقێنێـت، بە پێچەوانەشـەوە بـەرەو پێشـچوونی دەزگـا سـتراتیجییەکانی ئەمـەریکا دڵەلـەرزە بـە سـەرکردەکانی یـەکێتی سـۆڤییەت دەگەیـەنێت و زیـانێکی گـەورەش بـە بزوتنـەوەی ڕزگـاریخوازی گـەلان و سەربەسـتی و دەسـەلاتی دەوڵەتـە سـەربەخۆکانی جیـهان دەگەیەنێت.

وەکو لـە باسـی هێزی دەریـایی و زەمینـی و ئاسمانیدا باسمانکرد سەرچاوەی مەبەست و ئامانج دەستخسـتنی ناوچـە پـڕ پیـت و بەرەکـەت و داهاتـەکان بـوو کـە جیۆپۆلیتیکسەکان بە پێـی کات و زەمـان پێیـاندەوت ناوجەرگـەی جیـهان (Heart Land).

بەلام لەو کاتەی کە زانستی جیۆپۆلیتیکسی بە شێوەیەکی ڕوون و دیار کەوتە نـاو ناوانــەوە زانسـتی پێشـکەوتنی تـەکنۆلۆجیای پیشەسـازی و عەسـکەری لـە ئاستێکدا بوو ئێسـتاش لـە ئاسـتێکی تردایـە، کـە بـەراورد کردنیـان چۆتـە خانـەی سەرسوڕمێنییەوە! بۆیـە پێشـکەوتنی ئـەم لایەنـەو لـە ماوەیـەکی زۆر کـەمی مێـژووی مرۆڤایـەتیدا نـەك پێشـکەوتن بە هـەنگاو هەڵهێنان بـەڵکو بـە بازی گـەورە گـەورە هـۆو دەزگاکانی هاتوچۆکردن و ڕاگەیاندن ئەوەندە زەمینیان بچوك کردۆتەوە، هەندێ شت لـە چـەند چرکەیەکدا لەمپـەڕی جیهانـەوە دەگاتـە ئەوپـەڕی. مـانگی دەسـتکرد یـاری فتبوڵمان بۆ دەخاتە هەمووماڵێکی دەیان دەوڵەتی سەرزەمینەوە، دەزگای کەمپیوتەر

کاری هەزاران مرۆڤی شارەزامان لە چەند هەناسەو دەقیقەیەکدا بۆ جێبەجێدەکات. فرۆکەی مرۆڤ هەڵگرو بار هەڵگرو ڕێگای ساڵ و مانگی بۆ کردوین بە سەعات و دەقیقە.

بەمپێیە چەك و نەخشەی ستراتیجی عەسکەریش گۆڕاوەو ناوچەرگەی جیهان و دەست و پەلەکانیشی هەمان یاسا دەیانگرێتەوەو ملکەچی یاسای ئەم پێشکەوتنەن. بەڵام داخ ئەوەیە لە بریتی ئەوەی ئەو سەدان ملیار دۆلارەی بۆ چەکی فرەکوژو وێرانکار خەرجدەکرێت بۆ زانست و ئابوری و ڕۆشنبیری و تەندروستی مرۆڤایەتی بەکاربهێنرایە نە هەژاری دەماو نە کوێرەوەری لەنێو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا.

ئیتر بەم پێشەکییە کورتە دێینە سەر مەبەستی باسەکە ئەویش دوای ئەوەی چەکی ئاسمانی لە چاو چەکی بۆشایی ئاسماندا بوو بە چەکێکی بەجێماوو یاریدەدەر، ئێستا ئەم چەکە نوێیە بووە بە چەکێکی کاریگەری بەسام، ئارەزووی جیۆلیتیکسانەی دەوڵەتە گەورە چاوبرسییە تەماعکارەکانی پێ جێبەجێ بکرێت.

ئەم چەکە یان ئەم هێزە لەناو دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوادا بە جەنگە ئەستێرە ناوبانگی دەرکردووە بۆیە ئێمەش هەر بەم ناوەوە بابەتەکە باسدەکەین. بۆ باسکردنی ئەم بابەتەش دەبێت باسی جەنگی بۆشایی ئاسمان و کەرەسەو ئامرازو دەزگاکانی بکەین.

پیاوانی یاسازانی نێودەوڵەتان بیروڕای جیاوازیان دەربارەی بۆشایی ئاسمان و مافی دەوڵەتان هەیە.

پرۆفیسۆر ڤون کارمان دەربارەی ئاسمانی زەمین و بۆشایی ئاسمان (الفضاء الجوی و الفضاء الخارجی)[٢٤] دەڵێت ئاسمانی زەمین لە زەمینەوە (٨٦٨٨٨) مەترە ئیتر هەتا هەتایە بۆشایی ئاسمان دەستپێدەکات. هەرچەندە ئەم پێناسینە لە هەموو لایەکەوە پەسەند نەکراوە بەڵام بەشی زۆری یاسا زانانی نێو دەوڵەتان لایانوایە بۆشایی ئاسمان دوای تەواوبوونی بۆشایی زەمین دەستپێدەکات. جا دەربارەی دەسەڵاتی هەر دەوڵەتێك بەسەر ئەم دوو بۆشاییەدا دیسانەوە چەند بیروڕایەك هەیە.

هەندێك وای بە باش دەزانن کە هیچ دەوڵەتێك دەسەڵات نەگرێت بەسەر ئاسمانی زەمین و بۆشایی ئاسمانداو هەموو دەوڵەتان لە پێناوی قازانجی ناوکۆیی خۆیاندا تیایدا سەربەست بن چونکە ئەم بۆشاییە لە ناوی سنووری وڵات و سنووری

زەمینی ناچێت. هەرچەند هەندێك هەن ئەم سەربەستییەش دەخەنە چوارچێوەیەکی تایبەتییەوە.

هەندێ یاسازانی تر دەڵێن دەبێت ئاسمانی زەمین وەکو سنووری زەریایی و سنووری زەمینی لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتدا بێت، چونکە ئاسمانی زەمینی وەکو ئاوو زەمین موڵکی دەوڵەتی خاوەنەکەیەتی.

بەڵام بەشێکی تر دەڵێن پێویستە بخرێتە چوارچێوەیەکەوە دەوڵەت لە بەشێکیدا بێسنوور دەسەڵاتدار بێت وە لە بەشێکی تردا ئازاد بێت. بەمپێیە بەرزایی ژوور زەمین دەکەن بە سێ بەشەوە: یەکەم ناوچەی خواروو کە دەبێت بە تەواوی بەدەست دەوڵەتەوە بێت. دووەم بەش دەوڵەت نیمچە دەسەڵاتێکی تێدا هەبێت بۆ ئەوەی فڕۆکەی بێگانە دەستکەوت و ئاسایشی نەخاتە مەترسییەوە.

بەشی سێیەمیش هەموو دەوڵەتان تیایدا ئازاد بن و فڕۆکە بە سەربەستی بە ناویدا بفڕێت وەك چۆن کەشتی دەوڵەتان لە ئۆقیانووس و دەریاکانا دوور لە سنووری تایبەتی دەوڵەتان بە سەربەستی هاتووچۆ دەکەن.

ئەوی ڕاست بێت ئەگەر لە ئاسمانی زەمیندا چەندو چونێکی یاساناسی بکرێت بەڵام لە بۆشایی ئاسماندا (الفضاء الخارجي) ئەو چەندوچوونە جێگاپەنجەی نامێنێت. چونکە بۆشایی ئاسمان بووە بە موڵکی ناوکۆی نێودەوڵەتانی سەرزەمین و کێ دەستڕۆیشتوو بێت گەشتوگوزاری خۆی تێدا دەکات.

دەربارەی ئەم بابەتە، نەتەوە یەکگرتووەکان ئەم سەرەتایانەی خوارەوەی بڵاوکردەوە:

١–بۆشایی ئاسمان و ئەستێرەکان لە پێناوی دۆزینەوەو بەکارهێناندا هەموو دەوڵەتان چونیەك و بە پێی یاسای نێودەوڵەتان ئازادبن تیایدا.

٢–هیچ دەوڵەتێك بۆشایی ئاسمان و ئەستێرەکان نەکات بە موڵکی خۆی.

٣–هەر دەوڵەتێك هەر چالاکییەك لە بۆشایی ئاسماندا دەنوێنێت دەبێت بڕوای بەو سەرەتایە هەبێت بە پێی پەیمانی نەتەوە یەککگرتووەکان بجوڵێتەوەو پارێزگاری ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتان بکات و هاوکاری و هاوبیری نێودەوڵەتان ڕەچاوبکات و لە کاتی پێویستدا یاریدەی کەشتی و کەشتیوانانی ئاسمانی بدات و لە مەترسی لەناوچون ڕزگاریان بکات.

٤–دەبێت ئەم چالاکییە ئاسمانیانە دەستکەوت و قازانجی مرۆڤایەتی تیا ڕەچاو بکرێت.

٥–هیچ دەوڵەتێك نابێت بەرەڵلایانە بە هیچ چالاکییەکی بۆشایی ئاسمان هەڵسێت.

٦–بڕواکردن بە مافی دەوڵەت دەربارەی ئەو شتانەی هەڵیئەداتە بۆشایی ئاسمانەوە.

٧–بڕواکردن بەو سەرەتایەی بەندە بە یاریدەدانی کەشتیوانانی بۆشایی ئاسمان و ناردنەوەیان بۆ دەوڵەتەکانیان.

بێگومان ئەم سەرەتایانەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاوێنەی ئاوات و ئارەزووی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییەو دەبێت بۆشایی زەمینی و بۆشایی ئاسمان بە پێی ئەم سەرەتایانەو لەمانەش باشترو پێشکەوتووتر لە پێناوی خێرو خۆشی و سەرفرازی مرۆڤایەتیدا بەکاربهێنرێت، بەڵام وەکو لە خوارەوە لێیدەدوێین بزانین ڕەوتی دەوڵەتان بەرەو کوێ دەچێت.

هەروەکو لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا بەرهەمەکانی دەبنە مایەی پێشکەوتن و سەرفرازی و کامەرانی هەروەها بەرهەمی ئەوتۆش لە سەدەی بیستەمدا دۆزرایەوە کە ڕەگەزی مرۆڤ لە بریتی جارێك چەند جارێك لەناوببرێت.

ئەوی ڕاست بێت چەرخی بۆشایی ئاسمان کە مرۆڤایەتی بۆ جەنگە ئەستێرەی ئامرازی ئەتۆم و تیشکی وزەداری لێزەری کێش کردووە لە ڕۆژی ٤ ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٥٧–ەوە دەستپێدەکات، کە یەکێتی سۆڤییەت سپۆتنیکێکی بە رۆکێت هەڵدا بە ئاسمانا. ئەوکاتەش چەکی ئەتۆمی و هایدرۆجینی هێشتا لای هەردوو دەوڵەتە گەورەکەی جیهان لەچاو ئێستادا ساواو بەخۆدا نەهاتوو بوو، هەر لەوکاتەوە تا ئێستاش شارەزایانی ئەم بابەتە لایان وایە کە یەکێتی سۆڤییەت لە مەیدانی زانستی ڕۆکێت (صاروخ)دا لە دەوڵەتانی تر دەسەلا تدارترە. ئیتر دوای ئەم دەستپێشکەرییەی یەکێتی سۆڤییەت کە کۆمەلانی خەڵکی جیهان وەك بەرهەمێکی گەورەی زانست و تەکنۆلۆجیای تازە بە خۆشی و سەرسامییەوە پێشوازییان کرد، ئەمەریکاش کەوتە خۆی تاکو لە خێڵ بە جێنەمێنێت. لە لایەکەوە نەوەکا بەرەی ڕۆژئاوا ورە بەربدەن و لە لایەکی تریشەوە تایتەرازووی نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای پێ لەنگنەبێت.

ئیتر ئەم بینبیرکێ و بۆربۆڕینەی نێوان یەکێتی سۆڤییەت و ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا کاریگەیا:ە ئاستێك کە دەبێت شێوەی بەکارهێنانی مانگی دەستکردوو چوونە بۆشایی ئاسمانەوە ڕوون و ئاشکرا بێت. بۆیە ئەم دوو دەوڵەتە ڕێککەوتننامەیەکیان دەربارەی ئەم بابەتە مۆر کرد، بە پێی ئەم ڕێککەوتننامەیە هەر مانگێکی دەستکرد هەڵدەدەن بە ئاسمانا دەبێت دەربارەی هەڵدان و خاسییەتەکانی ئاگاداری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بکەن.

لەگەڵ ئەمەشدا شارلی شلدون سەرۆکی بەشی زانستی کتێبخانەی کۆنگریسی ئەمەریکایی کۆنترین پسپۆڕی تەکنۆلۆجیای بۆشایی ئاسمان لە ڕاپۆرتێکدا دەڵێت[٣٥] "٥٠٪ مانگی دەستکردی ئەمەریکاو سۆڤییەت بۆ کاروباری عەسکەری بە ئاسماندا هەڵدراوە، ٦٠٪ گەشتەکانی ئەمەریکاییەکان لەم کۆڕەدا وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا کردویەتی و سۆڤییەتەکانیش لەم مەیدانەدا هەروابوون".

هەروەها لە هەمان ڕاپۆرتدا دەڵێت "ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە سەرەتای چەکی ئاسمانییەوە واتە ساڵی ١٩٥٧ تا کۆتایی ساڵی ١٩٧٠، (٥١٤) مانگی دەستکردی بە دەوری زەمیندا هەڵداوە کە (٢٧٣)یان کاروباری عەسکەرییان پێسپێرراوە جگە لە (٤١) مانگی دەستکردی تر کە وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا مەسردفی کێشاوە.

بەڵام یەکێتی سۆڤییەت لە هەمان ماوەدا (٤٦٥) مانگی دەستکردی هەڵداوە، (٢٩٤)یان کاروباری عەسکەرییان پێسپێرراوە".

شارلی شلدون بڕوای وایە کە ولاتە یەکگرتوەکای ئەمەریکا تا ٣٠ حوزەیرانی ساڵی ١٩٧١، (٦٠) ملیار دۆلاری لە بەرنامەی عەسکەری و ئاساییدا خەرجکردووەو یەکێتی سۆڤییەتیش هەروا بووە.

پەیمانگای ئاشتی نێودەوڵەتان لە ستۆکهۆڵم دەڵێت ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تا کۆتایی ساڵی ١٩٦٧، نزیکەی (٣٠) ملیار دۆلاری لە چالاکی عەسکەری بۆشایی ئاسماندا خەرجکردووە.

کە واتا پێویستە بزانین مانگی دەستکرد لە کۆڕی کاروباری عەسکەریدا بۆچی بەکاردێت کە بە کورتی ئەمانەی خوارەوەن:

١- دەستنیشانکردنی هەر شتێکی مەبەست لەسەر زەمین.

٢-ئاگاداربوون لە هەڵدانی هەر ڕۆکێتێکی بالستیکی دوور ڕەوو قارەبڕ، ئەو ڕۆکێتانەی لە ژێر ئاویە کانەوە (غواصە) هەڵدەدرێن.

٣-ئاگاداربوون لە تەقینەوەی ئەتۆمی لە بۆشایی زەمین و دەرەوەی زەمیندا.

٤-تەقینەوەی تەقەمەنی ئەتۆمی لە ناوچەیی مەبەست (هدف)دا تۆمارکردن و تۆمارکردنی وزەو کردەوەی.

٥-ئاگاداربوون لەو زەرەرو زیانانەی لە شارو مەڵبەندە پیشەسازییەکان و بنکەو بەندەرو هێڵی هاتوچۆکردنی دوژمن دەکەوێت پاش هێرشبردنە سەری.

٦-یاریدەدانی ئاراستەکردنی ڕۆکێتی دووڕەو چ لە بنکەی زەمینی یان دەریاییەوە یان ئاسمانییەوە هەڵبدرێت ئەگەر هەڵەیان کرد هەڵەکانیان ڕاستدەکاتەوە.

٧-دۆزینەوەی لەشکری کۆکراوەی عەسکەری (تحشدات عسكرية) لە هەموو لایەکەوە.

٨-ئاگادارکردنی ئەلکترۆنانەی هێزە زەریاییەکان و هێزی ئاسمانی و بنکەی ڕۆکێتە ستراتیجییەکان دەربارەی هەر کارێکی پێویست.

بۆیە ڕۆژنامەی ئەستێرەی سووری سوپای سۆڤییەت لە نووسینێکدا دەربارەی مانگی دەستکرد دەڵێت "جاسووس لەهەر بەرزاییەکەوە جاسووسی بکات هەر جاسووسە".

ئەوی ڕاست بێت تەنانەت مانگە دەستکردە عەسکەرییەکانیش بەکارهێنانیان لە هەندێ لاوە بۆ ئاشتی نێودەوڵەتان بەخێرگەڕا.

پاش ئەوەی یەکێتی سۆڤییەت بە پشکنینی وڵاتەکەی نە لە زەمینەوەو نە لە ئاسمانەوە ڕازی نەئەبوو وە لای وابوو ئەمە ڕێگای شارەزابوون لە نهێنییە عەسکەرییەکانیان بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەخاتە سەرپشت ئەم ڕازینەبوونە دەربارەی سنووردانان بۆ چەکی ستراتیجی بووبوو بە کۆسپێکی گەورەی هەر ڕێکەوتننامەیەك لە نێوان یەکێتی سۆڤییەت و وڵاتە یەکگرتووەکاندا.

کەچی لە دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٢دا یەکێتی سۆڤییەت مانگێکی دەستکردی هەڵدا بە دەوری زەمینداو دوای (٨) ڕۆژ هانییەوە خوارێ، ئیتر نیکیتاخرۆشۆف لە ساڵی ١٩٦٣دا وتی[٣٦] "ئیتر پکشنینی ڕاستەوخۆ بایەخێکی

ئەوتۆی نییە چونکە ئەستێرەی دەستکرد دەتوانێ ئەو فرمانە جێبەجێبکات". بەمە دوای ئەوەی مانگی دەستکرد کێشەو بەرەی پشکنینی سازکرد، رێککەوتننامەی سالت ١ تەمووزی ساڵی ١٩٧٢ لە نێوان یەکێتی سۆڤییەت و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا مۆرکرا.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم سوچە بچکۆلە رۆشنە ئەو کەلێنە گەورە پڕ مەترسییانە پڕناکاتەوە کە دەزگا مۆنۆپۆلییەکان و عەسکەرییە چاوسوورەکانی ولاتە یەکگرتووەکان بە تایبەتی هی ئەمەریکا دەیکەنە دیواری ئاشتی جیهان و ئارامی ژیانی گەلانەوە.

لە ساڵی ١٩٦١دا دوکتور والتەر دور نبرجەر لە کتێبی *Space as Military arena* دا پێشنیاز دەکات،کە ئەمەریکا چەند سەد بۆمبایەکی ئەتۆمی بە دەوری زەویدا هەڵبدات کە خاکی یەکێتی سۆڤییەت و ولاتە سۆشیالیستەکانی تر بگرێتەوەو ئامادە بێت بۆ کاتی مەبەست. وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا ئەم پێشنیازەی بە راستزانی.

هارولد براون لە وتەیەکیدا دەڵێت "هێزی یەکێتی سۆڤییەت لە کۆڕی بۆشایی ئاسماندا وای لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کردووە کە هەر دەبێت لە گەڵیا بکەوینە بینبڕکێوە".

لە ١٩ی ئابی ١٩٨٠دا ولیام دیکستون نوێنەری پارتی جمهوری وتی[٢٧] "یەکێتی سۆڤییەت چەکی هەیە بە تیشکی لیزەر ئیشدەکات. کە ئەمەش چەکێکە دەتوانێت ئیش لەو مانگە دەستکردانە تێکبدات کە بۆ جاسوسییەت بەکاردێن". کە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەرنامەی دروستکردنی رۆکێتی *M.X* ی دانا بیانووەکەی خستە سەر ئەم خالانەی خوارەوە:

١-هێزی ستراتیجی ئەتۆمی سۆڤییەتی هەرەشە لە رۆکێتە دوورڕەوەکانی ئەمەریکا دەکات.

٢-دەبێت هێزی بەرگری ئەتۆمی ئەمەریکا لەو ئاستەدا بێت کە فرمانی خۆی پێ جێبەجێبکرێت.

٣-ئاستی تەکنۆلۆجی و کارکردەی هێزی ئەتۆمی ئەمەریکا کە لە پەنجاکان و شەستەکانەوە دەستیکردووە بە گەشەکردن دەبێت هەر روو لە پێشکەوتن بێت.

ئەوی ڕاست بێت یەكێتی سۆڤییەت هەموو جارێك بەم شێوە ڕاگەیاندنەی ئەمەریكا دەڵێت بیانوی خۆ چەكداركردن و سۆڤییەت بەجێهێشتنە لە كۆڕی چەكی ستراتیجی و بۆشایی ئاسماندا.

لای وایە كە كاربەدەستانی ئەمەریكا بەم جۆرە پڕوپاگەندانە بودجەی پرۆژە ستراتیجییەكان بە كۆنگرێسی ئەمەریكا ئەسەلمێنن و خەڵكی باجدەری ئەمەریكا بێدەنگ دەكەن و گەلانی جیهانی پێدەخەڵەتێنن. لە پاڵ ئەم ڕوونكردنەوەیەشدا ئەندرۆپۆف سكرتێری گشتی پارتی كۆمۆنیستی سۆڤییەتی كە تازە بۆ ئەم جێگایە هەڵبژێرابوو وتی "با ئەمەریكا زۆر چاك ئەو ڕاستییە بزانێت كە هەرگیز نایەڵین لەم گۆڕەپانەدا ئێمە بەجێبهێڵێت".

بێگومان هەموو دەوڵەتێكی شەڕخواز پێش هەڵگیرساندنی جەنگ خۆی خستۆتە بەرگی دەوڵەتێكی بەشخوراوی زۆر لێكراوی لە دەوڵەتان بەجێماوەوەو هەولو تەقەللای شەڕخوازانەی بەخۆ لە بەجێماوی ڕزگاركردن لە قەڵەم داوەو ئەڵەمانیای نازی نمونەی ئەم سیاسەتەو دیبلوماسییەتەی ئەم سەدەیەمانە.

بەڵام دەوڵەتێك بە تەنگ ئاسایش و ئاشتی جیهان و ڕەنجی كرێكاران و چینە مامناوەندییەكانی وڵاتەكەی خۆیەوە بێت و بیر لەوە بكاتەوە كە باجی میللەت كۆكراوە بە فیڕۆ نەدات وەكو ئەمەریكا (٢٤٠) ڕۆكێتی $m.x$ و بنكەكانی هەڵدانی بە (٦٠) ملیار دۆلار دروست ناكات یان ڕێگایەكی ئاشتیخوازانە دەگرێتە بەرو سەدان ملیار دۆلاری بە فیڕۆچوو لە بریتی چەكی لەناوبەر لە پێناوی بەختیاری و پێشكەوتنی كۆمەڵگای ئەمەریكاو جیهان دەخاتە كارەوە.

سەیر ئەوەیە گەلێ چەكی پێشكەوتوی تەكنۆلۆجیا بەرز هەیە كە سەدان ملیار دۆلاریان لەم چەند ساڵەی دواییدا تیا خەرجكراوە، هەموو خراونەتە گەنجینەی چەكی بێكەڵكەوە چونكە لەو چەكانە باشترو بەهێزترو نیشانە پێكتر دروست كراوە، یان بە پارەو پولێكی بێشومار دەیانفرۆشنەوە بە دەوڵەتانی جیهانی سێیەم و بە فروفێڵ و پیلان دەشیانكەن بەگژ یەكتریدا تا چەكەكانیان پێ لەناوبەرن و سەرمایەی كۆكراوەیان پێ لەبنبهێنن و هەمیشە لەژێر باری قەرزی ئەم دەوڵەتانەدا بە تایبەتی هی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا ڕزگاریان نەبێت و ڕۆژتەكانیان بازاڕێكی دەرگا لەسەر پشت بێت لە ئاستی ئەم دەوڵەتە ئیمپریالییانەدا، كە تازە ڕۆكێتی تیژڕەوی

دوورڕەو هـاتبووە کـۆڕی بەکارهێنانـەوە، خرۆشـۆف وتـی پێویسـتە چەکـە کلاسیکییەکان وەکو تۆپ و تانك و فڕۆکە بخەینە مۆزەخانەوە، بەڵام ئێستا دەیان جۆر لەو چەکانەی ئەوسا خرۆشۆف باسیدەکردن دەبێت هەر بخرێنە مۆزەخانەوە!

وەك لـە دەزگاکـانی ڕاگـەیاندنی دەوڵەتـە گەورەکانـەوە بڵاودەکرێتـەوە ئـەم بۆڕبۆڕێنە هەر بەردەوامە هەر لایەك چەکێکی نوێ دەدۆزێتەوە خێرا لاکەی تریان بیر لە چەکێك دەکاتەوە ئەم چەکەی پێ پوچەڵ بکاتەوە یان چەکێکی لـەو چەکە بەهێزو وزەتـر بهێنێتە کایـەوە. بێگومان بۆ ئـەوەی باشتر لەم بابەتە بگەین پێویستە کورتە باسێك دەربارەی ئەم بۆڕبۆڕێنە بخەینە پێشچاو.

لە سـاڵی ١٩٦٧دا سۆڤییەتییەکان لـە تاقیکردنـەوەکانی سیستـەمی خولگـەی وردە بەشـی بوردومانکـەردا (*Fobs*) سـەرکەوتن. ئـەم سـەرکەوتنەش ئـەو مانایـە دەگەیـەنێت کە دەتوانن مـانگێکی دەسـتکرد بـە ئـەتۆم چـەکدارکراوی وێرانکـەر بـە دەوری زەمینـدا بسوڕێننەوەو لە کاتی پێویستدا لە ئێسـتگاکانی سـەرزەمینەوە بـە هۆی دەزگای ئاگادارکردنی تەرخانکراوی تایبەتییەوە ئاگاداری بکەن، ئیتر ئەم مانگە دەستکردە یەکسەر ڕووی خۆی وەردەگێڕێت و مەبەستی بۆ نیشانەکراو دەپێکێت و لە ناویدەبات.

لـەم بارەیـەوە ماکنمـارا وتـی دەزگاکـانی ڕادار تـەنیا پێـش سـێ دەقیقـە بـە تەقینەوەی ئەم مانگە دەستکردە دەزانن. لەبەر ئەوەشە دەتوانێت هـەموو بنکـەکانی بۆمبا ئەتۆمی هاوێژەکانمان وێرانبکات.

لە سەرەتای دروستکردنی ئەم چەکەوە خرۆشۆف لە ساڵی ١٩٦٤دا لـە دیدەنی چەند نوێنەرێکی پەرلەمانی ژاپۆنی لە مۆسکۆدا باسی ئەم چەکەی لـە دەم دەرچـو و وتی بەم زووانە چەکێکی ئێجگار تۆقێنەرمان دەکەوێتە دەست (قنبلة الرعب).

هەروەها لیۆنید بریجینیف لـە جـەژنی پـەنجا ساڵەی شۆڕشی ئۆکتۆبەردا وتـی "ئێستا سوپای سۆڤییەت چەکێکی بە دەستەوەیە نەرادار دەتوانێت وەك پێویست پێی بزانێت و نە دووری ڕێگاش نرخێکی هەیـە، لـە ڕۆژهـەلات و ڕۆژئـاواو بـاکورو باشوورەوە دەتوانێت دەستی خۆی بوەشێنێت.

پسپۆڕە ستراتیجییەکان بڕوایان وایـە کـە جـەنگی داهاتوو بە بەکارهێنانی ئـەم جـۆرە چەکـەو بـە یارمـەتی چـەکی سـتراتیجی قـاڕە بـڕ دەسـتپێدەکات،

دەستپێکردنەکەش ئەوەندە کتوپڕو لەناوبەر دەبێت، دوژمن مۆڵەتی پەلاماردانەوەو تۆڵە سەندنەوەی بە دەستەوە نامێنێت. بۆیە شارەزایانی جیۆپۆلیتیکسی بۆشایی ئاسمان ئێستا دەڵێن "ئەوەی بۆشایی ئاسمانی بە تەواوی خستە ژێر دەستی خۆیەوە ئیتر جیهانی دەکەوێتە ژێردەست".

شارەزایانی ئەمەریکایی کە بە تەمای ئەوەن بە تەقاندنەوەی (٢٠٠٠) میگا تەنی وزەی ئەتۆمی نیوەی دانیشتوانی وڵاتی دوژمن و دووسێ یەکە پیشەسازییە گرنگەکان لەناوبەرن هەرچەندە بەشی زۆریان بە ١٠ تا ٢٠٠ میگاتەنی سەرەتای هاویشتنیانەوە لەناودەچن. وا پێشبینی دەکەن کە نیوەی دانیشتوانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو یەکێتی سۆڤییەت لەناودەبن. هەروەها دەڵێن هێزی خۆپاراستن بەوە دەبێت هەموو مەبەستە عەسکەرییەکان (الاهداف العسكريه) لە ناوبچێت و نرخی خۆپاراستنیش ئەوەیە دانیشتوان و توانای پیشەسازی لەناوببرێت.

ئەمەریکا زۆر دەمێکە ستراتیجییەتێکی سێکوچکەی دامەزراندووە کە ئەمانەی خوارەوەن:

١-ڕۆکێتی بلاستیکی، کە بنکەی سەرزەمین بیانهاوێژێت.

٢-فڕۆکەی دووربەو.

٣-ژێردەریایی (غواصه) ڕۆکێت هەڵگر.

لە ساڵی ١٩٨٠-١٩٨١دا وڵاتە یەکگرتووەکان سێ جۆر ڕۆکێتی قاڕەبڕی هەبوو ئەمانەش: تیتان ٢ و منتمان ٢ و منتمان ٣ بوو. لە ساڵی ١٩٦٣وە ڕۆکێتی منتمان ٢ی هەیە قورسایی لەکاتی هەڵداندا (١٥٠) تەنەو وزەی تەقینەوەی (٩) میگا تەنە. بەڵام منتمان ٣، چەپکێکی لە یەك جیاوازی پێوەیە، هەریەکەی بەر مەبەستێکی نیشانەکراو دەکەوێت و هەریەکەشیان وزەی تەقینەوەیان ٣٤٠ کیلۆ تەنەو بەم جۆرە ڕۆکێتە دەوترێت (*Mirv*) ڕۆکێتی کروزی ستراتیجی کە لە ئاسمانەوە هەڵدەدرێت دەگاتە (٢٥٠٠) کیلۆ مەتر بەڵام ئەو جۆرە لە دەریاو سەرزەمینەوە هەڵدەدرێت و کۆمپانیای جەنەڕال دایناميكس دروستی دەکات ٣٠٠٠ کیلۆمەتر دەڕوات.

هەروەها بەرنامەی گەشەکردنی ڕۆکێت بەردەوامە، بەرنامەی ئەمەریکا ئەو ڕێگایەی گرتۆتە بەر کە لە فڕۆکەی جەنگی *F.15*وە ڕۆکێت دژی مانگی دەستکردو

ڕۆکێتی دوژمن هەڵبدرێت و ئەم ڕۆکێتانەش پارچە تەقیوەکانیان مەبەستەکانی (الاهداف) دوژمن پەک دەخات یان هەر پارچە پارچەی دەکات.

هەروەها ڕۆناڵدریگن فرمانی بەرهەمهێنانی ڕۆکێتێکی تایبەتی بە دەزگا لێپرسراوەکان کرد کە پێیدەڵێن ترایندیت (d.s) 2 و لە ساڵی ١٩٩٠دا دەکەوێتە دەست سوپای ئەمەریکاوە. ئەم ڕۆکێتە لەژێر دەریایی (غواصە) ئوهایودا بەکاردێت، چواردە سەری ئەتۆمی هەیە، هەریەکەی (١٥٠) کیلۆ تەنەو (١٢٠٧) کلیۆمەتر دەڕوات و هەر لە نزیک کەنارەکانی ولاتە یەکگرتووەکانەوە دەتوانرێت بهاوێژرێت.

بەڵام دەربارەی ژێر دەریای، هێزی دەریایی ئەمەریکا ٧٣ ژێر دەریایی هێرش بەری بە دەستەوەیە کە هەر بۆ تێکشکانی ژێردەریایی دوژمن دروستکراوە. دەزگا ئاگادارەکانی ڕۆژئاوا دەڵێن ژێردەریایی ئەمەریکا لەچاو هینی سۆڤییەتدا لە دوو لاوە بایەخدارترە. یەکەم ماشێنە بزوێنەرەکانیان بێدەنگترن، دووەم دەزگا هەستکارەکانیان دوور ڕەوترن.

بۆیە ئەمەریکا زۆر بایەخێکی گەورەی بە پێشخستنی ئەم لایەنەداوەو لەسەر وشکایی نزیک هەر دوو ئۆقیانووسی ئەتلەسی و باسفیك، بە تایبەتی لە نزیك دوورگەی (کەمشەتکا)ی سۆڤییەتی و دەریای بارنتسی نەوریجەوە دەزگای هەستیار (حاسات)ی دامەزراندووە.

بەم جۆرە سەرکردایەتی عەسکەری ئەمەریکا لەم دوو ڕێڕەوە بایەخداره دەریاییەوە، کە تەنیا دوو ڕێڕەوی سۆڤییەتییەکانە بەرەو ژووروری باسفیك و ئەتلەسی، هاتوچۆکردنی هێزە دەرياییەکانی سۆڤییەتی خستۆتە ژێرچاوەدێری خۆیەوە.

ولاتە یەکگرتووەکان دوای ئەم سێکوچکەیە کە بایەخێکی زۆری بە مەکۆی بۆشایی ئاسمان داوە نەك هەر لەبەرئەوەی جێگایەکی گرنگی لەنێو چەکە ستراتیجییەکاندا بۆ دەگرێتەوە بەڵکو لەبەرئەوەی چەند جارێك بەکاردەهێنرێت و لە چاو چەکی تری هاوتای خۆیدا زۆر کەم مەسرەف ترە.

ئەم چەکە دەتوانێت جگە لە فرمانی شارستانێتی و زانستی لە کۆڕی جەنگی داهاتووداو هەر لە ئێستاشەوە ئەم فرمانانەی خوارەوە جێبەجێ بکات:

١-مانگی دەستکردی نوێ چ بۆ مەبەستی عەسکەری یان زانستی بە دەوری زەمیندا بڵاوبکاتەوە، ئەو مانگە دەستکردانەی پێویستیان بە چاککردنەوە هەیە چاکیان بکاتەوە یان بیانگۆڕێت بە هینی تر، هەروەها دەتوانێت لە تۆیی خۆشیا مانگی دەستکردی یەدەگ هەڵبگرێت.

٢-دەتوانرێت وەکو بنکەیەکی سەرکردایەتی چ بۆ ئاراستەکردنی کاروباری زەمین یان بۆ هی بۆشایی ئاسمان بەکاربهێنرێت، واتە وەکو تەختە ڕەوانێکی سەرکردایەتی لە ئاسمان لەنگەر ڕاگرتوو بەکاربهێنرێت.

٣-بۆ بەگژاچوونی مانگە دەستکردەکانی دوژمن بەکاربهێنرێت و ئەو مانگە دەستکردانە بە دیل بگرێت بێنەوەی پێویستی بە تەقینەوەو پەکخستنیان هەبێت.

٤-دەتوانرێت بکرێت بە تەختە ڕەوانێکی ئاسمانی بۆ بەکارهێنانی تیشکی لێزەرو بۆمبای ئەتۆمی. لەم بارەیە تاقیکردنەوەیەك لەوانەی بە دەستیانەوەیە خستنەخوارەوەی ڕۆکێت یان مانگێکی دەستکردە بە تیشکی لێزەر.

دەربارەی جەنگی بۆشایی ئاسمان چالاکی یەکێتی سۆڤییەت و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەردووکیان ڕوویکردۆتە ئەو مەبەستەی کە بتوانن مانگی دەستکردو ڕۆکێتی دوور بڕ بە ئاسمانەوە بخەنە خوارەوە هەردوولاشیان پشت بەم چەکانە ئەبستن:

١-تیشکی لێزەرو تیشکی تەنۆکەیی (جسیم) *Particle Beam Accelerator*: تیشکی لێزەر کە بریتییە لە تیشکێکی ڕووناکی زۆر چڕ کە زۆر بە باشی ئاراستە دەکرێت بەڵام تیشکی تەنۆکەی (جسیم) گەردیلەی نیوترۆن یان هایدرۆجین بە خێراییەکی سەرسوڕهێنەر فڕێدەدات. کە تیشکی ئەم دوو چەکە ئێجگار وزەدارو سوتێنەرو لە ناوبەرە.

٢-مانگی دەستکردی ڕاوکەری بکوژ (القمر القاتل): سەرچاوەکانی ئەمەریکا بڵاوی دەکەنەوە کە یەکێتی سۆڤییەت لە ساڵی ١٩٦٨دا لە هەژدە تاقیکردنەوە یانزە تاقیکردنەوەی لەسەر ئەم جۆر چەکە سەرکەوتوو بووە.

دەڵێن سۆڤییەتییەکان دەتوانن مانگی دەستکردی ڕاوکەری لەناوبەر بخەنە خولگە (مدار)ی مانگی دەستکردی نێچیرەوەو پێی بخەنە خوارەوە، یان لە کاری بخەن.

هـــەر دەربــارەی جەنگــە ئەســتێرە، ڕونــاڵدریگن کـــە بـــووە بـــە پاڵـــەوانی ئـــاگر خۆشـــکەری جەنگـــە ئەســـتێرە ســـێ مـــانگ لەمـــەوپێش ئاگـــاداری کۆنگرێســی ئەمــەریکا و هاوپەیمانــەکانی و تەنانــەت یــەکێتی سۆڤییەتیشـی کـرد کــە لـــە کـــۆڕی جەنگـــە ئەســـتێرەدا تاقیکردنەوەیـــەك دەکــات بریتـــی دەبێـــت لەوەی فڕۆکەیەکی جـەنگی F15ـی هــەڵگری ڕۆکێتێکـی دوو نـهۆم ٢٠ هــەزار مـەتر بــەرز دەبێتـــەوە، ئەوســـا ڕۆکێتەکـــە دەهـــاوێژێت، ئـــەویش نـــهۆمی یەکـــەمی (٥٠) هــەزار مــەتر بەرزدەبێتــەوە، ئنجـا لــەو بەرزاییــەوە ســەرە تێکــدەرە خــاوەن ئــامرازی پاڵپێوەنەرەکــەی دەچێتــە خولگــەی مــانگی دەســتکردی دوژمنـــەوە، لـــە نێـــوان (٢٠٠ تـــا ١٥٠٠ کیلۆمـــەتر) کـــە هـــەر بـــە گەیشـــتنی بـــە مانگـــە دەستکردەکە تێکوپێکی دەدات.

ئەمەریکاییەکان دەڵێن ئەم پەلەقاژییەمان بۆ ئەوەیە خۆمان لە کۆڕی تێکدانی مانگی دەستکردا بگەیەنینە ئاستی یەکێتی سۆڤییەت.

هـەروەها وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمــەریکا لــە ســەرەتای مــانگی ١٩٨٥/١٠دا مەکۆیەکی عەسکەرییان کە نـاوی ئـەتلانتس بـوو هەڵدایـە بۆشـایی ئاسمانـەوە کـە هەرچەندە هیچ دەنگوباسێکی ئـەوتۆیان لەسـەر بڵاونـەکردەوە، بەڵام ئاگاداراني ئـەم جۆرە بابەتـە دەڵێن نیاز لەوەیە چەکی خاوەن تیشکی لێزەر لە بۆشـایی ئاسمـاندا بڵاوبکەنەوە کە ڕۆکێتی ئەتۆمی زەمین بۆ زەمین و ئاسمان بۆ زەمینـی پـێ لـەناوبردن. دەزگــا زانســـتییەکانی (ناســا)ی ئەمـــەریکایی دەڵێــن مــەکۆی ئــەتلانتس ئـــامرازی جاسوسیکردن و وێنەگرتنی ئێجگار وردو گرنگی لەگەڵ خۆیدا هــەڵگرتووە کـە بـە ئاســـانی دەتوانێـــت مەبەســـتەکانی (اهـــداف) خـــۆی ببینێـــت و هەریەکـــەیان بـــەجوانی لەیـــەکتری جیابکاتـــەوە، هـــەروەها دەتوانێـــت ژێرئاوییـــە ئەتۆمییـــە سـۆڤییەتییەکان (الغواصــات النوویــة الســوفیاتیة) کــە ئەمەریکاییــەکان زۆر لێیــان دەترسن دەستنیشان بکات.

ئاژانســی ڕۆیتــەر دەربــارەی ئــەتلانتس دەڵێـت فرمـانی ئـەم مەکۆیـە لـە توێـی نهێنیدا نەماوە بـەڵکو بریتییـە لـە هـەنگاوێکی پێشـکەوتووانە دەربـارەی بەرنامـەی جەنگە ئەستێرەو لێکۆڵینەوەکانی، هـەروەها دەربارەی جەنگە ئەستێرە پـەیامنێری ئاژانسی ڕۆیتەر لە واشنتون تشارلز دینگەر دەڵێت[٣٨] "ئەگەر بە هۆی هەر شتێکەوە

بێت مرۆڤ هۆشی خۆی لە دەستچوو ئەوا ئاگرێك لە ئاسمانەوە بەر دەبێتە سەرزەمین کەسەدان جار بیکات بە زوخاڵ!".

بەرامبەر بەم هەڵوێستەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە بیرەوەری شۆڕشی ئۆکتۆبەردا وەزیری بەرگری یەکێتی سۆڤییاتی وتی "دەبێت ئەمەریکاو پەیمانی ئەتڵەسی ئەو ڕاستییە چاك بزانن کە هەرگیز نایەڵین لە کۆڕی چەکی نوێدا لە ئێمە پێشکەوتوتر بن".

ئیتر لە کۆتایی باسەکەدا دەڵێین کە لە سەرەتاوە جیۆپۆلیتیکسییەکان دەیانوت کێ ناوچەرگەی بەهێزی زەمینی و داهاتەکانی دەستکەوێت، دەست بەسەر جیهاندا دەگرێت و دوای ئەوان جیۆپۆلیتیکسییە زەریاخوازەکان وتیان کێ لە زەریادا باڵادەست بوو ئەوە جیهانی دەکەوێتە بەردەست و دوای ئەمان ئەو جیۆپۆلیتیکسییانەی هێزی ئاسمانییان لا گرنگترو بایەخدارتر بوو دەیانوت کێ خاوەنی هێزێکی ئاسمانی کاریگەر بێت دەست بەسەر جیهاندا دەگرێت ئێستا لای جیوپولیتیکسەکانی ئەمەریکا وایە کێ لە بۆشایی ئاسمان چەکی گرنگترو بە سامتری هەبێت و لە دەوڵەتانی تر دەسڕۆیشتووتر بێت، جیهان وەکو هێلکەیەکی پاککراو دەکەوێتە بەردەستی.

لە کۆتاییدا پێویستە ئەو ڕاستییە ڕوونکەینەوە، کە بۆچی ئەم بەشەشم وەکو بەشەکانی تر لاگرنگ بوو لە کاتێکدا نەتەوەی کوردو عێراق هەموو نە بە تەمای ئەوەن ڕۆژێك لە ڕۆژان ببن بە خاوەنی هێزێکی چەکداری ئەوتۆ کە جیهانی پێ ژێردەستە بکەن و نە پێشبینیش دەکرێت بەم هەلومەرجەی ئێستا بە دەستەودیە بتوانن بگەنە ئەو پایەیە، کە واتا ئەی بۆچی ئەم خۆخەریککردنە بە بابەتێکەوە کە بەشی ئێمەی تێدا نییە؟!

**یەکەم:**

لەبەرئەوەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی کە کۆمەڵگای کوردستان بەشێکێتی دەبێت بچێت بە گژ جەنگ و جەنگخوازاندا چونکە تەنیا لە جەنگی دووەمی جیهانیدا (٨٠) ملیۆن کەسی تیاکوژرا کە ٢٠ ملیۆنی سۆڤییەتی و (٥) ملیۆنی پۆڵەندی و (٥) ملیۆنی ئەڵمانی و ئەوانی تری گەلانی تر بوون کە ئەو جەنگە لەچاو جەنگە ئەستێرەدا وەکو شەڕە قۆچەقانێ وایە!!

دووەم:

هەموو دەزانین کە ئەم دوو جەمسەرە ناکۆکی کارەی جیهان یەکێکیان (یەکێتی سۆڤییەت) کەوتۆتە ژووروی هەموو کوردستان و نەتەوەی کوردو عێراقەوەو ئەوی تریان (ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا) بنکەو هێزە کاریگەرو دەستکەوتەکانی کەوتۆتە خوارووی ناوچەکەمانەوە. رۆنالدریگن بە ئاشکرا دەڵێت هەروەها سەرۆکەکانی ئەمەریکای ئەم چەند دە ساڵەی پێشوی ئەمەریکا کە ئاسایشی دوورگەی عەرەبی بەشێکی جیانەکراوەیە لە ئاسایشی ئەمەریکا.

هەروەها هەرگیز نابێت لەو خەیاڵەدا بین کە یەکێتی سۆڤییەتیش، پارێزەری خۆی و ولاتە سۆشیالیستەکانی ترو هاو پەیمانەکانی کە قازنج و دەستکەوتێکی زۆرو تایبەتی لەم ناوچەیەدا هەیە هەروا بە گاڵتەوە سنووری خوارووی ولاتی خۆی بۆ پیلانەکانی ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانی بەرەڵلا بکات.

واتە ئەم ناوچەیە کە کوردستان سەرەرێگای هاتووچۆو سنووری خوارووی یەکێتی سۆڤییەت و ناوچەی جیاکەرەوەو پیاهەڵپژانی ئەم دوو هێزە گەورە بە سامەیە، هەر جەنگێکی چاوەروانکراو بقەومێت دەبێت بە مەڵبەندی کوشتن و وێرانکردن وەکو لە جەنگی یەکەمی جیهاندا لە خانەقین و رەواندوزو بەشێکی زۆری کوردستانی تورکیاو ئێران رووی دا. بەلام ئەمجارە چ وێرانکردنێک، بێگومان وێرنکردنێك دەبێت کە وشك و تەر پێکەوە بسوتێن. لەبەرئەوە پێویستە نەتەوەی کورد پێش هەموو شتێك شارەزای ئەم بابەتە زانستەبن، ئنجا شان بە شانی ئازادی و ئاشتیخوازانی جیهان خەبات بکەن کە جیهان و ئەم ناوچەیە لە جەنێگکی لەناوبەری کاولکەر رزگار بکەن.

---

سەبارەت بەوەی پرۆفیسۆر جەنەڕاڵ کارل هوسهوفەر خاوەنی قوتابخانەیەکی جیۆپۆلیتیکسی تایبەتی و ناوی لە هەموو بابەتە جیۆپۆلیتیکسییەکاندا لەناو ناواندایە بە پێویستم زانی مێژووی ژیانی بخەمە پێشچاوی خوێنەرانی بەڕێزەوە:

## (مێژووی ژیانی کارڵ هوسهۆفەر)[39]

ئەفسەرێکی عەسکەری و زانایەکی جیۆپۆلیتیکسییە لە ساڵی ١٨٨٧ خوێندنی لە قوتابخانەی ماکسیملیانی شاهانە تەواوکرد. هەر لە ساڵی ١٨٨٧دا چۆتە بەشی تۆپخانەی شاهانەی باڤارییەوە، هەر لە سوپای باڤاریای ئەڵەمانیدا ژیانی عەسکەری بردۆتەسەر. لە ساڵی ١٨٨٩دا خوێندنی لە ئەکادیمییەی عەسکەری تەواوکردووەو بووە بە ئەفسەرێکی یەك ئەستێرەو لە دەرچوونەکەشیا بە پلەی (شرف) خەلاّتکراوە. لە نێوان ساڵی ١٨٩٠-١٨٩٢دا نێرراوە بۆ قوتابخانەی تۆپخانەو ئەندازیاری، دوای گەڕانەوەی بۆ جێگای پێشوی خۆی بۆیان نووسیوە کە کاروباری بەشی تایبەتی پێبسپێرن.

لە ١٨٩٥دا دوای تاقیکردنەوەیەکی تایبەتی لە کۆلیجی ئەرکانی جەنگ وەرگیراوەو لە ساڵی ١٨٩٨دا خوێندنی تەواو کردووە، بووە بە ئەفسەری دوو ئەستێرە. لە ساڵی ١٨٩٩-١٩٠١دا بە پێی ئامۆژگاری لیژنەی ئەرکانی جەنگ بە کاروباری عەسکەری دوو ساڵ گەشتیان پێکردووە. دوای ئەوە بە سێ ئەستێرەیی بووە بە فەرماندەی هێزێکی بچوکی تۆپخانە. لە ١٩٠٤دا بووە بە مامۆستای مێژوو لە کۆلێژی عەسکەری لە زستانی ١٩٠٨دا چووە بۆ ژاپۆن و لە هاوینی ١٩١٠دا گەڕاوەتەوە ئەڵەمانیا.

هەر لەو ساڵەدا بووە بە مامۆستا لە کۆلیجی ئەرکانی جەنگ تا شارەزایی خۆی لە کاروباری عەسکەری رۆژهەلاّتدا روونبکاتەوە. لە هاوینی ١٩١١دا گەڕاوەتەوە بەشی تۆپخانەو لە ساڵی ١٩١٢دا خانەنشین بووە. ا، ساڵی ١٩١٤دا بە پلەی یەکەمی (شرف) دکتورای لە جوگرافیاو مێژوو جیۆلۆجی لە زانکۆی میونیخ-ی باڤاری شاهانە دراوەتێ و هەرکە جەنگی یەکەم هەڵگیرسا داوایانلێکردووە بگەڕێتەوە سوپا.

له ساڵی ١٩١٩دا به جەنەراڵی خانەنشین بووه، به فێرکردنی قوتابیانی زانکۆی میونیخ-ەوه خەریکبووه. له ١٩٢١ کراوه به پڕۆفیسۆری زانستی جوگرافیا له هەمان زانکۆ.

له ١٩٢٤دا بووه به پڕۆفیسۆر له ئەکادیمییەی ئەڵەمانیا ئنجا له ساڵی ١٩٣٣دا بووه به پڕۆفیسۆر له زانیاری جیوپۆلیتیکس و عەمیدی بەشی زانیاری له زانکۆی میونیخ، هەر له هەمان ساڵدا بووه به بەڕێوەبەری پەیمانگای لێکۆڵینەوەی جیۆپۆلیتیکس لەم زانکۆیه. له نێوان ١٩٣٤-١٩٣٧دا بووه به عەمیدی ئەکادیمییەی ئەڵەمانیاو، له ١٩٣٨دا بووه به سەرۆکی ڕێکخراوی میللی ئەو ئەڵەمانانەی له دەرەوەی ئەڵەمانیا ژیاون.

له ١٩٤٤دا ئەلبریخت-ی کوڕی کوژراوەو جیستابۆی نازی خۆشی بەندکردووه. له ١٩٤٥دا ئەمەریکاییەکان له زیندان ڕزگاریان کردووه. له ٨ی تشرینی دووەمی ١٩٤٥دا لاشەی خۆی و ژنەکەی له باخچەی خانوویەکی بچوك له شاخی ئالپی باڤاریا دۆزرایەوه وا دیاربووه هەردووکیان به زەهر خۆیان کوشتووه.

# سەرچاوەكان


١- جيوبوليتيكس- الدكتور على محمد المياح

٢-الاصول العامة في الجغرافيا السياسية و الجيوبوليتيكا مع دراسة تطبيقية على الشرق الاوسط- الدكتور محمد رياض استاذ الجغرافيا بجامعة عين الشمس.

٣-دراسات في الجغرافيا السياسية- الدكتور صلاح الدين على الشامى استاذ الجغرافيا بكلية الاداب جامعة القاهرة بالخرطوم.

٤-القانون الدستورى- نظرية الدولة- الدكتور منذر الشاوى.

٥-القانون الدولى الخاص وفق القانونين العراقي و المقارن- الدكتور ممدوح عبدالكريم حافظ.

٦-الخليج العربي دراسة الجغرافيا السياسية- الدكتور صبري فارس الهيتى.

٧-السر المعروف مبدا نكسن و كسنجر في اسيا.

٨-توينبى منهج التاريخ و فلسفة التاريخ.

٩-الأمير- لمكيافللى.

١٠-اراء و احاديث في اللغة و الادب- ساطع الحصرى.

١١-ستراتيجية صراع القوى الكبرى في الوطن العربي- محمد عبدالمجيد حسون.

١٢-الحرب من الفضاء- اللواء اركان حرب خضر الدهراوي.

١٣-الاستراتيجية الاميركية الجديدة- المؤسسة العربية للدراسات و النشر.

١٤-رواد الاستراتيجية الحديثة- تاليف ادوارد ميدايرل ترجمة -الاميرالاى ا. ج محمد عبدالفتاح ابراهيم

١٥-مؤلفات ماوتسي تونغ المختارة المجلد الرابع.

١٦-مجلة الف باء العدد ٨٩٢ - مقال لـ (عزيز الرفاعى) عن حرب النجوم.

١٧-جريدة الثورة- ١٩٨٥/٩/٥ ترجمة فريال مروكى عن لوماتان عن التسلح في الفضاء الفرنسية.

١٨-جريدة الثورة- ١٩٨٥/١٠/٩ مقال لـ (الدكتور محمد رياض حمزة) عن مهمة اتلانتس.

١٩-بسام العسلى- مشاهير قادة العالم- فون مولتكه.

## پەراوێزەکان

١-الدكتور علي محمد المياح- الجيوبوليتيكس، ص٢.

٢-نفس المصدر، ص٢.

٣-نفس المصدر، ص ٣

٤-نفس المصدر، ص ٢٨.

٥-نفس المصدر، ص ٣٣.

٦-نفس المصدر، ص ٨.

٧-نفس المصدر، ص ١١.

٨-نفس المصدر، ص ١١.

٩-مؤلفات ماوتسي تونغ المختارة- المجلد الثاني، ص ٢١٣.

١٠-بسام العسلي- مشاهير قادة العالم- فون مولتكه، ص ٤٥.

١١-ادوارد ميد ارل - رواد الاستراتيجية الحديثة، ص ١٢٣.

١٢-نفس المصدر، ص ١٣٣.

١٣-نفس المصدر، ص ١٧٣.

١٤-نفس المصدر، ص ١٨١.

١٥-نفس المصدر، ص ١٩٧.

١٦-نفس المصدر، ص ٢١٣، ٢١٤.

١٧-نفس المصدر، ص ٢٠٣.

١٨-نفس المصدر، ص ٢٠٦.

١٩-نفس المصدر، ص ص ٣٤٤.

٢٠-نفس المصدر، ص ٣٥٧.

٢١-الدكتور علي محمد المياح- الجيوبوليتيكسى، ص ٣٨.

٢٢-الدكتور محمد رياض- الاصول في الجغرافيا السياسية و الجيوبوليتيكا مع دراسة تطبيقية على الشرق الاوسط، ص ٦٨.

٢٣-نفس المصدر، ص ٦٥.

٢٤-الدكتور علي محمد المياح- الجيوبوليتيكس، ص ٢٦.

٢٥-الدكتور محمد رياض- الاصول العامة في الجغرافيا السياسية و الجيوبوليتيكا، ص ٧٩.

٢٦-الدكتور علي محمد المياح، ص ٥٠.

٢٧-ادوارد ميد ارل- رواد الاستراتيجية الحديثة، ص ٤٠٤.

٢٨-نفس المصدر، ص ٤٠٥.

٢٩-الدكتور علي محمد المياح- الجيوبوليتيكس، ص ٥٤.

٣٠-نفس المصدر، ص ٥٩.

٣١-نفس المصدر، ص ٥٩.

٣٢-نفس المصدر، ص ٥٩.

٣٣-ادوارد ميد ارل- رواد الاستراتيجية الحديثة، ص ٤٥٩.

٣٤-اللواء اركان حرب خضر الدهراوي- الحرب في الفضاء، ص ١٩٥.

٣٥-نفس المصدر، ص ٢١.

٣٦-نفس المصدر، ص ٣٧.

٣٧-نفس المصدر، ص ٢٢١.

٣٨-جريدة الثورة- ١٩٨٥/١٠/٩.

٣٩-ادوارد ميد ارل- رواد الاتسارتيجية الحديثة، ص ١٠١-١٠٢-١٠٣.

## زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

### ساڵی 2001

| زنجیرە | ناوی کتێب | نووسینی | وەرگێڕ |
|---|---|---|---|
| 94 | خەونە ترسناکەکانی یوسف | بەرزان فەرەج | |
| 95 | سەرەتاکانی سۆسیۆلۆژیا | | شوان ئەحمەد |
| 96 | عێلی جاوان | د. مستەفا جەواد | م. جمیل رۆژ بەیانی |
| 97 | هێماگەریەتی | | پێشڕەو حسێن |
| 98 | دەروازە | | هەڵکەوت عەبدوڵا |
| 99 | زۆربا | نیکۆس کازانتزاکیس | رەووف بێگەرد |
| 100 | بیناى هونەری چیرۆکی کوردی | پەرێز سابیر محەمەد | |
| 101 | دەرۆم پێکەنینی دەریا ببینم | سەلاح گوڵ ئەندامی | |
| 102 | بزوتنەوەی روانگەو شیعری نوێی کوردی | شادمان قادر حەسەن | |
| 103 | چیرۆکی وڵاتە دوورەکان | | حەمە رەشید |
| 104 | زمان و زانستی زمان | | د.محەمەد |
| 105 | چەند شانۆنامەیەك بۆ منداڵان | | فاروق هۆمەر |
| 106 | شانۆگەریەکانی سلێمانی لە ساڵانی (1926–1961)دا | یاسین قادر بەرزنجی | |
| 107 | گۆڤاری (دیاری کوردستان) | ئا: رەفیق ساڵح | |
| 108 | وا بەهار هات | حاجی جوندی | جەلال دەباغ |
| 109 | لەگەڵ ئەقڵی خۆرئاوادا | | ئازاد بەرزنجی |
| 110 | زەردەشت وای گوت | فردریك نیتشە | رەئووفی ئەحمەد ئالانی |
| 111 | پیاوە سپییەکە | | خەبات عارف |
| 112 | دەفتەری شیعر | لەیلان سەعدەدین | مەهاباد صالح |
| 113 | بنەماکانی فسیۆلۆژی مرۆڤ | ئەکرەم قەرەداغی | |
| 114 | وانەی ئەم سەدەیە | کارل پۆپەر | شۆرش جوانرۆیی |
| 115 | کوردەکان | حەسەن ئەرفەع | سەردار محەمەد |

| | | | |
|---|---|---|---|
| 116 | گەوهەری دێرینە | محەمەد ساڵح سەعید | |
| 117 | ئاڵای کورد | هاوڕێ باخەوان | |
| 118 | شازادە ئحتجاب | هوشەنگ گوڵشیری | عەتا نەهایی |
| 119 | نزا بۆ ئارمێن | ئیبراهیم یونسی | ئاوات |
| 120 | ستریندبێری سۆناتایی تارمایی | دانا ڕەئووف | |
| 121 | لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی 1806-1882 | ئەنوەر قادر محەمەد | |
| 122 | دەروازەکانی ئایین لە نێوان زەوی و ئاسماندا | مەریوان ئەبوبەکر هەڵەبجەیی | |
| 123 | باڵە سیاسیەکان لە ئێرانی ئەمڕۆدا | حوجەت مورتەجای | محمد کریم |
| 124 | جەمهوریەتی کوردستان | مەحمود مەلا عیزەت | |
| 125 | ئەزموون | | ئا: یاسین عومەر |
| 126 | خاڵی بروسك | جاك هیگگینز | لوقمان عەباس |
| 127 | داهێنان لە ڕوانگەیچەند تیۆرەیەکەوە | | ئا: ڕۆشنا ئەحمەد |
| 128 | سەرەتایەك بۆ ڕۆژنامە نووسی | مەم بورهان قانع | |
| 129 | گەڕان بەدوای ئاسنامەدا | عەتا قەرەداخی | |
| 130 | ژیانو جیهانبینی | مەسعود محەمەد | ئا: هەڵۆبەرزنجەیی |
| 131 | کەوتنەخوارەوەی گورگێك | ئیسماعیل حەمەئەمین | |
| 132 | ئیدیۆم لەزمانی کوردیدا | جەلال مەحمود عەلی | |

